## بەناوی خۆوای گەورە

## نیوەنووزە

به بسمالله دەدێرم دێڕی داوام     به بسمالله دەوێژم شێعری ساوام

به بسماللەیه وێژەم بۆ دەمێژێ     به بسماللەیه وێژەر چی دەبێژێ

به بسماللەیه ورتەم دێته بەرهەم     به بسماللەیه بەرهەم دێته بەردەم

به بسماللەیه زەردەم دێته لێوان     به بسماللەیه بێترسی له دێوان

به بسمالله دەنازێ نیوه نووزەم     لەدەس ئەو دایه شادی یا کڕووزەم

نەدا هێزێ به پێزی وێژەبێژیم     نەپارێزێ له لاوازی بوێژیم

مەکووکێکی بەبێ هەودا له گۆڕێم     له پێچاڵی نەزانیدا دەدۆڕێم

خووا کوردێکی کورتی کوردەواریم     بەبێ زار و زمان و زانیاریم

وشێکی وا به پیتم باوێ زاری     له زاراوەم ببارێ حەمدی باری

هەتا لێرەو لەوێ خەڵکی بزانن     که کوردیش خاوەنی زار و زمانن

بزانن هۆزی بێنازی مەمانان     له بن کێوی بەبێ خێوی چ زانان؟

خووا ئەی ڕێبەدەستی ڕێزمانان     دە باسی مەش بهاوێ سەر زمانان

زمانی شێعری ڕاوچی وابگێڕێ     که مێژوو بەرهەمی بگرێ له زێڕی

١٣٧٣/٧/٢

«ڕاوچی»

## نێوەرۆک:

ماموستا راوچی

چییە ڕاوچی لەسەر کورسی، بەپۆزی لاقی سەر لاقی

خەیاڵی خاوە کردووتە کە پێت وایە شەمی تاقی

کەمێ هۆشت هەبێ لاوی بەرەو بێناوی نەتکێشێ

کە لاوی بۆ کەسێ هەرگیز نەماوە تا سەرێ باقی

تەموتۆڤ تەمەن، هاکا تەناڤ ئۆڤ لێبەستی

لەمەولا قەت سەما ناکا، لەبەر دەمتا کچی ساقی

# سەرەتایەکی سەرسەری و بەهەرەمە

ئەحمەد قازی

وەك لە بیرم مابێ ساڵی ١٣٧١ بۆ یەکەم جار دەگەڵ ناوی «ڕاوچی» ئاشنا بووم، ئەویش لە ڕێگەی نامەیەکەوە کە بەم ناوە و لە ناو کەواندا (مەلاکەریم ساردەکۆسانی) بۆ بەشی «ئێمە و خوێنەر» لە گۆواری سروەدا ناردرابوو.

ئەو سەردەمی کە سروە زۆر بەڕمێن و تاقانە بوو، لە هەر مانگێکدا بە دەیان نامە بۆ ئەم بەشە دەهات کە خوێنەران پرسیاری جۆراوجۆریان لە سەر فەرهەنگ و ئەدەب و مێژوو، یا تەنانەت ڕووداوی سیاسی، دێنا گۆڕێ و ئێمەش دەبوایە لە ژێر مقەستی سانسۆرچی زیت و وریادا هەر چۆنێك بوایە وەڵاممان دابانەوە. بەرپرسی جوابدانەوەی نامەکان من بووم و زۆر جار جوابەکانم لە باری سیاسییەوە گیروگرفتی پێكدێنا و لە لایەن بەرپرسانەوە دەکەوتمە بەر هەڕەشە و لۆمە و لەقەم. بۆ نموونە جارێك خوێنەرێك لە نامەکەیدا پرسیاری کردبوو کە : «چۆنە کوردەکان زۆرتر لە سەر سنووران نیشتەجێ بوون و جێگەی خۆیان بەجێهێشتووە و ڕوویان دە ناوچە سنوورییەکان کردووە؟» من لە جوابی ئەم پرسیارەدا بە کورتی نووسیبووم: «کورد نەچوونەتە سەر سنووران و هەر لە شوێنی خۆیانن، بەڵام سنوورەکان چوونەتە نێو کوردەکان و لە شوێنی پێویست نەماون!» لە سەر ئەم پرسیار و وەڵامە لە تارانەوە دەستووریان دابوو کە ئەم بەشە بڵاو نەکرێتەوە یا بۆ ماوەیەك ڕایبگرن و بەرپرسەکەی بگۆڕن!

نامەکەی "ڕاوچی" نیشانی دەدا کە نووسەر پیاوێکی دنیادیتە و بەئەزموونە و ساردوگەرمی ڕۆژگاری چێشتووە و لە ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ساڵانی دەیەکانی ٣٠ و ٤٠دا دەوری هەبووە. دیارە ئەم باسانەی بە شێوەیەکی ڕەمزی و

ناڕاستەوخۆ دركاندبوو و تەنیا کەسێك لێی حاڵی دەبوو کە خۆی ئەم ڕووداوانەی ئەزموو‌بێ و تێیاندا بەشدار بووبێ.

ئینشای نامەکە لەوپەڕی جوانی و پتەویدا بوو، دیار بوو میرزا یا مەلایەکی کوردیزانی خاوەن چێژ و شاعیر نووسیویەتی و ئەوەی زۆرتر لە هەموو شتێك سەرنجی منی ڕاکێشا ئەو واژە و دەستەواژە و ڕستە ڕێكوپێکانە بوون کە نووسەر دەکاری هێنابوون و تایبەتی مەڵبەندێك بوون کە زبانی شار و بیانی کاری تێ نەکردوون و ڕەسەنایەتی و ڕازاوەیی خۆیان پاراستووە.

پاش ئەو نامەیە کەوتمە پەی سەروشوێن و ناسینی مامۆستا مەلاکەریم و سەرەنجام بۆم دەرکەوت کە زەمانێك لە جموجۆڵی شاخەکاندا هاوڕێ و دۆستی کاك مونتەقیمی قازی (برام) و کەسانێکی وەك خوالێخۆشبووان سولەیمانی موعینی و ئەحمەد تەوفیق (عەبدوڵڵا ئیسحاقی) بووە کە وێڕای خەباتی سیاسی، بارودۆخی ژیانی خەڵکی ناوچە و باری ئابووری و ژیاری و جوغرافیایی و شێوەزاری موکریانی ئەو ناوچانەی کە تێیدا هەڵسووڕاوە، بە وردی داوەتە بەر سەرنج و دەگەڵ شاعیران و نووسەران و زانایانی ئایینی پێوەندی بەردەوامی پێکهێناوە و ئاڵوگۆڕی شیعری کردووە و بەم شێوەیە خۆی گەیاندۆتە ڕیزی شاعیرانی سەردەم، و لە زۆرانیشی تێپەڕاندووە.

لە ساڵەکانی دواتردا تەشریفی هاتە ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و بە دیداری شاد بووین. کەواوپاتۆڵی کوردی و مێزەری سپی، قەدوقەڵافەتی باریك و ڕێکوپێك و گفتولفتی خۆش و دەکارهێنانی وەستایانەی واژە و پەند و مەتەڵ، کارتێکردنێکی زۆری لە سەر بیسەر و بەردەنگان بەجێدەهێشت. من زانیم ئەم کەسایەتییە زۆری دەباراندایە و لە ڕەهەندی زبان و گەنجینەی واژە و زاراوەی ڕەسەنی کوردیدا دەتوانین زۆر کەڵکی لێ وەربگرین. هەر ئەوەش بوو بە هۆی دۆستایەتی و پێوەندی پتەوی نێوانمان بۆ هەتاهەتا. جاروبار شێعر و پەخشانی بۆ دەناردین و لە نێو ئەوانەدا فەرهەنگی ناوی دەیان گوڵ و گیای کوردستان بوو کە قەرار بوو تەواوی کا و بۆی بڵاو بکەینەوە کە بە داخەوە نەگونجا.

سەرەنجام مامۆستا مەلاکەریمی ساردەکۆسانی (ڕاوچی) ساڵی ١٣٨٠ لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و بەجێی هێشتین. هەرچەند مردن ڕووداوێکی سروشتییە و لەسەر

کەس ڕاناوەستێ و دەسەر کەسەوە ناچێ، بەڵام من نیگەرانی ئەوە بووم کە دەبێ ئاسەواری مامۆستا، کە لە زۆر و کەمەکەشی ئاگادار نەبووم، لە کوێ بن و چییان بە سەر هاتبێ. ئەو دڵەڕاوکێیەم لێ ببوو بە پرسیارێکی گەورە و نەمدەزانی بۆ جوابەکەی ڕوو دەکێ و دەکوێ بکەم.

بەختەوەرانە، دوو ساڵ لەمەوبەر لە ناکاو، کوڕێکی خوێنشیرین و ڕەزاسووک لێم وەژوور کەوت و خۆی ناساند. کاک کاوەی عەزیزنـژاد کوڕی مامۆستا مەلاکەریم. زیت و وریا، بە دوای زیندووکردنەوەی ئاسەواری مامۆستاوە بوو.

کاوەی بەڕێز ئەم ئەرکەی بە تەواوی ڕاپەڕاند و لە نێوەڕاستی مانگی بانەمەڕی ئەمساڵ (١٣٨٩)دا دیوانی شێعرەکانی مامۆستای خوالێخۆشبووی لە بەرگێکدا بە ناوی "بزەی شۆڕش" بۆ هێنام کە سەرجەمی شێعرەکانی ئەو نەمرەی تێدا کۆ کردۆتەوە و ئامادەی چاپی کردووە.

کاک کاوە داوای لێ کردم بە مەبەستی هەڵەبڕ کردن و نووسینی سەرەتایەکی کورت بەو دیوانە شێعرەدا بچمەوە و بیروڕای خۆم لە سەر شێعر و سەبك و شێوازی مامۆستا ڕاوچی دەربڕم. دیارە کاک کاوە بۆخۆی بە شێوەیەکی تایبەت و بە جوانی پێشەکییەکی تەواوی بۆ دیوانە شیعرەکەی مامۆستا ڕاوچی نووسیوە و بە شیعری خۆی ڕازاندوویەتەوە و زۆرترین لایەنەکانی ژیان و ئاکار و ئاسەواری باوکی خستۆتە بەرچاوی خوێنەران و مامۆستاش بە نووسینی بیرەوەرییەکانی خۆی، پێداویستی نووسینی سەرەتا و پێشەکی لە لایەن ئێمەوە کەمڕەنگ کردووە. لە بەر ئەوە من لێرەدا بە کورتی باسێك لە سەر ئەم دیوانە شیعرە دێنمە گۆڕێ و تێدەپەڕم.

ئەوەی پێش هەر بۆچوون و دەربڕینی بیروڕایەك پێویستە بە خوێنەری خۆشەویستی ڕابگەیەنم ئەوەیە من لە خوێندنەوەی هەر بابەتێکدا چ پەخشان و چ شێعر و لە هەر جسناتێك (ژانرێك) یەکەم شتی کە زۆر بە گرینگی دەزانم زبانی شاعیر، نووسەر یا هونەرمەندە و پەیام و ناوەرۆکی بابەت دەبەم بۆ پلەی دووهەم. ئەگەر بمەوێ بیروڕای خۆم لە سەر شێعرەکانی مامۆستا پۆلێن بکەم دەتوانم بڵێم:

# بزەی شۆڕش

## دیوانی شێعری مامۆستا ڕاوچی

(مەلاکەریمی ساردەکۆسانی)

کۆکردنەوەی: کاوەی کوڕی مامۆستا ڕاوچی

**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**
**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی وچاپ و بڵاوکردنەوە**
**بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر**

ناوی کتێب: بزەی شۆڕش (دیوانی شیعری مامۆستا ڕاوچی)

کۆکردنەوەی: کاوەی کوڕی مامۆستا ڕاوچی

پێداچوونەوە: ١- ئەحمەدی قازی ٢. ئەمین گەردیگلانی ٣. کاوەی ڕاوچی

پیتچنین: شاسەنەم. جەوشەنی

وێنەی رووبەرگ: مامۆستا ڕاوچی

وێنەی بەرگی ئاخر: گوندی ساردەکۆسان

چاپ: چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر/ ٢٠١٢

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارەی سپاردنی (٩٢) ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە**

١. دیوانی ڕاوچی (بزەی شۆڕش) لە باری زبان و زاڵبوونی شاعیر بە سەر زباندا کارێکی نموونە و بێوێنەیە و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی زبانی کوردییە کە بە سەدان واژە و زاراوە و گوڵواژەی هەمەڕەنگی لە خۆ گرتووە کە تا ئێستا لە لایەن هیچ شاعیر یا نووسەرێکەوە دەکار نەکراون و هەر لێرەوە دەمەوێ تکا لە کاك کاوە بکەم فەرهەنگۆکێك بۆ ئەم واژە و دەستەواژانە بنووسرێ و بکرێتە پاشکۆی دیوانەکە چونکە بە متمانەوە دەڵێم گەلێك لە ئەهلی قەڵەمی ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان ئەم واژە و ڕێکەوەندە دەگمەنانەیان نەبیستووە و بە نووسین نەیاندیتووە. بۆ نموونە دەتوانین باسی ناوی دەیان گوڵ و چەشنە ڕووەکی سەیروسەمەرە بکەین کە دە هێندێکد لە شێعرەکاندا هاتوون، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە شاعیر باسی سروشتی وڵات و نیشتمانەکەی دەکا. ئەوەتا لە چیرۆکە شیعری "ماری شێخ ئۆمەر" لاپەڕەی ١٦١ لە یازدە بەیتی شێعرەکەدا ناوی زیاتر لە شەست چەشنە گوڵ و گیای هێناوە کە لە دۆڵ و دەرە و لاپاڵەکانی چیاکان و دەشتەکانی وڵاتدا دەڕوێن و ناوی زۆرینەی ئەوانمان تا ئێستا نەبیستووە.

٢. جۆراوجۆری بابەت یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی ئەم دیوانە شیعرەیە. پاڕانەوە لە بەر خودا و پێغەمبەر، باسی خوڵقاندنی ئەرز و ئاسمان و ئادەمزاد، وەسوەسەی شەیتان، نیشتمانپەروەری و هاندانی لاوان بۆ خەبات و تێکۆشان، شینگێڕی بۆ گەورەپیاوان و هونەرمەندان، باسی سروشت و جوانی وڵات، چیرۆکە شیعر و نەقڵ و نەزیلە، ڕاو و شکار، چوارینە، دژایەتی لەگەڵ خورافە و پڕوپووچ، ئاڵوگۆڕی نامەی هۆنراوە دەگەڵ شاعیران و دەیان بواری دیکەی تازە و بەدیع لەم دیوانەدا کۆ کراونەتەوە.

٣ـ شێوەی بەیان (سەبك) لە لای مامۆستا مەلاکەریم ساردەکۆسانی، شێوازێکی تازە و جیاوازە. ئەم جیاوازی و تازەبوونە خۆی دە شێوەی بەیانی بابەتەکاندا دەبینێتەوە. شاعیر لە هیچ شێعرێکدا تووشی خۆ ڕێكگوشین و تەنگەژەی کەلامی نەبووە و زۆر سادە و ڕەوان بەو زبانە پاراوەی مەڵبەندی ژیانی خۆی، دەنووسێ و دەماندوێنێ. زبان لە دەستیدا کەرەسەیەکی لەبار و ئامرازێکی لە دەستان خۆشە کە بەبێ زەحمەت و مەرارەت بۆ مەبەستە

جوانەکان و بیرە وردەکانی دەکاری دێنێ و دەتوانم بڵێم لەم ڕوانەگەوە کەس هێندە سەرکەوتوو نەبووە.

٤. شەپۆلێك لە هەستی جوانپەرستی و جوانیویستی لە ئاسەواری ڕاوچیدا لە شەپۆلان و خرۆشاندایە. شاعیری دڵتەڕ و هەمیشە عاشق، لە زۆربەی شێعرەکاندیا هەستی خۆی لەم بەستێنەدا بە جوانترین شێوە دەردەبڕێ و باشترە بڵێم بە خۆی ناوەستێ، ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر جوانی و ڕازاوەیی مەڵبەندی ژیانی و ئەو کیژ و کابانە لەبار و نازەنینانەی کە لە گوند و مەزرا و هەوار و گەرمێن و کوێستان کردندا وێڕای برا و کەسوکاریان لە کار و تێکۆشان ڕانەوەستاون، بە بارستای گوڵ و دار و دەوەنی کوردستان، جوان و سروشتی خولقاون:

ڕاوچی کە چوویە ڕاوێ، مەچۆ ترۆپك و لێژان — خاوی، دەکەویە داوی، لۆرەی بالۆرەبێژان
بزۆز و چاوچنۆکی، مەڕوانە پەرچ و گێژان — کچان لەوێ لە شیون، ڕووتن شلێر و بێژان
نەکا بشکێنی تۆبە، بە تام و بۆن و چێژان — لە لات وابێ ڕەوایە، چێژەیەك بو بوێژان

مزگێنی بێ لە یارم، سەوزە بوورەو بەیارم
شیرین تەشی دەڕێسێ لە جێهەواری پارم

وێنەیەکی تر

لە شەرگەی دوو لەشی دەمڕووت و لەشڕووت — لە چاوی گوڵ بچۆڕێ ئەشکی یاقووت
بنۆشێ زەمزەمی لێو و دەمی چووك — کەوی کا دوو مەمی سرك و سڵی بووك
لە پێتەختی سپی سینەی سەمەن بۆ — ڕەوایە بەرهەمی چڵپە و مڵومۆ

٥. بێجگە لەم بوارانەی باسمان کردن، مەلاکەریمی ساردەکۆسانی (ڕاوچی) هەرچەند خۆی مامۆستای ئاینییە و پێشنوێژ و ڕێنومای خەڵکی دەوروبەری خۆیەتی، بەڵام جاروبار لە

بیرۆکەی خەییام نزیك دەبێتەوە و دەچێتە ناو دنیای فەلسەفە و ئامۆژگاری وشکەسۆفی و دژایەتی شێخ و زاهید دەکا. لە باسی ئافرانشی هەستیدا دەکەوێتە شك و گومان و پرسیار دەکا:

(هەستی) بۆ هاتە گۆڕێ؟ — لە گۆڕە، بۆ دەدۆڕێ؟
من چیم و بۆچی هاتم؟ — هاتم، بۆ شەل و ماتم؟
کە بۆ خۆم، خۆم هێنابا — نۆکەرم دەبوو، شابا
هاتووم بەرەو کوێ دەچم — مەزن یا ئەستۆ کەچم
پێش هاتنم لە کوێ بووم — لە کام سوێگە بەسوێ بووم
ڕێگەم نییە بپرسم — لە سۆفیلکان دەترسم
دەنا دەمگوت خوایە — بۆ چیتە ئەم سەرایە

ئەوجار ئامۆژگاری وشکەسۆفی دەکا و دەڵێ:

سۆفی چییە ئەو دەست و قول و قاچەڕەشەت
ئەم ڕیش و سمێڵ و چەنەگە و بارە هەشەت
هەستە بیشۆوە بە مەی، دڵ و، پاکەوە بە
مەیگێڕی بەدەس بگرە هەتا ماوە نەشەت

مێحرابی بەجیٚهێڵە لە مەیخانە تلێ
ئەو وادە کە شێخ داویە پێت، دوورە چەلێ
بەرماڵ و جبەی بدرە لەبەر پێی جوانێ
تۆبەت بکە شاباشی دەم و پرچ و ملێ

٦. ڕاوچی کوڕی چیا و شاخ و کەند و لەند و مێشە و مەزرا و لێرەواری زەنوێر و زیندووی پڕ لە زیندەوارە. جریوەی مەلان و قاسپەی کەوان و باڵۆرەی کیژان و دەنگی شمشاڵ و گۆرانی دڵبزوێن سەمفۆنیای ژیانی ڕاوچی پێکدێنن. دەبێتە ڕاوچی و بە دوای کەروێشك و باڵندە و نێچیری جۆراوجۆردا ڕژد و هەڵەمووت و یاڵ و لاپاڵان دەخولێتەوە و پێمان دەڵێ کە

بۆ گۆشت خواردن ڕاو ناکا و وەك وەرزیش و سەیران و گەشت و ڕاهێنانی قاچوقول و لەش و ئەندام، چاو لە ڕاو و شکار دەکا. لە لایەکی دیکەوە دەیەوێ لەم گەشت و گەڕان و پێوانی شاخ و کێو و دەشت و لاپاڵانەدا، سروشتی کوردستان لە هەموو بارێکەوە بناسێ و زانیارییەکانی لە سەر هەڵکەوتی جوغرافیایی و گیانلەبەر و گیاوگوڵ و ژیانی کوردەواری بنووسێتەوە و فەرهەنگی گەلەکەمانی پێ بڕازێنێتەوە. بڕوانەی خۆی لەم بارەوە چ دەنووسێ:

« ڕاو، ڕاهێنانی دەست و قۆڵ و قاچ و شانوملی و هەنگاوە. وەرزشە، ڕاسانە، پاشەکشێ و چنگەکرێ و پڕتاوە، ... مەدرەسەیەکی ترسبڕە، ڕاوچی کوڕە خاوەن زیپك و بڕە، لە بڕەگان، لە لوورەی چەقەڵ و گورگ و سەگان، ... لە جندو دێو و مۆتە و ئاڵەی چۆڵگە و هەڵەتان، ناترسێ. ... ڕاوچی گیاناسە، دڕندەناسە، دوور نییە مەدرەسەی ڕاو بیکاتە قارەمان، بیکاتە سەرۆکی ڕاپەڕین و ڕاسانان و ... .

٧. مامۆستا ڕاوچی وەك لە خوێندنەوەی بیرەوەری و شێعرەکانیدا دەردەکەوێ ژیانێکی پڕ لە ڕووداوی سەیروسەمەرەی تێپەڕاندووە و ئەندامێکی دڵسۆز و هەڵسووڕاوی کۆمەڵگای خۆی بووە، ماوەیەك لە ژیانی بە چالاکی سیاسییەوە خەریك بووە، مەلایەتی کردووە، ڕەنج و مەرارەتی زیندانی کێشاوە، لە شار و گوند ژیاوە، فەقیری و نەداری و هەوراز و نشێوی ژیانی زۆر دیوە و ئەهلی قەڵەمێکی هەستیار و ئەهلی کتێب و خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە بووە، شاعیرانی کۆن و سەردەمی باش ناسیوە و ئاسەواری خوێندوونەتەوە، لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی و فەرهەنگیدا بەشداری کردووە... بە کورتی کوڕی مەیدان و گۆنگەڵان بووە. لە ڕووداوەکان پەندی وەرگرتووە و بەرهەمی ژیان و ئەزموونەکانی دەکاتە دەرس و ئامۆژگاری بۆ بەرەی داهاتوو. باوەکوو دەگەڵ زۆرێك لە شاعیران هاموشۆی بووە و بە هەزاران شێعری کۆن و نوێی خوێندۆتەوە، نەکەوتۆتە ژێر کارتێکردنی شاعیرانی دیکە و سەبك و شێوازی سەربەخۆی خوڵقاندووە.

من لە خوێندنەوەی دیوانی شێعرەکاندیا تەنیا لە دوو قەسیدەی "پردی سوڵتان" و "ئاشی ئاغای"دا برووکە کارتێکردنێکی "بەرەو موکریان"ی مامۆستا هەژارم هەست پێ کردووە،

ئەگینا ڕاوچی وەك شاعیرێكی گەورەی پسپۆڕی زبانزان و خاوەنسەبك و شێوازی تایبەت دەناسم و هیوادارم سەرجەمی ئاسەوارەكانی ئەم بلیمەتە بكەوێتە بەردەست ڕووناكبیران و بە وردی بكەونە بەر سەرنج و لێكۆڵینەوەی خاوەنڕایانی زیت و زانا و كتێبخانەی كوردی بەم بەرهەمانە زۆرتر برازێتەوە.

مەهاباد

١٢ی جۆزەردانی ١٣٨٩

## راوچی شاعیری وەتەن و جوانی(ئاسۆ)

یەکەم جار لە ماڵی حاجی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا محەمەدی قەڵەندەر، لەگەڵ مامۆستا برایمی ئەفخەمی سێ بە سێ دانیشتبوون بە خزمەتی ڕاوچی گەیشتم. مێزەری مەلایانەی بەسەرەوە بوو. بە تووتن و پەڕ سیغاری دەکێشا، ژوورەکەی کردبووە دووکەڵ. حاجی مامۆستا یەکجار قسە لەڕوو بوو. ـ خودا هەر سێکیان عەفوو کات، هیچیان نەماون ـ دەنگی هەموو کەسی دادە لە سیغار کێشاندا. بەڵام هیچ بەم نەدەکوت. هەر سێ مەجلیسیان هێندە گەرم و گوڕ بوو هەر نەبێتەوە. من بەسەردا کەوتم. مامۆستا ڕاوچی نەیناسیم. مامۆستا ئەفخەمیش منی بە مامۆستا نەناساند. حاجی مامۆستا کوتی: مەلاکەریم! حەمەسەعیدیش شاعیرە! من کە تا ئێستا نەمزانیبوو ئەو شەخسی سوەمە مامۆستایە، ئەوجار جۆرێ دەیدواندم و ئەویش منی پێ سەر ڕووتێکی هەڵە و هەرزە بوو، تەنانەت پێی ناخۆش بوو مەجلیسەکەم لێ تێك داون. لەبەر ئەوە هەمیەتێکی وای نەدامێ. تا باسەکەیان هاتە سەر مامۆستا هەژار. من کە مامۆستا هەژارم پێ گەورەترین شاعیری کوردە، لە حەیفان دژی ڕاوەستام. مامۆستا ڕاوچی فەرمووی: «تەککوو خوڵا غەزەبت لێ گرێ؟ جا بابم هی وا هەیە دەڵێ خودا نییە!» ئاوام ناسی. تا پێی کەوت دوای ماوەیەکی زۆر بە خزمەتی گەیشتمەوە. فەرمووی: ئاسۆ! ئەتۆ منت وەك سەرچنار نەهاتە بەرچاو وا لێم ناپرسی؟» عەرزم کرد: «چۆن مامۆستا؟» فەرمووی: «یەکجار زۆر بە ئاواتەوە بووم جارێ سولەیمانی و سەرچنار ببینم. کاتێ چووم دیتم سەرئاوێکی ئاسایی و چەن کوڕی عەرەقخۆر و یەکێ دەرشاوە و یەکێ بەلادا کەوتبوو، ئیدی بۆ هەمیشە سەرچنارم لەبەر چاو کەوت» ـ هەڵبەت مامۆستا ٣٠ ساڵ لەمەوبەر چووبووە سەرچنار، دەنا سەرچنار ئێستا تۆزێکی ماوە ببێتە بەهەشتی سەر عەرز ـ ئاسۆ تۆش منت وا نەهاتە بەرچاو؟» عەرزم کرد: نەخێر قوربان! هەر پێی نەکەوتووە بە خزمەت بگەم. ئیدی لەو ڕۆژەوە بوومە موریدی ئەو زاتە گەورە بونی هەژاری لێ دەهات. پیری سیاسەت بوو، عاشق بوو، عاشقی نیشتمان و جوانییەکانی، باسەواد و خەتخۆش، بەڵام یاخوا دوژمنەکەشم سیاسەتزەدە و دابڕاوی سیاسی نەبێ. لەپێشدا ئەوەی لەبەر چاوی دەکەوێ ئەدەبیاتە، لە

هەموو شتێ هەڵدەبڕێ. مامۆستا مەلاکەریمێ کە عەلی خانی تیکانتەپە ساڵی ١٣٣٨ لە زیندانی قەسری قەجەر ئاوای پێدا هەڵکوتووە:

« کاک مەلاکەریم ساردەکۆسانی ڕێی سەرکەوتی هۆزیان زۆر باش دەزانی»[1]

هاتبووە بۆکان ببووە ددانسازی تەجربی. قەڵەمی فڕێ دابوو، گازی ددانکێشی گرتبووە دەست. تا خودا کردی و بە نێوی مەلا، مێزەرە سپیە جوانەکەی بەستەوە و چوە سەردراباد و ترکاشە. ئەمجاریش دەروێشان! لەو چەند ساڵەدا تەواو گەڕایەوە سەر شێعر و ئەدەبیات. بەڵام کوێر بم، تازە پیر ببوو. ئەو زەوقە تەڕ و تازەی غوباری پیری و تەنیایی لێڵی کردبوو. جارجار کە ناتەبایی وەزن و قافیە لە شێعریدا دەردەکەوت هی ئەو دابڕانەیە لە ئەدەبیات و دەرەنگ هاتنەوە سەری. جارجار کە بەخۆییم دەسنیشان دەکرد دەیفەرموو: «خۆ دەزانم وایە، بەڵام تازە لەوە چاترم بۆ نایە. وەڕەز بووم لە هەموو شت»

چەند جار نامەمان بە شێعر و نەسری موسەجەع بۆ یەك دەنارد. خودا ماڵی کوڕە چکۆلەکەی (کاوە) ئاوەدان کاتەوە، قۆڵی هیممەتی هەڵماڵی و ئەو گەنجینەی لە شاراوەیی و تەپوتۆز خواردن وەك زۆربەی دیوانی شاعیرانی قەدیمی کورد ڕزگار کرد و قەرارە لە چاپی بدا. هیوادارم زوو لە چاپ بێتە دەر تا خوێنەران بزانن ڕاوچی چەندە عاشقی وەتەن و جوانی‌یە، چەندە کوردی زانێکی بێوێنەیە. زمانی شێعرییەکەی چەند لە هەژاری ڕەحمەتی نزیکە. یادی بە خێر بێت و دەستی کاوە گیانیش خۆش بێت و لەم هەوڵەدا هەر سەرکەوتوو بێت.

بۆکان . هاوینی ١٣٨٤

---

[1] چێشتی مجێور . عەلی خانی بیگ زادەی بابامیری « شێواو» . لەگەڵ قەڵەم . ل ٣٦

## پێشەکی ماموٚستا حەسەن سەلاح « سوٚران »

**ڕێزدار کاك کاوە**

زوٚر سپاس بوٚ ئیمەیلەکەت، کە بە تاسەوە نامە سەر هەر دوو چاوان. من هەر تازە گەڕامەوە بوٚ ماڵەوە. دیارە بە بنەوەشت و شێلگیری کەڵك لە دیارییە بەنرخەکانت وەردەگرم. هەر وەك وتم ماموەستا « راوچی» یەکێك لەو کەسانە بوو کە قەت نامریٚ و دەبوایە گڵکوٚی پیروٚزی لە تەنیشت ماموەستا « هێمن » دروست بکرایە و پەیکەری لەکن « مامە ڕیشە »، بەڵام دڵنیام کە لە مەیدانی دڵی هەر کوردێکی دڵسوٚزدا، بە بەردی مەڕمەڕی چیای سەربەرزی قەندیل، پەیکەری بوٚ ساز کراوە و ناوی لە مێژووی وێژەی کورددا، بە دێڕی وا دروشت و زێڕێن دەنووسریٚ،کە هیچ توٚفانێك ناتوانیٚ بیسرێتەوە. بەڵام بە داخەوە مروٚڤە مەزنەکان تا نەمرن ، زیندوو نابنەوە. سپاسیش بوٚ توٚ کە وەك ڕوٚڵەیەکی بەئەمەك و وێچوو، جێی ماموەستات چوٚڵ نەکردووە و لەبیرت نەبردوەتەوە، هەر سەرکەوتوو بی.

برات: ح. س. سوٚران[1]

---

[1] ماموٚستا سوٚران یەکیٚ لەو کەسایەتییە مەزنانەیە ساڵی ٢٧٠٨ی کوردی وەك کوردێکی نیشتمانپەروەر بوٚ وەرگرتنی خەڵاتی نوٚبێل ناونووس کراوە. منیش بەو هەواڵە گەشامەوە پیروٚزباییمان لیٚ کرد و هەروەها هێندێك لە ئاسەواری ماموٚستا راوچی و هەوڵە گوٚڤارییەکانی خوٚم بە دیاری بوٚ نارد. بەو هیوایەی سەرکەوتوو بیٚ و دڵی نیشتمانمان وەحەسێنیٚ. ئەویش بەو ئیمەیلە وەڵامی دامەوە و گەورەیی خوٚی بەجیٚ هێنا. زوٚر سپاسی دەکەم.

## دڵۆپی ئەسرینی ئازادی لە شەوی بێدادیدا

**کاوەی ڕاوچی**

*وەکــــوو چـــەنگە ژیـــانی تفـــت و تـــاڵم*
*بـــە چـــنگ و خـــوێن لەگـــەڵ چـــەنگم دەنـــاڵم*
*ســــــەری نینـــــۆخم میــــــزرابن خـــــوراون*
*بـــــە دەس دوژمــــن و یانـــــە دۆســــتی زاڵـــم*

خوێنەری بەڕێزا تۆ هێژای و زۆر شارەزای. گوێ بگرە لێم بە دڵ، بە کوڵ، بۆ دڵی کڵۆڵ، بۆ کوڵی شڕۆڵ، بۆ بۆکڕووزی هەناسەم، بۆ دەروونی پڕ لە تاسەم.

باش دەزانی هەر بنیادەمێ هێندی شانازی و ئاوات لە دڵیا ڕیشەیان داکوتاوە و دڵ و دینیان لێ هەستاندووە، لێ بوونە هاواڵ و هاوماڵ و هاوپیاڵەی شەوگاری تەنیایی و ڕۆژانی بەژانی هەڵوەدایی. وڕێنەیان لەگەڵ دەکات، دەیدوێنن، دەیگریێنن، چەشنی ئاور دەیسووتێنن. یانە ئەوەی بۆی ئەبنە باڵ دەیبەنە حەوێقی حاسمان. لە خەوی شیرینی دەکەن، چن ئەوانە؟ گوڵن؟ کوڵن؟ سۆزی دڵن؟ دوڕن، ئەوانە مەرجانن، بڵێسەن و گڕن، گزنگی تیشکی ڕۆژانن، گوڵاڵە سوورەی ئەوینن، بەرزن، تەڕزن، وەمی دەمی مێشەنگوینن، لەمەش زیاتر لە زەمان و زمانا ناگونجێن، عەقڵن، مەنتقن، زانستن، یەکە یەکە و بەڕێ و جێن. بەڵام زەمانە بێئەمانە، ڕۆت دێتێ هەڵتدەپەسێرێ، شنەی شووبای دێراوی ژینت لێ دەکاتە گەردەلوولی تابووتی مەرگ و هەڵلووشین. دەراوی کانیاوی ژیانت لێ دەکاتە شەختە و بەستەڵەك. ئە بەو حاڵەش، لەنێو گەڕی شانازیدا کیژی ئاوات دەستت دەگرێ و دڵت دەبات بەرەو شەقامی خەبات. دەڵێ: تا ئاسۆی ڕوون، لە خەم و پەژارە ون بوون، کووچەیەکە، مەودایەکە، یان شەپۆلی گۆرانی و مۆسیقاییێکە، لە ڕاستی‌یا، دڵت نایێ پڕ بە دڵ باسیان لێ بکەی، تێر بە چاوان بیاندوێنی. هی وایە بەقات پێ ناکا، هێندی تر ڕادەمێنن، دەڵێن «ئەسپەك لەسەری داوە»، بەسەری ڕووت و بە دەمی خاوێوە دەڵێ چی. ئاخۆ هەشن، شێت و شیدای ئاسۆی گەشن، لەگەڵت دێن، دەتدوێنن، بە ئیمایی دەتهەژێنن.

لە لایەکی دیکەوە تەمەنی لەمێژینەی مێژوو، نیشانی داوە کۆچی گەورەپیاوان نەمردنە، باڵ گرتنە، لە دونیای قوڕینەوە بەرەو کۆشکی بلوورین و بەختەوەری ئەوینەوە. ئەو کەسانەی بە خوێنی گەشی خۆیان و یان تیشکی بیر و مێشکی لەشی خۆیان نەمامی زانست پاراو دەکەن و ڕچەی ڕزگاری ڕەچاو دەکەن و دێراوی ژین بە ئاوی ئەوین دەدێرن، نامرن و هەتاهەتایە زیندوون و «ڕۆژێ لە ڕۆژان دێنەوە» چەشنی ترووسکەی مانگەشەو یان وەك قاسپەی خاسەکەو، چاوی لێڵی دڵدار و شەوپەڕی نەتەوەی هەژار و ئەوینداری گەلەکەیان گەشاوە دەکەن، وێنەی زناو دەژینەوە و تونیایەتی زەین و زەوین دەشکێنن.

یەکەمین شانازی:

- سوپاس بۆ خوای خاوەن بزە و بەزەیی، کەوا بە کوردی لە قەڵەم دام، کردمی بە کوڕی کوردێکی نیشتمانی و خاوەن قەڵەم، وەك مامۆستا «ڕاوچی» ساردەکۆسانی. ڕاوچییەکی بە مەچەکی «تەرت و تەلان و سۆی» مرۆڤێکی خۆڕسکاوی لە سەر لاقی خۆوێستاوی خوواپێداوی نیشتمانی جوان و لەمێژینەم. ئەو بنیادەمەی بە درێژایی ژیان، گوڵی تەمەنی بۆ تمەن بۆڕوو نەکرد. هەر لە سەرەتای کرچ و کاڵیدا بە پێی یاسای بنەماڵەی لەسەر دەستی خووالێخۆشبووی بابی مامۆستا «سەییادی[1]» سوێند دەخوات و دەڵێ:

*سوێندە خواردوومە لەسەر دەستی تۆ*

*خەت نەدەم خاڵ و خەت و نەخشی تۆ*

- هەتا دوایین ساتەکانی ژیان لەسەر ماف و داوای ڕەوای خۆی و گەلەکەی ڕاوێستا. لە قەراغ ژیانێکی پڕ لە خۆشی و حەسانەوە، دونیای بێگەردی ڕووناکبیری هەڵبژارد. بە شێوازی تایبەت لە حاندی نەیاران و نالەبارانی نیشتماندا هەڵوێستی گرت و خەونی خەواڵووی ڕژد و چاوچنۆکانی لە گوڵە شێعری «هێشتا هەر هەم دا» بەرپەرچ داوەتەوە و دەیکردە هەوێنی ژین وبناغەی ئەوین، هەر وەك خۆی دەڵێ:

---

[1] مەلا موحەمەد حەسەنی عەزیزی ناسراو بە مامۆستا سەییادی (١٣٣٠-١٢٥٠) هەتاوی ژیاوە ، بابی مامۆستا ڕاوچییە، خۆشنووس، قسەخۆش و تەخمیسبێژی ناوچەی موکریان بووە و لەگەڵ مامۆستا «ئاوات» و گەورەپیاوانی ناوچە تەمەنی شاعیری بردۆتە سەر.

*دەســـگرە و مـــەنگڵێ جـــوانی بـــەس نـــین*

*چـــۆن لـــە کـــڵ دێتـــە دەرێ ئـــەو شـــەرتە»*[١]

ـ بە پێچەوانەی گەلی وشکەسۆفی و خۆ بەزل زانان، هێدی هێدی لە ئاسکی خەیاڵ دەبێتە میوان. لەو پەڕی سنووری بێ‌سنووری وتارەوە، تاری ژیان و ئیمان دەس دەداتێ و بە نەغمەی غەزەل و گمەی چیرۆك و لەنجەی پەخشان کۆنسێرتی ئەوین دەڕازێنێتەوە و نازناوی «راوچی» هەڵدەبژێرێ و دەڵێ:

*«راوچـــی» دەوێ دەبـــێ کـــوڕ بـــێ*

*مـــەنگێوە بـــێ، گورچـــووبڕ بـــێ*

*دەنـــا هەســـــتی کـــز و چـــرووك*

*بـــۆی نـــاگیری هـــۆنراوەی بـــووك*

ـ «مامۆستا ڕاوچی» خۆش‌وێژ و دڵتەڕ، گیرۆدەی دولبەری دڵبەری «ئازادی» دەبێت. زەرد و بەرد و ماە و هەڵەمووتان تێپەڕ دەکات. گوڵی گیانی شەهید و جوانەمەرگان بە سیحری شێعری خۆی تەڵقین دەدات، بەڵام مخابن لە دوایین ساتی ژیانیدا دەڵێ: «ئەوەی دەمویست بە چاوان ببینم، نەمدی»[٢] تۆ بڵێی چەنێ نیگا و چاوبڕکێنەی.

ـ مامۆستا ڕاوچی، سیاسەتی لە پێناو خزمەت بۆ مرۆڤدا چاو لێ کردووە و هەر بۆیەش لە بواری دەسەڵاتدا لەو پەڕی ڕێز و قەدرەوە ژیاوە. سەرەتای ژیانی سیاسی لە دامەزرنی کۆمارەوە دەس پێ دەکات و دەڵێ: «نەخشێکی مامناوەندیشم دەگێڕا و جاروبارەش زاڵم و زگزلەکانیشم لە ڕۆژی لاوازی ڕەزاخان دەترساندن»[٣]

ـ ساڵی (٤١-٣٨ی) هەتاوی لەگەڵ ڕووناکبیرانی[٤] گەل دەکەوێتە گەمارۆی ساواك و دەخرێتە زیندانەوە و ئاوا دەڵێ:

---

[١] – شێعری پەندی پیران بۆ لاو و ژیران

[٢] – داهاتوو، ڕەزبەری ٨٠، ژومارەی٤٢، ل ١١

[٣] – گۆڤاری مهاباد، ژ٤، ل٨

[٤] – بەشی زۆری ئەو ڕووناکبیرانە بە بیانووی دزی و ڕێگری لە لایەن ساواکەوە گیران و هەڵاوەسران یان لە دوای ماشیندا ڕایاندەکێشان، هێندێکی تر شاربەدەر دەکران، یان شەهید کراون و یان بی سەر و شوێن دەکران.

*کەوتنە ناو بەندەوە لاوانی زیت*
*قەسری قاجار و قزڵقەلعەی خیت*
*دوور لە تۆ «ڕاوچی» بەشی پێبڕابوو*
*دەس بە دەسبەندەوە بەندی کرابوو*
*سی و هەشت تا چل و یەك بەندی بوو*
*دەرد و ئازار و شەکەنجەی دیبوو*[1]

- کۆچ و بەند، نە تەنیا جەستەی بەستەی هەستی خەستی مەستی ڕاوچی ناتەزێنیٚ و مووی ئیمانی نالەرێنیٚ، ئاخۆ بۆی دەبێتە تین و تەوژمی ژیان و ئاوا دەڵیٚ: «باشترە وا بێژم دەسی دەسدرێژان خۆش بیٚ کە لە ناخۆشیدا کردیانم بە شاعیر و ناڵەیان هاوبتمە ناو سندووقی گەلی کوردەوە»[2]

- کاتیٚ لە زیندان ڕزگار دەبێت وێڕای پێوەندی لەگەڵ مامۆستا «ئاوات» و گەورە پیاوانی ناوچە، بە ماڵ و منداڵەوە بەرەو گوندی «شێن»ی کوردستانی باشوور وەڕیٚ دەکەویٚ و بۆ ماوەی چەن ساڵ وەك مامۆستایەکی ئایینی و بەرپرسێکی سیاسی لەو گوندە ڕەزاسووکەدا دەمێنێتەوە.

- لە لایەکی دیکەوە بەشی زۆری ئەرکی کۆمەڵ و گۆڕانکارییەکان دەخاتە سەر شانی شانەی قەڵەم و چینی خوێندەوار بەرەو کۆشکی خوێندەواری هان دەدات و دەڵیٚ:

*هەستە بخوێنە برا مێشتە زووە*
*زەحمەتی تۆ بۆ بەرەی داهاتووە*
*پاشی مردن پاشەرۆکی کردەوەت*
*بەرهەمێکی پایەدارە بۆ نەوەت*

- لە ڕاستییا بیر و بڕوای ئایینی، هێزی نیشتمانپەروەری، هۆگری بە سروشت و هەواری لادیٚ و کتێب و قەڵەم و ... خاڵەکانی دیکەی سەرکەوتنی بابم لە ژیانیدا بوون. ئەگەر

---

[1] – شێعری پردی سوڵتان

[2] – گۆڤاری مەهاباد، ژ٤، ل٨

هەڵوەدایی، دووره وڵاتی، دووره هاڤاڵی، کۆچ و زیندان، نەخۆشی و هەناسە ساردی لێ گەڕابایە، لەگەڵ قەڵەم دەبووە هاوبەش و هاوباوەش، کوڵ و کۆی دڵی کڵوڵی پێ دەڕشت.

ـ پڕ بەدڵ دەڵێم، مامۆستا بەر لە زەمان هەنگاوی هەڵدێناوە، بە زمانی ڕەسەن و پاراوی کوردی، وشەی تیر و تۆخ، ئەدەبیاتی فۆلکلۆری دەنەخشاند و بسکی پەخشانی دەکردە شۆڕابە و لەو هەوارە خۆشەدا ڕەشماڵی چیرۆکی هەڵدەدا و هەوارگەیەکی پڕ لە بەیت و باو و قسەی نەستەقی دەڕازاندەوە. بە ئیمایێ گوڵەکانی کێوی دەهەنگاوتن و کەوی دەکردن، بە دیاری «خەرمانی گوڵان» پێدەشت و چڕ و لێژی ژیانی کردۆتە جارە گوڵ و هەستی نەتەوایەتی گوڵ دەکا و دەڵێ شلێر و شەشپەڕ و زۆربەیان هی گەلی کوردن و ماڤ کەسیان بە سەرەوە نییە و ئاوا دەیان دوێنێ : «من ناوی ٤٤٥ گیا و گوڵم هێناوە لە گیاگە کەم پرسیوە. خەڵکی کوێی، دێمی، بەراوی، باڵت چەندە، تامت چۆنە، بۆچی دەبی، کە دێیە دەرێ ، کەی گوڵ دەدەی[1] و... گیایەکەش وڵام دەداتەوە.

ـ لە بیرەوەرییەکانی وا دەردەکەوێ یەکەم مامۆستای شێعری ڕاوچی، بابی واتە مامۆستا «سەییادی» بووە و دەڵێ: «چونکە باوکم خۆی شاعیرێکی بەزەوق و خۆشبێژ و دەسخەت جوان بووە و لە سەرەتای خوێندنەوە هەوای شێعر و وشەی ڕێك و پێکی ئاوێتەی مێشك و خەیاڵ و ڕۆحم بوو[2]» یان دەڵێ: «شێعر پێم وایە لە شعوورەوە دێ، شعووریش بە نیسبەتی کەسەکانە» ... شێعری مامۆستا هێمن و هەژاری لای بەرزە و دەڵێ: «مامۆستا هەژار و هێمنی نەمر مەسەلەی زۆر جوانیان وتووە. ئەمن بەڕاستی لە خۆشی مامۆستا هەژارەوە دەستم دا قەڵەم و...»[3] لە ڕاستیدا لام وایە ئەوەی مامۆستا نووسیویەتی «بۆ دڵی نووسیوە و ماڤ خۆیەتی لەسەر دڵ کاریگەر بێت.»

ـ بە چاوخشانێ بەسەر ئاسەواری مامۆستادا بەم مەبەستە گەیشتم زۆر عاشقانە دەس پێدەکەن لە نێو وەرزی عیرفانا چرۆ دەردەکەن. لە ئاکامدا نووسەر دەبێتە قەقنووس و ژیلەمۆ و گڕێکی بەتینی نیشتمانی بەژن و باڵای داگیردەکات. هەر وەك لەو شێعرەدا دەڵێ:

---

[1] گۆڤاری سروە، ژ٢٠٤ . ل٣٨

[2] - داهاتوو، پووشپەڕی ژ٣٦ ، ل٩

[3] - سروە، ٢٠٤، ل ٣٧ (وتووێژی کاك ئەمین گەردیگلانی و کاك عەبدولخالق یەعقووبی لە گەل مامۆستا ڕاوچی.

*خەڵکی تەلان و تەرت و سویم*

*خونچەی نەدێراوم لە دێم*

*شەرت و مەرجم تێک ناشکێ*

*لەتلەت کریم بۆ گوڵ دەدوێم*

- سەرەڕای عیشق و عیرفان و نیشتمانپەروەری زۆر تر لە دوو بەشی تەمەنی عومری باسی تەرەکەمەیی و هەڵوەدایی خۆی و گەلەکەی دەکات. لە خودا دەپاڕێتەوە و دەڵێ:

*خوا ئەی ڕێبەدەستی ڕێزمانان*

*دە باسی مەش بهاوێ سەر زمانان*

*زمانی شێعری ڕاوچی وا بگێڕی*

*کە مێژوو بەرهەمی بگرێ لە زێڕی*

- بە هێزی پێنووس درووشمی پەخشان نوێ دەکاتەوە و چیرۆکی «عاشقانە و ڕئالیستی» «بووکی گۆڕستانی کۆن» دەکاتە تابلۆیەکی جاویدانی.

- وادیارە مامۆستا نە تەنیا شاعیرێکی نەتەوەیی و سەرکەوتوویە ئاخۆ دەتوانی نووسەرێکی میللیگەرا و هەڵکەوتووش بێت، کەم نووسین و جوان نووسین، هۆیێکی دیکەی سەرکەوتنی دونیای قەڵەمی ئەو بوون. چیرۆکەکانی، پەخشانەکانی، نامیلکە ئەدبییەکانی بەڵگەی ڕاستەقینەی ئەم مەبەستەن.

## کاتێ منداڵ بووم:

هەر لە سەرەتای منداڵییەوە نێوی کاوەی بە گوێدا چریکاندم. گەلێك جاران بە ئەم شیعرە بەرزە زۆری دڵخۆشی دەدامەوە:

*«کاوە کوتکی شکاوە بێچەرمە*

*خوێنی لاوان کە لە بیر کا، شەرمە»*

- دەم بە بزە و قسەخۆش و سەر و ڕووخۆش بوو. نێوی نوێ و پڕ لە حەزی بۆ منداڵەکان دیاری دەکرد. وەك هەژار، هێمن، شۆڕش، کاوە، هیوا، هێرش، ڕازاوە و... کۆی دەکردینەوە

و لە نێو کۆڕ و کۆمەڵگاکانا شێعری پێ دەخوێندینەوە. وێنەی سۆزێکی مەسیحایی کۆرپەی دڵی ئێمەی دەلاواندەوە. بۆ یەکەم جار لە جێژنی ڕووخانی شادا لە ئاوایی ساردەکۆسان ئەم شێعرە ڕەزاسووکەی فێری منالانی ئاوایی کرد و بۆ ماوەی حەوتەیێ لەم ناوچەیەدا بوو بە جێژن و شایی. شێعرەکە ئاوا دەستی پێدەکرد:

.... و

*ئێمــــــە کـــــوڕی دێهـــــاتین* — *عاشـق بـە بـەرد و تـاتین*

*ناترســــــــین و نـــــــاڕەوین* — *فیـــدای خـــاك و وڵاتـــین*

و ....

ـ بەرەو دنیای بێگەردی ئەدەبی کورد سەرنجی ڕادەکێشاین. بەیتی «کاوە و زوحاك»ی بۆ من و هاوەڵەکانم دەگێڕاوە. کاتی نوێ بوونەوەی ساڵ بە گڕی بەتینی نەورۆز گوڕ و شینی وە گڕوگاڵ دەخستین. بە ئیشتیا تام و چێژی زمانی کوردیمان کردبوو. وە بیرم دێ ساڵی ٥٩ بوو. جەژنی لەدایك بوونی پێغەمبەر «د» لەگەڵ هاوڕێکانی لە دەراوی گوندی مووسی[١]دا لای دا و نوێژی عەسریان کرد و شێعری منالانەی «یا محەمەد»ی بۆ نووسیم کە ئاوا دەستی پێ دەکرد:

و......

*یا محەمەد یا محەمەد یامحەمەد*

*ئاسمان گرتـی تـەدارەك یامحەمـەد*

*ڕۆژی بوونـی تۆ موبارەك یامحەمەد*

و......

---

[١] ـ ئەم گوندە سەر بە ناوچەی گەورکی موکریانە

- ئاخرین جاریش ماوەیێ بەر لە کۆچی، شێعری بەرزی «تێمیسکە»ی پێ لەبەر کردم. شێعری «گۆچانی» بە خەتی نەستەعلیق پێ نووسیمەوە و کردییە دیاری[١].جاروبارەش بە «مامەکاوە» نێوی دەهێنام. ئەگەر کارەکەمی بە دڵ بایە دەیگوت:ئافەرین «بێچووە قاز» و....

لەگەڵ کێو و شاخ و داخ تێکەڵی کردم. بەژنی بووکی سروشتی بۆ کردمە سەرچاوەی ژیان. ئەو گفت و لفتە شیرنانەم لێ ببوونە مەکۆی ئەویـنداری و ڕچەی ڕزگاری. بۆیە بڕیارم دا کوڕێکی بێئەمەك نەبم.

## کۆچی «ڕاوچی»:

باوەڕم نەدەکرد بەجێم بێڵێ. پێم وا نەبوو باب مردن هێند گرانە. دەردە، ژانە، چۆڵەمەی ئەستۆ شکانە، بێهیواییە، ماڵڕووخانە، حاسمانی ژین تێكقرمانە. مامۆستا هەژار وتەنی: «ئەوەی لە دەوری ئاورە کوا دەزانێ چیە ئێشی ناو ئاور».

- بە داخەوە لە بەرەبەیانێکی بەهاریدا گوێی ئاواتم هەڵوەری و لە لایەن برا گەورەکەمەوە کاك مەحموودم، هەواڵی کۆچی ئەو بەرزە ڕۆحەم پێگەیی. وەك کەوان وێکی هێنام. زرینگەی ئەو سەفەری بێگەڕانەوەیە ئاورینگی لە دڵم کردەوە. قەڵەمی دەست و پێی شکاندم. وەکوو هەتیو بێپەسیو مامەوە. دوایین پشووی جۆزەردان، ماڵئاوایی و دەس لێك بەردان، کزەبایەکی سارد و حەزرفین، خورپەیەکی لەناکاو و دڵتەزێن. هەستم کرد مانگی ئاوات و تاقی لاوەتیم لە ئاوا بوونە.

- بەڵام ڕێز و گەورەیی گەل، سەبارەت بە کۆچی مامۆستا ڕاوچی بۆم بوو بە شەفا و هەل، لەرز و نۆبەتی بۆ بڕیم. سەرەڕای هەموو بیرەوەرییەك هاتمە سەر ئەم بیرۆکەیە، ئەو جۆرەی شایانی بوو و نیشتمان دەیناسی، ئێمە نەماندەناسی. نووسەر جوانی وتووە: «میوە کاتێ دەگا لە دار دەکەوێتە خوارەوە، بەڵام شاعیر کاتێ لە دار دەکەوێتە خوارەوە دەگا» سوپاس بۆ هەموو لایەنێك.

---

[١] – ئەم شێعرە بۆ گۆچانی «مەلا حەسەنی سەعدیزادە»ی گۆڵی وتراوە.

## چلۆن ئاسەوارەکەییم کۆ کردەوە؟

دوای ماوەیێ سرێو و قوڕ و قەپی، وەك بەچکە هەڵۆیێك، سەر لێشێواو و هێلانە لێڕووخاو، شڕ و دڕ لە چڕ و خڕ هاتمە خوارەوە. خۆم خستە ناو دەریای مەندی مەکتەبی ماموستا «راوچی»یەوە. دەستم بە سەر ئاسەوارەکەی داگرت. دیتم ئەوەی لێی دەگەڕام لەوێدا بوون. لەگەڵیان بوومە هاوگەڕ. دەبوو کۆ کرێنەوە، بیان‌نووسمەوە، لێر و لەوێ بیاندۆزمەوە. چەشنی گەوهەری یەکدانە، بیانکەمە سوورمە بۆ چاوان. یا نە، ببنە هێزی هەناو و مەشخەڵی ژینی تێك‌چرژاو.

بە پێی وەسیەتی بابم و ئەرکی بنەماڵەیی و چاوەڕوانی گەل، ئەم ئەرکەم بە ئەستۆ گرت و خۆم پێوە هەڵواسی. ئەویش خۆم و گەدوگیپاڵی شڕ، دڵێکی کویل و پڕ، قەڵەمێکی گێژ و وڕ. ئەو کارە پێویستی بە ڕاوێژکاری هەبوو و باری ئابووری دەویست. زەمانی دەخایاند. بۆ منێکی تاق و تەنیا قورس بوو. وابوو بڕیارم دا کۆیان کەمەوە، ڕێك و پێکیان کەم، لە دوای تایپ هەر بەشێ بدرێ بە کارزانی خۆی، هێدی هێدی هەنگاوم هەڵدێناوە. دەستی یارمەتیم بۆ لای خەڵکی بەئەمەك و خاوەن قەڵەم درێژ کرد. ئەنجومەنی ئەدەبی بۆکان بە یارمەتی ماموستایان کاك ناسر وەحیدی و ساماڵ و ئەمین و... و ئەنجومەنی ئەدەبی سۆما بە یارمەتی کاك مستەفای ئیلخانیزادە و... کۆڕی ڕێزگرتنی «ماموستا ڕاوچی»یان دانا. ماڵیان ئاوەدان. منیش بە نۆبەی خۆم بەشداریم کرد و پشووم هاتەوە بەرخۆ و سوپاسیان دەکەم.

بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری مەهاباد دا، ئاگاداری کۆکردنەوەی ئاسەواری ماموستا ڕاوچیم ڕاگەیاند. لە کۆڕ و کۆمەڵگاکانا ئەم کارەم درێژە پێ دا. هێندێ نەوار و نامیلکە و... بە دەس گەیشتەوە. دیارە لە تانە و لۆمەش بێبەش نەبووم. بە هەڵکەوتیش دەسخۆشانەم دەبیست. بەڵام نە زۆریان پێدا دادەکشام و نە هێندەشیان پێ هەڵدەکشام. پێم وابوو «ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێ» ئەو پەلەیەی لە هێندێك جەماوەری بەپەلە هەبوو لە من نەبوو. هەر وەك ئەو دەردەی لە من بوو لەوان نەبوو. هەستم بە ئەمەش کردبوو نووسراوەکانی بابم، زۆر ڕازی نەبیسراویان تێدا هەن و نوێن، چی وام نەدیوە لە نێو ئەم ئاسارە بەنرخەیا کۆن بێ و یان بە

پێی زەمان، بایەخیان بێتە خوارەوە. لەبەر ئەوەی مامۆستا «ڕاوچی» پێشمەرگەیێکی کۆڵنەدەری ڕێبازی قەڵەم و نیشتمانەکەی بوو.

## یەکەمین ئاوات:

بەر لە هەموو شت پێم خۆش بوو لە ونبوون بیانپارێزم. بە ڕێکوپێکی بگەڕێنەوە بۆ نێو دڵی نیشتمان. بەشی دووهەمی دیوانە شێعرەکە لە دوای کۆچی ڕاوچی کۆ کراوەتەوە. وتاری وا هەبوون بە چەن شێوە لە چەن ناوەرۆکدا لە چەن زەمانی جیاوازدا نووسرابوون و بڵاو کرابوونەوە. کە دەبوو لە بارەی مانا و کێشەوە هەڵسەنگێندرێن و هەڵبژێردرێن و دووپات نەبنەوە، لەگەڵ نووسراوەکانی مامۆستا یەکتر بگرنەوە. بۆ وێنە شێعری «سەری بێتاج» لە زۆر جێ بە نێوی «سەبرت هەبێ» و «تاجی بێسەر» هاتووە. یان شێعری «چەکی ڕزگاری» بە نێوی «شێعر چییە» هاتووە. «تێمیسکە» و «بزەی شۆڕش» چەن نوسخەی جیاوازیان هەبووە و لە ئاکامدا ئاخرین دەسنووس و بەرهەمی مامۆستا ڕاوچی نووسراوەتەوە و هاتۆتە سەر ڕوومەتی قاقەز. بۆ ئەم مەبەستە و بۆ پێداچوونەوە لە هەر بەشێکدا لە مامۆستایانی باش کەڵکم وەرگرتووە.

پێم خۆش بوو خزمەت بکەم و کارێکم لەدەس بێت. واتە «ئەگەر گوڵ نیم دڕکیش نەبم» ئەم بەرهەمانە بە زووترین کات لە تایپ بێنە دەرێ و بخرێنە ژێر چاپ و بگەڕێنەوە نێو کتێبخانەی دەوڵەمەندی کوردییەوە. لە ناوەندی کوردیکا برایان کاک محەمەدئەمین شاسەنەم و کاک عەلی جەوشەنی، بۆ کاری پیتچنین و ڕازاندەوە زۆریان یاریدە دام، دەستیان خۆش بێ وماڵیان ئاوەدان. پێم وایە چم نەکردووە تەنیا ئەرکی بچووکی خۆم جێ هێناوە و ڕێی منەت نییە. ئامانجی منیش خزمەت بە گەلەکەمە. هەر لە سەر ئەم یاسایەش بە شوێن کارەکانی بابم کەوتووم. جیاواز لەوە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانا بەشداریم کرد لەگەڵ گۆڤارەکان و حەوتەنامەکان کارم کردووە و هەروەها چەن هەولێکی میدیای و رادیویی و .... ئاوێنەی ئەمنیش بیروڕای نیشتمانمە.

## دواپین هەواری بەهاری تەمەنی ڕاوچی:

لەو ساڵانەی دواییدا شەپۆلی ژینی شار، غونچەی بەهاری دڵی مامۆستای نازدار ئازار دەدات و بە بیانووی مەلایەتییەوە بەرەو ئاواییەکانی سەدراباد، ترکاشە و دەروێشان دەڕوا. هەر وەك مامۆستا سوارە دەڵێ:

*«بڕۆمە دێ کە مانگەشەو*

*بزێتە ناو بزەم*

*چلۆن بژیم لە شارەکەت گوڵم*

*کە پڕ بە دڵ دژی گزەم ...»*[1]

ڕاوچی و ژینی ساکاری لادێ و هاتوچۆی ئەدەبدۆستان و پێوەندی لەگەڵ گۆڤارەکان بەتایبەت گۆڤاری «سروە» و «مەهاباد» کەسانێ وەك کاك ئەحمەدی قازی و گوڵە لە ژین تۆراوەکان وەك کاك «مارف ئاغایی» و کاك «جەعفەری قازی» و... دیلانی قەڵەمی پتەوکردبۆوە لە کۆڕی شینگێڕی مامۆستایان دا هێمن، هەژار، حەقیقی، ئەفخەمی و خوشکە ژیلا و... شین دەگێڕێ و لە کۆنگرەکانی «مامۆستا حەقیقی» لە بۆکان و «مەولەوی تاوەگۆزی» لە سەقز و فەرزانەگانی کورد دا و ... بەشداری دەکات.

## ڕاوچی و داوی مەرگ:

مامۆستا ڕاوچی لە مەرگ نەدەترسا، دەیگوت: «منەتی نەبێ، تەنیا لە جێدا نەمخا». هەربە پێی ئەو باوەڕە ماوەیەکیش بەر لە کۆچی بە شێوەی نەوار و سەفەر و نامە و دوعا و سلاو لەگەل ماڵ ئاوایی دەکات و ئاوا دەڵێ:

...و

| لێم وەکۆ بن خـــزم و بـــرا | لە ژین کـــووژایەوە چـــرا |
| --- | --- |

...و

و دیسان دڵخۆشی کوڕ و کاڵی زێدەکەی و... دەداتەوە و دەڵێ:

---

[1] - خەوەبەردینە، سوارە ئیلخانیزادە.

لات وا نەبێ بابت دەمرێ — لە گۆڕا سەنگەرێ دەگرێ
لە مەرگی بابت مەترسێ — دوژمن لە کێلی دەترسێ
کێلی «ڕاوچی»و لێ نەگۆڕێ — داوای بردۆتە بن گۆڕێ
کێلم ڕۆژێ هەڵدەتۆقێ — لە چاوی دوژمن دەچەقێ

## راوچی و کۆچی ماڵاوایی لە ژیانی دونیایی:

مەخابن زۆر مەخابن، مامۆستا ڕاوچی ئەو گوڵ بە دەمەی بە گوڵاڵەی سووری ئەوین هەڵاڵەی عەشقی بۆ ژین هەڵدەبەست، بە شێعر و پەخشان و وتەی جوان، فێنکایی دەخستە نێو کۆڕ و دڵان، دوای حەفتا و چەندێك تەمەنی پڕ لە هەوراز و نشێو، بەرەبەیانی ڕۆژی ٣٠ جۆزەردانی ساڵی ٨٠ی هەتاوی، دوای وتوویێژ لەگەڵ خووای خاوەن بەیان لە گوندی دەروێشان لە ژینی پڕ لە ژانی دنیا ماڵاوایی کرد. بە هۆی نەخۆشی دڵ، دڵی گەورەی لە لێدان کەوت. هاودەنگ لە گەڵ سۆز و دەنگی خەڵکی بەسۆزی کوردستان لەشی گەشی لەگەڵ گڵ بۆ هاوبەش. بە پێی وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی میراوای بۆکان لە پەنای قەبری برای گەورە و دەنگخۆش و بەیتبێژی (حەمە مەلا) بە گڵ ئەسپێردرا. بە هەستی خەستی مامۆستایەکی هاوبەندی خۆی بە نێوی «مامۆستا محەمەدی قەبەغلووجە»[1] تەلقین و گوڵباران کرا.

مامۆستا ڕاوچی، لە نێو گۆڕ دا هەدا نادات . سەر لە نوێ سەنگەر دەگرێ و مەچەکی ملهوڕ با دەدات. نووکی کێلی دەهاوێتە دڵی دوژمنەوە و دڵخۆشیمان دەداتەوە و دەڵێ:

*بەرەو گۆڕم کە هاتی بۆم مەناڵە*
*بڵێ ئەم گۆڕە گۆڕی ڕاوچی زاڵە*
*ئەوەی بۆ گەل ژیا و ژینی خەلات کرد*
*مەزەی مێژۆکی دایکی پێ حەلاڵە*

---

[1] یان مەلا محەممەدی ئیمامی کۆندەلان. مامۆستایەکی بە بنەماڵە کورد و مێژووناس و قسەخۆشە. لەگەڵ مامۆستا ڕاوچی لە زیندانا (ساڵەکانی ٤١-٣٨) هاوبەند دەبن. نووسەر و درێژەدەری هۆنراوەی بەرزی «شەماڵ و زریان»ە. ئێستا لە شاری سەقزە دەژی.

## راوچی لە ئاوێنەی کتێب و گۆڤارەکاندا:

١. گۆڤاری سروە، ژ ١٨٠

بەڕێوەبەرانی ئەم گۆڤارە دوای سەرەخۆشی و چاپی پەخشانی (پۆڕ و هەڵۆ)ی مامۆستا «ڕاوچی» شێعری «دڵدار»[1] چاپ دەکەن وا ئاوا دەڵێ:

...

| | |
|---|---|
| ئەی پیری ژیری جوانی خاوەن بیر | زانا و پسپۆڕی بۆ گەلت شێلگیر |
| گشت کوردەواری بۆ تۆ دەکا شین | بە بێفرمێسک لە چاو خوێن دەگرین |
| هونەری شیعر وێنەی بیجادە | ساکار خۆمانە زۆر بێئیفادە |

....

٢. حەوتەنامەی داهاتوو، پووشپەڕی ساڵی هەشتای هەتاوی (دیمانەیەك لەگەڵ ڕاوچی) ئاوا دەڵێ:

«کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی «ڕاوچی»م دا بە هەواڵێکی ئەدەبیم، بە بزەیەکی ساردەوە وتی: مەلاکەریم نەمردووە. بە سەرسوڕمانەوە وتم: عەمری خوای بەجێ هێناوە و جێی هێشتووین. پێکەنی و وتی: پیاوی گەورە قەت نامرێ. ئەو تەنیا خۆی لێ شاردووینەوە، ئیتر باوەڕم کرد «نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین»

٣. گۆڤاری موکریان، ژ ٣، پایزی ٨١، حوسەین خودکام:

شریتی ماڵئاوایی ڕاوچی کە لە زۆربەی ماڵەکان میوانە، بە پێوەرەی ئەدەبی، هەڵدەسەنگێنی و دەڵێ: «... شاعیر واتە خوالێخۆشبوو «ڕاوچی» لە شیعردا شێوازی کلاسیکی وەبەر چاو گرتووە، وا دیارە لە باری ناوەڕۆکەوە بەرگی ئازادیخوازی و نەتەوایەتی بە بەردا کردوون» و...

٤. ئەمینی گەردیگلانی، مەرگە خەون، . شێعری پردی پرشنگ . ل٥٣)

.....و

*مامە ڕاوچی ڕەوەز و تەرت و تەلان*

*ئێستە کەی کاتی لە خەو ڕاچوونە*

[1]. ئەبووبەکری بەنگینی

کە دییان کۆتەڵی باڵات ڕووخا
داڵە کەرخۆر لە وڵات بەربوونە

....و

بێبژیو ماوە هەڵۆی لێژ و دڕاڵ
سپیە جێژوانی پەپوو و کوندانە
لەرزی قامکی پەلەپیتکەت سڕ بوو
چاوی سیرەت گڵی لێ میوانە

....و

مانگی سڕبوو سەری نا سەر ئەژنۆی
بە خەفەت گردە بڕی «بەردە هەڵۆ»[1]
شاخ سەری نا بە دڵی گوندەوە شەو
کەسەری کۆوە دەکردن کۆ کۆ

....و

٥. ڕەسووڵ چووپانی «شوانە». دیاری شوان. شێعری گوڵواژەی ئەوین. ل٦٤:

......و

تۆ کە سەرقافڵەی ئەویندارانی ئاواتی دڵی
خاوەنی سۆزی بەسۆز و ئەو دەروونەی پڕکوڵی
ڕاوچی دەشتی عەشقی پاکی، مامزی هیوای گەلی
داری بەر، پیریش دەبێ پڕبەرترن پەلك و پەلی

.....و

٦. ماموستا نووری. شەوێك و خەوێك. بستووی ژیان. ل ١٢١-١٢٥

...و ماموستا مەلا کەریم عالمێکی ئەدیب و هونەر و زانا بوو. هەستی نەتەوەیی هێند زۆر بوو کە مەسڵەحەتی بەڕێوەچوونی دونیایی لە پێناوی ئارمانی نەتەوەیی دەنا و...

[1] نێوی کێوێکی بەرزی موکریانە و لە پشتی گوندی ساردەکۆسانە، ماموستا «راوچی»ش شیعری بۆ داناوە.

٧. ابراهیم افخمی، تاریخ و ادب موکریان، ج٢، ل ٣٥٩-٣٥٤
سەرەڕای ئەوە ژیاننامە و وێنە و شیعرێکی «فارسی» و یەکی کوردی مامۆستا «ڕاوچی» دەنووسێ و ئاوا دەڵێ:

«.... و در سال ١٣٣٨ خورشیدی در بیدادگاه حکومت طاغوت به ٥ سال زندان محکوم شد و با پشت سر نهادن محکومیت در زندان این شاعر بااحساس و هنرمند، وقت خود را تلف نکردەاند راه صنعت و حرفه را برگزیدند تا بیشتر برای جامعه خود مفید واقع شوند. در برگشت به خانه خویش با دست پُر برمی‌گردد با فراگرفتن حرفه‌های پزشکی خصوصاً دندانپزشکی، هم اکنون در این حرفه به خدمت مردم مشغولند و در ایام فراغت نیز با طبع ظریف و لطیف خود اشعار زیبا و جالب و جذاب می‌سرایند و دیوان اشعارش که هنوز به چاپ نرسیده است مملو از اشعار دل‌نشین با اصطلاحات مأنوس محلی و واژه‌های اصیل کردی می‌باشد و بموازات شاعری هم، نثرنویسی ماهر و نویسندەای پرذوق در ادبیات کردی به شمار می‌آیند.»

٨. خۆشم پڕ بە دڵ لە پۆلە چوارینەیەکدا بە نێوی «بە بێ‌تۆ»دا، یادم لە بابم کردووە کە یەکیان بۆ وێنە دەهێنمەوە[1]:

و.......

*کە شووبای بسکی پەخشان دەمژەکێنێ*
*قەتارەی یادی تۆیە دەمڕفێنێ*
*لە ژێر تاڤگەی هەواری سەوزی سۆزت*
*بە بێ تۆ بێکەسییە دەمڕەتێنێ*

*کە میزرابی بەیان دەدرێ لە تارت*
*«گوڵ و بولبول»[2] پەشێون بۆ وتارت*
*بەرەو گڵکۆی هەوارت دێنە داوەت*

---

[1] – ئەم چوارینەیە زۆرە و لە ڕێوڕەسمی کۆچی مامۆستا کە کۆڕی «سۆما»ی بۆکان سازی کردبوو، خوێندراوەتەوە.

[2] شیعرێکی مامۆستا ڕاوچییە بۆ شینگێڕی مامۆستا حەقیقی وتراوە.

*لـــە ســـوێیان دەس بەژنۆیـــە «بـــەهارت»*[١]

و ..........

٩. کاك عەلی گوڵی (نووسەر) گێڕایەوە و وتی لە وتارێکدا باسم کردووە:

«زۆر جاران مامۆستا ڕاوچی دەیگوت، هیوادارم "کاوە"ی کوڕم لە دوای من وەك "خانی" کوڕی مامۆستا "هەژار" قۆڵی هیممەت هەڵماڵێ و شوێنەوارەکەم کوێر نەکاتەوە و ئاسەوارم بۆ کۆ کاتەوە و بە چاپیان بگەیەنێ».

لە کۆتاییدا بەم شێعرە هەنیسکی خۆشم هەڵدەڕێژم:

## دابڕان

دەنگـی زەنگـی خێڵـی مەرگـە، هـەڵکزانی لـێم دەوێ

وا لەسەر بستووی شەمی ژین گڕ سووتانی لێم دەوێ

داخەکەم بۆ نەوگوڵێ، دڕکی خەفەت جەستەی تەزان

وا لـە جـێژوانـی خـەبات، گـوڵ هـەڵوەرانی لـێم دەوێ

هەر بژی ئەو سەردەمەی دەم، دەمدەمانی بوو، دەمێك

گوڵ لە عیشقی گوڵوشەی ڕووی بڕك و ژانی لێم دەوێ

چـی بڵـێم بـەم بـسکە خـاوەی وا لـە گێـژاوی خـەیاڵ

چەشـنی چـاوی لێڵـی دڵـدار، چـۆم و کـانی لـێم دەوێ

چـی بکـەم بۆو جام وشـانەی نـاو لەپی هەسـتی حـەزم

وەك کـوژاوی نـاو دڵـی شـەو، ڕەمـزی ژوانـی لـێم دەوێ

داخەکـەم بۆ خـاڵ و نەخـشی ڕوومـەتی جـامی جـەمی

شـەونمی پـەلکی گوڵی ڕووی، بـای خـەزانی لێم دەوێ

ئاخ بـۆ ئـەم تاجـە گوڵـەی تـاجی سـەری بووکی وەتـەن

هـــەروەکوو چـــاوی ســـتێران، ڕاخزانـــی لـــێم دەوێ

دەك بـژی بـازی سـەفەر، خـاوەن زەفـەر بـۆ شـاپەڕت

---

[١] «بەهار و جێهەواری کۆن» شیعرێکی مامۆستا ڕاوچییە.

چەشنی بەژنی ڕووی شەهیدە دوو جیهانی لێم دەوێ
چەقڵی چاوی تاج و تەختی بزگوڕی «کاوە»ی دلێر
ئــەو غەزالــەی بــاغی زانــست، دابڕانــی لــێم دەوێ

براتان: کاوەی کوڕی ماموستا ڕاوچی

٣٠ جۆزەردانی ٨٥ (پێنجەمین ساڵەهاتی کۆچی ماموستا ڕاوچی)

سەرچاوەکان:

١) سەرجەمی ئاسەوارەکانی ماموستا «ڕاوچی»
٢) ئارشیوی ئەنجومەنی ئەدەبی بۆکان و سۆما
٣) شەوێك و خەوێك، بستووی ژیان، ماموستا محەممەدی نووری
٤) تاریخ فرهنگ و ادب مکریان، ابراهیم افخمی
٥) مەرگە خەون، ئەمین گەردیگلانی
٦) دیاری شوان، ڕەسووڵ چووپانی (شوانە)
٧) گۆڤاری سروە
٨) گۆڤاری مهاباد
٩) حەوتەنامەی سیروان
١٠) حەوتەنامەی داهاتوو
١١) گۆڤاری «موکریان»
١٢) حەوتەنامەی «فردای ما»ی بۆکان

و....

## ئای کوردستان چەندە جوانی

*ڕاوچی*

لە خاکی پاکی کوردستان، کوێت پێ پەڕە و کوێت پێ چوکە لە بەر چاوان، ڕەزاسووکە، نەوەك بووکە، بۆ خۆی بووکە، ئەو بووکە گراوی زۆرن، دۆست یان دوژمن، ڕەش یا بۆرن.
سەدان ساڵە بەرەی دوژمن، بەهێز بێپێز، نیخن، ورگن، لەسەر جوانی ئەو باڵایە، شەڕ و قیرە و هەلایانە، لێکدانیانە، هەرکەس دەیەوێ ملکی وی بێ، کوردستان بۆ ئەو کەوی بێ، لەو بارەوە لێکدەکوژن، لێکدەنێژن، خوێن دەڕێژن.
چەکدار بێچەك، خاوەن پوول و پارە و مەچەك، شاعیر، نووسەری قسە زل، بەمل بێمل، بەو خاکەوە دەڕاوێنن، هۆمەن دێنن، لێیدەنووسن بۆی دەنووسن، جادو و تەلەسمی لێدەکەن، سەدان فێڵی بۆ جێ دەکەن، بە تۆپ و تانك دەیترسێنن. بە سەد حیلە دەیدوێنن، دەیانەوێ بینەوێنن، مێزی پیسی تێوەرێنن، جوانی لە جوانێ داگیر کەن، خۆی پێ ژێر کەن، بەڵام خۆش بێ کورتەك لەبەر، خێوی سەنگەر، خاوەن دەست و چەك و خەنجەر، مۆڵەتی دوژمنان نادەن، داوێنی ئەو بووکە بادەن، نەتوانراوە تا ئێستا کە، دەستی تێخەن(خەپلە و شاکە) کوردستان هەروا بەرچاوە، بە ڕووسووری هەرواماوە، کوردستان بەکەس ناخورێ، بەشیکوردە و کورد نامرێ.

## پێشەکی پێشکەشکراو

*ڕاوچی*

...یەکێ بوو یەکێ نەبوو، هەڵسووڕێنەری خول و سووڕان هەر خوا بوو، ئەو خولەی هەڕەمەی لاوی من بوو، خول نەبوو هەڵخولان بوو، هەڕەتی گەڕوگەف و پلان و گلان بوو. دەم و دەست و هەناو شل بوو، ئاغا و کوێخا و گزیر نەبێ کۆمەڵ گول بوو. بێدەسەلات، لارەمل بووین، لە ژین، لە دین، لە بەرهەمی ئاو و زەوین، بێماف و بەش چارەڕەش بووین. بۆ ملهوڕان بارەبەر بووین، گۆشتمان، شیرمان، قوڕقوڕۆکەی هەست و بیرمان، کەوڵ و پێست و تووکەسەرمان بۆ بێ شەرمان، مفت و مەعاف و بەلاش بوو بە یاسای ئەودەم، ڕەواش بوو.

نەچار هەبوو نە پەنایێ دەسدەکەوت، بەختی ڕەشوڕووتان خەوت. نان هەر نەبوو، ئەگەر هەبا خەپلەی گاڵ بوو، شیلە گەرچەك، چۆڵەچرای ماڵوحاڵ بوو، زۆربەی کۆمەڵان برسی بوون، بێئاوردوو و بێکورسی بوون. چەکمەمان کاڵە و پێتاو بوو، بێنازیمان، لاوازیمان، تێکرا باو بوو. نانی پان و گەڵاگەڵا، کەباب و لوقمەی بێبەڵا، هەر لە قەڵا دەسدەکەوت.

پاشای ئەودەم پەهلەوی بوو، قەمچی دەستی لاوەیی بوو، سرکوسڵ بۆ ئەو، کەوی بوو، بێخوا و دڵڕەق و دڕ بوو، بۆ جووتیار و هەژار زڕ بوو. خولی نۆزدەی زایینی بوو، شەختەی وەرزی ئایینی بوو. ژاندارم و بەگ و گزیر، لە هەژار و لە وەرزێران لە لاو و پیر و جوانمێران، بە تایبەتی لە کوردستان، ببوونە مێر، ببوونە سووروسات هەستێن، بەبێ لەغاو بەبێ دەمبێن. تەڕ و وشکیان لێكدەهاڵان، دەبوونە ئازاری ماڵان، ئاغا و کوێخا و سووورباش وێڕا، گەڕیان بۆ بێگەڕ دەگێڕا. باو هەر باوی ئاغاوات بوو، ڕۆژی شەپکە و کەڕاوەت بوو، زڕ کوڕی پاشای بەزەڕ بوون، تۆوی تەڵەو داو و شەڕ بوون، بەرهەمی پاڵە و وەرزێران، دەچووە جیبی بە فێڵ فێران. لە ویلا و ئۆپێڕای شاران، لەگەڵ جندە و خراپکاران، دەبووە شاباش بۆ بێحەیا و بۆ بێعاران. دەور، دەوری بێکاری بوو، هاوار لەدەس هەژاری بوو ئەگەر کاروکاسپی هەبا، ئی میری بوو، ئەویش هەموو بێگاری بوو، ئیجباری بوو. زەمان زەمانی

پاپاخ بوو، جلکی کوردی جامانە و شاڵ، ڕانكوچۆخەڵەی مەحاڵی، کڵاشی پەڕۆی خۆماڵی، هەموو لە هەمووی قاچاخ بوو، بێفەڕ و فیت و وەجاخ بوو، بەتایبەتی میللەتی کورد ئەوەن کورت بوو، لەناو کۆمەڵگایان قرت بوو، بێبایەخ بوو، لەچاو هەندەران ئایەخ بوو، زمانی خۆی لێ دوژمن بوو، لەلای عەجەمۆکان گن بوو، ناپەسن بوو، دەموکاوێژ بە فارسی بێ، کاوێژکراو، چۆن و چی بێ، هەر فارسی با، یا ترکی با، ئەودەم بەس بوو، زۆر ماقووڵ و فریاڕەس بوو، کێ بە فارسی بە کاوێژ با، مینگن، یان خۆ دەمدرێژ با، ناویان لێدەنا میرزالە، دەبووە دیلمانج دەبووە گەورەی قالەو بالە.

کوردیبێژ لە خۆی دوژمن بوو، زمانگن بوو، دەبوو تۆزێ فارسی فێر بێ، بەڵکو مێر بێ، فێر نەبا فرە زەلیل بوو، بەردە و دیل بوو، دۆڵ و سەرچەوت و بنژیل بوو، بێبەش لە هەر قیلوبیل بوو. هێندێ لە قۆرخە دەماغان، ئەوانەی دەڵاڵی ئاغان، چوونە ناو جلکی تەنگەبەر، پاپاخە کۆنیان نا لەسەر، بوونە سووورباش، بوونە گزیر، بوونە گورزی دەستی ئەمیر، قوت و قۆچاخ و بەگەڕ بوون، تۆوی شەڕ بوون، قیت و قەنجێکی بێفەڕ بوون، دەتوت لە ماکەوە کەڕ بوون...

تا بێژی ژیانمان پێ لەق بوو، چیمان پێدەکرا، ناهەق بوو، هەقوێژ بازاڕی خەوتبوو، ترسێنرابوو، کڕ کەوتبوو، بۆ زاڵم باش ڕێکەوتبوو، میر و بەگلەر لە خۆیان بوون، هەر خۆیان بوون، دزێو هێزی هێندە زۆر بوو، لە زۆر زۆرتر، ژینی کرێکار و وەرزێڕ، ژین بوو؟ نەخێر، مەرگ لەو ژینە باشتر بوو، چاوی هەژار و دەوڵەمەند، ببونە گۆم، گۆمێکی مەند، لە فرمێسکا ڕاوەستا بوون، ڕوو بە ئاسمان زەق وەستا بوون، ڕوو لە خوا بوون. بەرەو خوا هەر هاوار بوو، تووك و نزا و شین و زار بوو، ناڵەی ڕووتەڵۆك و کزان، بۆ کۆڕی فێڵباز و دزان، بوو بە ئاگر، بوو بە گڕ و چەڕەچەمان، سووتا سمێڵی عەجەمان، تووکی هەژاران بوو بە گڕ، بوو بە شاڵاوی گورچووبڕ، شا و شابانووی هەنگاوت، کۆشکی نەیاری بزاوت، زۆردار، نەیار، داروەستە و بەستەی بێعار، سەرلێشێواو لێیان قەوما، نە ئەم دەرچوو نە ئەویان ما.

بۆگەنی زوڵم ولاساری، هەرا و هوریای خراپکاری، گەیشتە بارەگای باری. باری بەزەی ڕوحمی باراند، داروەستەی پاشای تاراند. تاوهەڵاتی هەژار هەنگووت، خەم تێشکا، شادی بزوت، گەلانی ئێران وەکوو شێران هێرشیان بردە سەر کۆشکان، کۆشکیان شکان، دژیان

بەزان، دارودەستەی دەسدرێژان، گلۆڵەیان کەوتە لێژان، بە لێژانەوە نەوەستان، گیران، کوژان، یا ڕەق وەستان، سەرشۆڕ و گێژ، دەستەوەستان موژدەی ئازادی ڕاگەیی، دێموکراسی، شادی، شایی لەهەر لاوە دەنگی داوە، شەمی شانازی کەوتە گڕ، شکا دەری زیندانی زڕ، خۆخۆر لە خمخۆرکێ کەوتن، بەخت و بار و بەریان خەوتن.

## بۆ ماوەیێ:

بۆ ماوەیێ دەم و قەڵەم ئازاد کرا، کورد و فارس، ترک و عەرەب، وردە کۆمەڵگەی بێمەزەب، بوونە هاودەم بوونە برا. وتیان: ڕەش و سپی، سوور، خورمایی، کورد و ترک، فەلە و جوولەکە و عیسایی، لە قانوونی ئیسلامیدا هەموو بەشن ، هاوباوەشن. ڕاپانگەیاند بە نووسراوان، بۆ کۆمەڵی کیژ و لاو و پیرەپیاوان، قەڵەم و زمان ئازادن، لەمپەر نەما، هەناو شادن، بە کام زمان پێڕۆکە بووی، تووشی شادی ئەوڕۆکە بووی، بەو بنووسە، بێبەرپرسە، هیچ مەترسە.

«کوردیش هەر ئەوندەی بەس بوو»:

بەسبوو بۆ کوردی ڕۆژهەلات، بۆی ئازاد بێ ڕچەی خەبات، زمان بەستراوی چەند ساڵە، لەو حاڵە بێتە ئەو حاڵە، دەبێ شایی گەرمەگەڕ بێ، شادی مەرگی شەڕ و گەڕ بێ، بەو بۆنەوە لە هەر لاوە، کۆڕی بەگوڕ، کۆزی ساوا، قەڵەمیان هاتەوە دەستان، گیانیان خستەوە بەرهەستان، بەستە و مەبەست، تراو و خەست، پەخشانی پڕپڕ لە شاڵاو، چیرۆك، داستانی نەوێژراو، تەنك، ئەستوور، قەڵەو و لاواز، نازا و بێناز، کتێبخانەیان پڕ کردن، ئارەزوویان پێ مڕ کردن، کوردیش لەوان کەمتر نەبوو، بێگوڕ و بێباوتر نەبوو، داماو نەبوو، کوردی لە نووسەری حاڵی، کەوتە نووسینی خۆماڵی، بە زمانی پەتی کوردانە، زانایانە، نووسینگەیان وەباوخستن، شێعری بووکیان، ڕەداوخستن، نوخشەیان ڕۆییە چاپخانان، ناسرا زمانی مەمانان، زانرا کوردیش هەر کورت نییە، لەناو کۆمەڵان قرت نییە، ئەویش خاوەن بیر و هەستە، خۆشوێژە، فرە هەڵبەستە، ئەگەر زمان بەستراو نەبێ، لەناو تەڵە و پێداو نەبێ، لە لاوەیان کزرترن، بیروردترین، خێوی حەماسە خوڵقێنن، سەرەی شەترەنج و نەردێنن،

هونەردارێژ و بوێژن، دڵپاك و زمان بەپێزن، خاوەن زیپك و هەست و هێزن، لە دۆستان بێقێزوبێزن، لەگەڵ دژان بەرامالن، شێری شەڕگەن، کردە و قالن، بەشابالن.

*«ئەو دەم من چۆن بووم»*

... سەردەمێ بەدەستودەم و پەرداخ بووم، خەڵکی تەرت و تەلان و بەرد و کێو و شاخ بووم، هەرەتی لاوەتی، خۆشبەز بووم، خاوەن پلار و داردەس بووم، سوارێکی بەداروبار و سەر بووم، ڕاوچی بەچەکی دەشتودەر بووم، مێملی حەزیەی دووسەر بووم، ناوم لەسەر زار و زمانان دیار بوو، دەورم پڕ لە هەژار و ڕێبوار بوو، ئەودەم خوێندن بە کەمی بوو، ئەگەر هەبا، کەموکورتێ عەجەمی بوو، نالێم بێ مامۆستا و هاوباوەڕ بووم، بێخەبەر لە گەڕ و شەڕ بووم، لە چیا و مێشە و لەسەر یالان، لە چەپەك و لە لاپالان، زانا و لێزان، دەسدەکەوتن، ڕێدەکەوتن، لە تاغووت و ماغووت دەدوان، شێر و خەنجەریان بۆ دەسووان، لایان وابوو تاغووت زەروون، سەرەتانی سینە و گەروون، کرمی ڕەگوڕیشە بڕن، کوڕی گەڕۆ و مشتومڕن، بە خوێنی گەل تێروپڕن، ڕیشەبڕ نەکرێن، خەتەرن، مرۆخۆرن، باسی سەرن.. ئەو دەمیش بە زمانی کوردی، کەموکورتێ نووسراو هەبوون، پەڕاو هەبوون، نامیلکەی بەهەستی ئەو دەم، چ زۆر، چ کەم، لە قوژبن و کوێرەڕێیان، دەرهەم، بەرهەم، دەهاتە دەس، دەخوێندرانە وە بێمەبەس، کەم کەس هەبوو کوردی خوێن بێ، هەژاردوێن و ڕێنوێن بێ، خەمڕەوێن بێ، بۆ ڕێگە چاران هەوێن بێ، من ئەودەمیش بێدەم نەبووم، کوڕی نان و درهەم نەبووم، زاڵم ناخۆش دەویستن، هەژارۆکەم دەپەرستن، ویستبووم وەك لاوی دڵبەخەم، لاسای هونەرمەندان وەکەم، لەبارەی بێبەز و پیوان، ڕووت و ڕەجاڵ و هەتیوان، شێعر بڵێم، بە تاوڵ و هۆبان هەڵبڵێم، تەرە و ئاواران بدوێنم، ڕەنگە ئەو کارەشم جارجار بۆ لەبار درابێ، شێعرۆکە و پەخشان و کورتەنەزیلەی بەکەڵکیشم، بۆ ڕەداو نرابێ، نەخۆشی کۆمەڵ و کوڵوکۆی دڵی خۆم تێیدا نیشان دابێ و لەلای هێندێ مرۆی تامەزرۆ، بە مەزەی هەڵبەست و بەستان، خۆم پێڕاناوە و خوێندوومەتەوە. لە قونجر و کەلێن و کوناندا شاردومنەوە یان بۆ هەمیشە لە بەینم بردوون. هەر ئەو هۆیە بەندیخانەی«قزڵقەلعە» و قەسری«قاجار»یان پێناسیم. بوومە نۆبەرەی دیلخانەی سالی (١٣٤١-١٣٣٨) هەتاوی.

*«ئێستاکە چیم گەرەکە»*

ئێستاکە هەنگاوی کەمانی تەمەن و دەسبەسراوی داوی پیری و هەناوەکوتەی کۆچی مەرگ و میرم، تەمەن لە حەفتا و پێنج بەرەو سەرەوە ئاواش هەر بە هیوای مانێکی تر و قانێکی تر و جێژوانێکی‌ترم. بە هیوام سەرێك بەرمە نێو سەران، چاوێك بە نووسراوەی خۆمدا بخشێنم، شێعرۆکە و بەیت‌وباوی، باودار و بێ‌باو، ئەوەی کە لە بەر دەمودەسمە، یا ئەو مەتەڵ و نەزیلەی کە لە خزمەت دۆست و کەسمە، هەموو لە هەمووی وەکۆیان کەم. بە دەستێکی بێ‌گۆشت و چەرمن و لەرزۆك، لە دەفتەرێك یا چەند دەفتەر وەیان‌نووسم، بەڵکوو «کاوە»ی کوڕم وەك خێرومەندێکی کورد و بابایەکی بیرورد، بتوانێ بە شێوەی شیاو بە ناوەرۆکی نووسراوەکەدا بچێتەوە، بە چاپی بگەیێنێ و پێشکەش بە ئەدەبی کوردی بکا و خوا و خەڵکیش لە خۆی ڕازی کا و دۆعای ڕاوچییەکی پیر و پەڕوپۆ هەڵوەریویش وەرگرێت. ئەگەر کەڵکی خەڵکی هەبوو ئەوە بە ئەرکی کوردانەی خۆمەوە هەستاوم هەزار شوکرانە، و ئەگەر ناوەرۆك بێ‌کاکڵ و بن‌ئاورە بێ، پریشك و ژیلەمۆ هاتە بەرچاو، چاوەڕوانی چاوپۆشین و بەخشینی تێهەڵڕووان و پێ‌ڕوانانم. ڕەنگە هەر ئەوەم بۆ ڕەداو کەوتبێ و هەر ئەوندەشم لە جانتادا بۆ پەزمەندە کرابێ. یان کات‌وساتی ئەو گوتن و هەڵبەستنە، جۆرێك بووبێ کە هەموو بەروبوویێك بە پشوویێك نەتوانرابێ باراشی و مێروو بژێر بکرێ و نووسەر یا هۆنەر، هۆنەری ڕۆشن‌وێژی بۆ نەگونجا بێ و پەردەی لەسەر گەنجینەی مەبەست بۆ لانەدرابێ، هەروەها مشتەی گورچوبڕی خۆی لەناو هەنبانەی بۆردا جۆر کردبێ، دوا هەرا و هاواریش بێژێ خەڵکینە هەرا درۆیە و هاواریش پلان و گەڕە، شەڕ شەڕی هەنبانەیە و نەبەرد و کوڵۆیە، زیرە و هاواریش درۆیە، بە دەهۆیە.

١٣٧٩/٦/٢ دەروێشان

## لە دێوە بۆ دێ (بیرەوەرییەکانی مامۆستا ڕاوچی بە قەڵەمی خۆی)

بە ناوی خوای خاوەنی دەسەڵات

ناوی ئەو هەناوی ناو ناوان و هەتوانی دڵی بە بیری و تین و تەوژمی لەشی سارد و سڕ و بێتینە، کڕنۆش شیاوی ئەوە و هاوار هەر دەبێ لەو بکرێ. کر و کار هەر لەوێوە کر دەدرێ، ویستی ئەو تان و پۆ و پێودانی هەرچی بوونەوەرە و هەوێنی خوار و سەری کۆمەڵ و هەرچی بێگیان و گیان لەبەرە.

بەندەی ئەو لە شا نەترساو و لە خەڵك بێمنەتە، بەندەی بەندەساز خۆیەتی، ڕێگری ڕچەی خاسانە، بو هەمیشە خاسوێژ و چاك دابێژ و چاكپێژە. چڵە و چڵپە و نەوسنی لای نادا و ترس و لەرزی تۆسنی بای نادا و لە گەناوی بۆگەنی بێناوی خۆپارێزە.

شیرین دەژی و شیرین دێژی و شیرین دەمرێ و دەژیێتەوە.

ئەو خوا بوو باڵی گرتین، لەمپەری قڕ و قەپی بۆ شکاندین تاغووتی بو دەرپەڕاندین، پێی پێ گرتین، قەڵەمی وەدەستی داین، چەقەساوی لە هەستی داین، ورد و درشت و خاو و گشت، توانیمان لەمەڕ لاویمان، بەجێ ماویمان، بێبەشی و چارەڕەشی و داماویمان، بەزمانی ڕەوانی دای و باویمان، بنووسین و بڵێین و بێژین، دەردی خۆمان کوڵو دۆمان بە زاراوەی پەتی خومان، هەڵڕێژین هەڵبەست و نووسراوی گەش، مەزرای نووسینمان بێتە کەش، وەك هەندەرانی خاوەنی بەش، بەشمان بدرێ.

......و

*خـــوا ئـــەی ڕێ بەدەســـتی ڕێزمانـــان* *دە باســی مـەش بهـاوێ سـەر زمانـان*

*زمـــانی شـــیعری «ڕاوچـــی» وا بگێـــڕی* *کـە مێـژوو بەرهـەمی بگـرێ لـە زێـڕی*

## نووسەر، خوێنەر:

نووسەر و خوێنەر! هاوڕێ، هاودەم، هاوژینی خۆم، تۆ هەرکەسی من کەسی تۆم، گوێ بگرە لێم، دڵ وەگرە بۆم، من و تۆی چی؟ تۆ هەر منی، منیش هەر تۆم، پێکەوە هەر دوو هاودەردین، سوور و سپی یا ڕەشپێستین، یەك هەڵوێستین.

لە چیت کەمە، بۆ بەخەمی، بۆ بێناوی، مرۆی بەرزی گەنجی لاوی، نوێنەر لەسەر سفرەی زەوی، کێت پێکێیە، خاوەن جێیە، ڕێكوپێکە بیری نوێیە، ئەتۆش هەوی، لە مرۆی هەندەران کەمتر نی، بێشان و باڵ، بێدەمتر نی، میرزای لە نووسراوان حاڵی، نامۆی لە زمانی خۆماڵی، هەموو شێوە خەتی لاوە، دەخوێنییەوە، لەلات باوە، مۆدە هونەرە بەرچاوە، لە هەندەر خۆت چاونووساوی، نەناسراوی، نەبینراوی، بەستەزمان، بێجێماوی، نیوەماو و بێباو و ناوی.

بۆ ئەو هۆیە نەگەڕاوی، بو ناگەڕێی هەتا ماوی، بەڵکوو لە هەڵان بێیەدەر، باش بیر وەکەی بڕۆیەسەر، بچیە ناو ڕیزی ناسیاوان، زمانت بێ، نووسراوەت بێ، وەکوو پیاوان، بچیە سەرێ بۆ نێو سەران، خۆت بناسی بە هەندەران بێژی ئێمەش، بە داوەڵین، جندۆکە نین و هاوەڵین، خاوەن خەت و شوێن و دێڕین، کوردی تەلان خەڵکی لێڕین، بە مەچەکین شۆڕشگێڕین. گومکراوین دەنا زۆرین، بە پێشینە و فۆلکلۆرین، لە زۆربەی گەلان زیاترین، لە زۆر هوزان، هۆزانترین، زار و زمان بەستراوین . ملك و سیپاڵ لێ دزراوین، بڕبڕ کراو، لێك بڕاوین، نیوەماو، کەم هێز و باوین، بەو حاڵەوە هێشتا ماوین:

برای خوێنەری خوێنشیرین، قەڵەمزێڕین، با ورتەمان خۆماڵی بێ، خوێنەر لە نووسەر حاڵی بێ، نووسین زمانی خۆماڵی بێ.

تەڕ و تۆڵ یا وشك و خاڵی، دەوای دەردی من و تۆیە، هەوێنە، ڕایەڵە، پۆیە، تا بێ خەتی، خەتی خۆتی، لابای قرتیلی سەرکۆتی، سەرباری باری کۆمەڵی، بێکەڵك و سوودی، هەژگەڵی، نە پۆی، نە ڕێس، نە ڕایەڵی، دەستندەخۆری، ناجۆری، قەل و داڵ، دڕندەی کێوی، گۆشتت دەخۆن خۆ نابزێوی، خۆت لات وایە لە زانستا تێر و پڕی، زۆربەی ڕۆژان. کتێب کڕی، چاو لە نووسەران دەگێڕی، نەیەك نەدوو هەڵدەبژێری، نووسراوخانە جەمع و جۆرن، پەڕاو و پەڕتووکیان زۆرن، ترکی فارسی ڕۆمی، مەکی، دەیان نووسراوی لاوەکی، کوردیش،

تەك و توو بەرچاون، تۆزاوینە بکڕ ماون، نەفرۆشاون. هەرواماون. تۆی خوێندەوار کتێب کڕی، قەڵەم زێڕی گیرفان بڕی.

کوردی، لە کوردان دڵپڕی، نووسراوی کوردی ناکڕی، بە خەیاڵ لاوی، نووسراوناسی، فەرەنگی خوێن، خۆ نەناسی، بە زمان زۆران دەزانی، لە زمانی خۆت نووسراوی خۆتان نەبانی، تا وابین، هەر دەبێ وابین، کەوت و ڕەوت و بێ داوابین، نەناسراو بێ نان و ئاو بین، چاو لە دەستی، دەستی داو بین. نۆکەری ئاغای بە باو بین. هەر کەساس و کفت و خاو بین، هەر بێ باو بین، هەر بێ باو بین.

برای خوێنەری خوێنمژراو، گەنجی گەنجینە لێدزراو، بێ ڕێزمان، کوێرە ڕێگەت، کڕاڵە، قاقڕە جێگەت، پێگرتوو نی، قەت پێناگەی، بە هیچ نابی بە چی ناگەی. هەر دەبێ بێبەر و بوو بی، نۆکەری بەردەستی جووبی، هەر وەکوونی هەر نەبووبی، بێبەش لەژین لە ئابڕوو بی. تا نەنووسی بە زمانی خۆت، نەخوێنیەوە بۆ من بۆ خۆت، نەژادی خۆت نەناسێنی، برای ترساو نەڕاسێنی، بێسەواد، بێ پاشەرۆکی، بەدەس بێگانەوە کۆکی، لەناو گەلان ناوت نیە، باوت نیە، بەیچەڵ و سووك و چرووکی، بێتام و بۆن، سارد و سووکی، تا هەی بە نۆکەری دەژی، وەك ژیاوی هەروا دەژی. برا برای کوردم، تێهەڵڕوانی ژیر و وردم، کتێبکڕی پەڕاو وەخوێن، خۆنەناسی، غەوارە دوێن، مێژووی ڕەگەزان وەخوێنە، خۆت بناسە خۆت بدوێنە، لە وشەی پڕا، جوانی بەیان، چ کەمتر نی لە لاوەیان، تا نەنووسی بەزمانی خۆت، نەخوێنیەوە بۆمن بۆخۆت بۆیەکیتر، بۆ غەواران، نووسراوت نەچێتە نێو لاوان، ڕێگات نادەن، جێت پێنادەن، لەنێو پیاوان. دەبیە شەل و کوێری باوان، بەجێماوی، لێقەوماوی، چڵمن و شلەپەتە و خاوی، بەرماوخۆری ڕەشی بۆری، بەستەزمان، جێناجۆری، مل بەهەستی پێبەداوی، تەماڵی، نێچیری ڕاوی، هاوڕێ، هاودەرد، هاوبیر و هۆش، سوتمان لەسەر مێژووی نەخۆش ، قوڵهەڵماڵە،لە خوێندنەوان، وەستای چابە بۆ ژینەوان. ببە ڕێبەر، ببە سێبەر، لە سەر نەوان، بەزمانی دای و بابی خۆت، فێریان بکە، با بنووسن، با بێژن بۆت، بەیت و باو و حەیرانی کۆن، باس و نەزیلەی گەزنەفۆن، لە ئەژدەهاك و هەلاکۆ، مێشکی پژاو، خوێنی ڕژاو، تەرمی کۆکۆ، لەهەر هەرا، لە ئاژاوە، لە فێڵ و فووتی ڕۆژاوا،لە برکەی شیر قرچەی مەتاڵ، ڕووداوی ڕۆژ و مانگ و ساڵ، بۆنی بارووت، بۆ هەڵەبجە و ئەنفال بە جووت،

دەنگی تفەنگ، تالآنی شار، مەرگی بیٚدەنگ، چیان خویٚندەوە، وەری بگرن، وەریگیٚڕن، زۆر بەوردی، بەزمانی پاراوی کوردی، وەك زانایان، وەك ڕوحسوکان، بیکە بە ئوردووی پەڕتووکان، با زمانی مەش یەکگرتووبیٚ، لەناو گەلان خاوەن ڕووبیٚ، بەشی مەش، بچیٚتە ناو بەشان، پەنا بن بۆ چارەڕەشان.

برای خویٚنەر، لیٚزانی لاو، لەسەر دڕی خۆتان تۆراو، نووسراوەی کوردیمان زۆرن، لە نووسراو خاناندا ماون، نەفرۆشراون، غەریبن دڵبەخۆ ماون، چاویان نیازیان بە تۆی کوردە، دەسکردی کوردی بۆ کوردە.بەپۆز مەبە، هالۆز مەبە، وەیان قۆزە، سەردڕی خۆتە پیرۆزە، وەیان خویٚنە، لەبەریان کە، تەماشای سەروبەریان کە، لە بەیتۆکەی کورت و دریٚژ، بەستەی بەتام، ڕستەی بیٚچیٚژ، چیت لیٚزانی، بە دڵت سپارد، چیت فڕیٚ دا، یا لیٚت بژارد.

سەنگەری لە نووسەر مەگرە، تەوس و پلاری تیٚمەگرە. مەیژە ئەم بۆرە پیاگە، نە نووسەر بووگە، نە ئاگا، لە داوای خاس نەنەویوە، سەروبەر لیٚی نەزانیوە، وتەی ناپوختە، تیٚکەڵە، لابا و بەربایە، کۆتەڵە، لەڕە، لاوازە، چرچەڵە. برای ئازیز و خویٚنەرم! وتەی سفت و زبر و نەرم، هەرکامیٚکیان، هەرلایەکیان، لای لیٚوەکەی خۆی تیٚوەردەی، هەڵی شیٚلی، تیٚکی وەردەی. بەبای داکەی، چاوی ڕیٚخەی، دەستی خۆماڵیانەی تیٚخەی، لەبەشی خۆت بیٚبەش نابی، وەکوو مە چارەڕەش نابی، وەك بەفیز و لەخۆ زیزان، نابی بە هاوەڵی حیزان، برای کوردی هاوزمانم! شیٚوە شیرین، قەڵەم جوانم. نووسراویلکان، بەکەم مەگرە، جاریٚك ببڕە، سەدجار بگرە، لە نووسراوان وردەوەبە، خاوەن ڕا بە، خۆماڵیانە دابیٚژەر بە، بیٚهەوا بە، بەهیٚزی خۆت بە بڕوا بە، هەڵەی نووسراوان، بناسە، کامی خراوە، کیٚهەی خاسە، لە هەڵبەزەی هەر نووسراویٚ، لە کەم و کورتی ڕووداویٚ. ڕووگرمەبە، شت وەرگرە، تۆش نووسەر بە، ئاوای مەبڕە، ئاوای مەگرە، زانین، لە نەزانان فیٚربە، دەمشڕ مەبە برای خیٚر بە، سەرپەرستی شەل و کویٚر بە، کوردیخویٚن بە کوردی فیٚربە، لە ژیان شیٚر و نیٚر و میٚر بە، تۆ چیت دەویٚ لە نووسەری هاو باوی خۆت، چیت بۆ بیٚژیٚ، دایڕیٚژیٚ بۆت، بەکام بنووس، کیٚهە ڕیٚنووس، بۆت بنووسیٚ، پارووی داوات بۆ بخووسیٚ. لە ئورووپاییت باویٚتەدەر، کلیٚتەی کوٚییٚت دانیٚ لەسەر، چەکمەی کوردانە لە پیٚ کەی، دەردی کۆمەڵ جیٚبەجیٚ کەی بیٚژی منیش گەلم، هۆزم،بە بەستە و بەندی و زاراوەم دەنووك زیٚڕین، پیٚپیرۆزم، شیوەڵە و

پووز و پیٚگرتووم، ساوالکە نیم، خەنیم بزبووم. نامەویٚ چیدی ڕاوکریٚم، ڕەداو خریٚم، ببمە نۆکەر، لەباو خریٚم، بیٚنان و ئاو، بیٚناو کریٚم، دەمەویٚ لەسەر پیٚ ڕاوەستم، نیشانی بدەم، هیٚزم هەستم، شیٚعر و پەخشان و مەبەستم.

برام، چاوت لەکام کەسە، خەو خەو مەبە، هەستە بەسە، بۆ خۆت دڵسۆز و نووسەر بە، بۆ بیٚسەر و قۆڵان، سەر بە، سەرەی کۆمەڵ بە، ڕیٚبەر بە، چارەدەری دەربەدەر بە.

برای خویٚنەر بۆ من بۆ تۆ، بۆ مەی ساوا، تۆزیٚ نووسراو، کەمیٚ داوا، لامان دەبیٚ بە بایی بیٚ، دەورانی جیٚژن و شایی بیٚ. نووسراو چ خاو چ گشتە، هومیٚدە هیوایە پشتە، بۆ ناسینت، هەوەڵ خشتە، ڕۆژیٚك لە ڕۆژان، باڵدەگریٚ، سویٚگە و گەوی یالان دەگریٚ، دەچتە ڕیزی خویٚنشیرنان. شیرین دەکا شیٚوەی ژینان، ئەو دەمی تیٚدەگەن زاڵم، تینی باڕووت و ناپاڵم، زرمەی چەکی هەمەلایەن، دەرۆستی بنووسیٚ نایەن، برای کوردی خویٚنی ژیرم، میراتگری هەست و بیرم، ئەوانەی بەستە داڕیٚژن، شاعیرن یا بەیت بیٚژن، ویٚژەوان یا چیرۆکنووسن، قەڵەمشڕ، یا نووسراولووسن، دەردی خۆیان، کوڵ و دۆیان، بە زاراوەی کوردی خۆیان، لیٚیانگەڕیٚ با بنووسن، نوسراوە، با کلۆریش بیٚ، بەلای تووە ناجۆریش بیٚ، ئاقیبەت، ڕۆژیٚ جۆردەبیٚ، دەوای دەرد و ناسۆر دەبیٚ، فەرهەنگەکەی سەردەردیٚنیٚ، خۆدەنویٚنیٚ، دوایی بە داماوای دیٚنیٚ.

بەزمانی خۆت زمان دەگری، چەشنی گەلان دەژی و دەمری، وەك نەمامی بیٚدار و بار، ئەستوور دەبی، دەبیٚبەدار، لە داربە دەستان ناترسی، پەل و پۆپی وا دەڕەخسی، بەبەرهەم و بە گوڵ دەبی، بەردڵ دەبی، کامڵ دەبی، مرادی گەل حاسڵ دەبی، لە هەندەران بیٚناو نابی، ترساوی چاوی ڕاو نابی، نابیٚتە نیٚچیری ڕاوی، بەرچاو دەبی، لەچاو ناچی، دەبیە ئەوین، لەباو ناچی.

## بە کوردی و کورتی ئەمن کێم؟

ناوم عەبدولکەریمە و بە مەلا کەریمی گوندی ساردەکۆسان ناسراوم و شۆرەتی پێناسەم عەزیزنەژادە. نازناوی کوردایەتیم ڕاوچی‌یە و چیا خۆشەویست و ئاشق بە ڕاوی تەرت و تەلان و هەڵەمووتم.

کوڕی خوالێخۆشبوو، مامۆستای بەتام و بۆن و وتە زێڕین، عارف بەهەست و هەژار خۆشەویست. مەلا حەسەنی « سەییادیم » و خڕەکەی مەڵبەندی گەورکی موکریم.

بۆ درێژەی ژیانی بەژانی ڕابردووم، بڕوانە ڕووپەڕی ڕەنگ‌پەڕیوی ژیانی پڕ لە کوێرەوەریم. ساڵی نیوە ساڵی حازر لە حەفتاوپێنجەوە، تەمەنم بەرەو هەشتا لەڕێ‌دایە، بە قەولی ئەو دوو شێعرۆکەم، «ڕەنگە وریایانە فریا نەکەوم بەروبوخچە وەپێچم، پێچ و کڵاوی نووسەری لەسەر نێم و هەموو نووسراوەکانم هەڵتەکێنم و مێروبژمێر بە تەواوی وەکۆیان کەم و بە خوێنەرانیان بسپێرم:

و...

*لەشـــە بەربابـــووە ڕووخـــاوە کڵـــم*

*شەمی بێ‌پیوی شەوی شین و کولم*

*کۆنە بلـوێری دەسـی کـون لەدڵـم*

*هێشتە بەو حـــاڵە ئەویندای گوڵم*

و ...

بەپێی ئەو شێعرۆکە، کەوت و ڕەوت و لەپێ‌کەوتوو، داتوڵیو، بوومە کەوی کوڵیو، بەڵام کاڵ ویست و جوانی خۆشەویست، هەژارگر و هومێد وەرگر ماوم، بەدەستی لەرزۆك و هەستی چنۆك دەمەوێ بنووسم.

ئەسپی شەل، لە زەل وەدەرخەم، بە هیوای هەوایەکی نوێتر، بەرهەمی قەڵەم و بەروبووی ورتەی ئێر وئەویم، وەکۆکەم عەبای کوردانەم، پەڕۆکەم، پاشی مردن وەك ئاڵەکۆکی دەستی شوانان پێشکەش یکرێ، بە پیران، بە لاوان و ژیران، بە چابێژ و بە خۆش‌خوانان، ئەگەر

کەڵکی لێوەرگیرا نزام گیرابووە، نۆبەرەی بەر و بەرهەمم بەرچاوە. ئەرکی خۆم نیشانداوە، ئەگەر قرتیل و بەربا و بازێلیش بوو، با پێشێل بێ، بێناونیشان و بەرد و کێلبێ.

(ئێستا کە بە نووسینی بەرهەمی چەند ساڵەمەوە سەرگەرمم)

ساڵی هەزار و سێسەد و حەفتا و هەشتی کۆچی هەتاویە (١٣٧٨)، کە ساڵێکی وشکە ساڵ و دزێو و بێخەساڵە، کشت و کاڵ پێنەگرتوو و بێکەڵکە، چیا ڕووتەن کانیلکەکان بێئاو، چۆمیلکە و گۆمە مەندەکان، ورەیان لەدەست داوە و ماسیلکە و باقۆ و هەموو ئاوییەکان کۆمەڵ کۆمەڵ، بەرەو مەرگی چاوەڕوان نەکراون.

مەترسی قات و قڕی و قڕەی بێنان و ئاوی لە ئاوەڕێن، چۆتەدەرێ، بۆخۆشم لەو ساڵە بۆش و بێکڵۆشەدا، لە گوندی دەروێشان سەربەشاری بۆکان بە شێوەی مەلایەتی واتا گەدایەتی نیوە سازاو سازاوم، شارم لێ یاساخە و لە دێدا وەکوو کەوڵەی بێ بەهار و شینکەی بێباران بێهاودەم و پەنا و سێبەر، کز و کۆمیلکە، لە بەرگ و پەر کەوتوو، بەرەو گۆڕی، گۆڕ نەکراوم و پڕ بە دڵ دەڵێم:

*خەڵکی تەلان و تەرت و سوێم* *خونچەی نەدێراوم لە دێم*

*شەرت و مەرجم تێك ناشکێ* *توێتوێ کرێم بۆ دێ دەدوێم*

سەرپۆتێك لە بیرەوەری منداڵیم

منداڵێکی کرچ و کاڵ بووم، پێ لە پێنج یا نە شەش ساڵ بووم. قوت و وریا زیتەڵە بووم، چاوڕەش ڕووخۆش، لەڕکەڵەبووم، شەوانە لەگەڵ منداڵان، ئای چ‌خۆشبوو لەیەك‌دران، لەیەك هالان، قیل و بیلێن و قرت و فرت، هەقری مەقەی درشت و ورد، (حولوور بلوور، فڕی فڕی، قەلەمنداره، هەی قەل فڕی، سەر بە دراوێ، فیلی سێ سەر، گورزی کوێری، بابا هەیدەر، گورگ گورگێن، بەقلانۆکێ، قەرێ قەرێ، لە کوێ بوکێ.)

سەدان گەمەیتری بەناو، هەریەك لەرووداوێ دواو، منداڵی دێ هەموو هەموو کۆك بووین، نازانم بۆ ترسەنۆك بووین، بەشەو، لە وشوو دەترساین، دەعەبەساین، هەڵدەبرووسکاین، لەسێبەری گۆشە و سیلان، لە پشە و نێرەی پشیلان، لە ئاڵە و شەوەی نەبینراو، لە جند و

دێو، لە خێوی ئاو لە مۆتەکە و ملۆزمان، لە شەیتانی بن قوژبنان، لە مامەخڕەی گۆڕبەگۆڕ، ڕەش و مشی، ئایشە گوێشۆڕ، کوڕە لەچی نەترسابووین، لەهەموو شت لە خاو و گشت، تەنانەت سێبەری خۆمان، لێمان دەبۆوە ئاڵەی چۆمان، نەمن هەموومان هەروا بووین، بەو ترسەوە هەڵوەدا بووین.

لەمەش هەراوتر بوو مەبەس، خۆمان درۆمان هەڵدەبەس، یەکمان دەیگوت مامەم گوتی، لەوسەر ئاوە خێوم دیوە وەپای پەتی، زاری خوار بوو دەندووکدار بوو، دەم و ددانی هەزاربوو، گەدە زل، دەمداچەقیو بوو، مناڵێکی ساوای پێبوو، سەرقژنۆکە، کۆرپەی دیبوو، دەمی لە خوێنی ژەنیبوو، قوڕقوڕۆچکەی تێکجنیبوو.

مناڵیتر بە لەرزەوە، بە ترسەوە، بە دەنگی نیوە بەرزەوە، دەیگوت، مامەخڕەی وەك سەگ تۆپیو، گزیری ژێری بۆگەنیو، باوکم دەڵێ لەناو گۆڕا، شەودێتەدەر دەبێ بەسەگ، دەبێتە کەر، دەبێتە مەیموون و عەمتەر، گازان دەگرێ، بەردان داوێ، مناڵان لە ئاوێ داوێ.

بۆ خۆشم باس لە خۆم ناکەم، بۆ چاو و ڕاو لەگەڵ کاکەم، وەکوو شێتی خانەقا بووین، لەگەڵ درۆیان برا بووین، داستانی وام، هەڵدەبەستن، نەترەی مناڵم دەبەستن، ئێمەی مناڵ، خۆشباوەڕ و بێبیر و حاڵ، باسمان هەر ئەو باسانە بوو، جند و دێو، خێوی بێنێو، سەر هەڵقەنە، ڕەش و مشی، گورگە بۆرە، گاڕگاڕەکە، گۆڕهەڵکەنە.

سەدان نێویتری دەسکار، وەکوو حەزیە و دووپشك و مار، شەوانە پرزەی بڕیبووین، سرتەی شادی لێبڕیبووین، لەو ناوانە هێن دەترساین، وەکوو خوودار، هەڵدەبروسکاین، بو میزکردن ڕیزمان دەگرت، میزمان دەکرد، ئێمەی مناڵ، نەزان و کاڵ، لەوانە هیچمان نەدیبوو، نازانم ترسمان لەچی بوو، دەبێ لەکام کەس بپرسین، ئێمە بۆچی ڕۆڵەی ترسین، بەپیریش هەروا بە ترسین.

ئێستە تێدەگەم ئەو ترسە، لە کێوەیە، کێ بەرپرسە، لەکام فرگە ڕاوکراوین، هەنگێوراوین، ترسێنراوین، هەتا دەمرین، هەر ترساوین، وەك نەخۆشان، نیوەماوین، بەترسەوە کۆك کراوین، بەپیریش هەروا مناڵین، شەو ترساوی جند و ئاڵین، لە شلپە و قلپان دەترسین، لە ترسان شەو کۆڕی کورسین.

من پیر و باوەڕم وایە، ئەو ترسە، لە بێشکەڕایە، زۆردڵسۆزی نەزانانە، بۆ داهاتوو دەرد و ژانە، قیلی کەوا سپی و سۆڵە، ششتن لە هەندەری کۆڵە، هەتا دەمری شوێنی دیارە، لەسەر بیر و بڕوا سوارە، دانابەزێ، دەتبەزێنێ، شوورەی شعوورت دەشکێنێ.

منالی خۆم هەر لەبیرە، منالْ بیری تیژ و ژیرە، لە ناو بێشکەدا قەتیس بووم، بەچەند پەڕوی ڕاخەر پیس بووم، لەبەر کێچ و مووریانی زالْ، نە خەو هەبوو، نەحالْ نەبالْ، بیٚزمان وەکوو کەڕ و لالْ، هەر نووزەم بوو کرووزەم بوو، بیٚزمان نەدەکرا بێژم، بە کێچ و ڕشکەوە گێژم. دایە بۆ دوو دەستت بەستووم، گاوت کردووم مەگەر مردووم.

خوا هەڵناگریٚ دەسم وەکە خۆ بخورێنم، لەشی بە خورووم هەڵکرێنم، دایە دایە، بۆ کوشتووتم، بە پەڕۆی بۆ گەن بە ستووتم، دەسم وەکە ئازادم کە، لەوزیندانە، خێرت دەگا، ڕزگارم کە، ئەو دەم دایکم دەی دواندم، بە دڵسۆزی دەیترساندم.

هەی پشە هات، ڕەش و مشی بیٚ خشە هات، گورگە شینە، گورپە بۆرە، خێرا وەرە ئەو نۆبەرەم بۆ خۆت بەرە، ڕۆڵە بنووە، نەك شەوە بیٚ، یانە بۆری بن سەوە بیٚ. ددان گرکا، لێت بمرێنیٚ، لەسەر لانکە هەڵت لووشیٚ، هەڵت بدڕیٚ.

لایە لایە، نیوە شەوە، خپ بخەوە، تا بەیانی، سەر هەڵقەنە پیٚنەزانی، وستەت لیٚبیٚ دێتە گیانت، دەجویٚ گۆشتی بیٚ ئێسقانت، خت خت، فس فس، هەی مامە خڕە، هەی دێو، هەی دز. لاچۆ کوڕی من خەوتووە، لێرە نیە ڕۆیشتووە.

کوڕە لەمەش قڕوفڕتر، ئاژاوەتر، گورچووبڕتر، کۆنە چیرۆکی یارۆیان، تێکەڵاو لەگەلْ درۆیان، منالی کورد درشت و ورد، تا چوار و پێنج و شەش سالی، تا حەوت سالی، لەبن کورسی، لە قوون تەندوور، دایك و باوك یا نەنك و پوور، چیرۆك بەیت و باوی ناکۆك، بۆ منداڵان، دەسپێدەکەن، لەهەزار ئاشی لێدەکەن، بەیتی دێوەزمەی شاخدار، حەزیەی دووسەر ماری باڵدار، خێوی قەبران، بۆرەی نێو دیٚ، چۆلْ و کەپران.

هەزار بەیت و باو بەو شێوە، هەر شێوەیەك ترسی پێوە، بە مێشك و بیریان ئەسپاردین، لە مێشوولانیان ترساندین، ئێستاش لە غیرەت بیٚبەشین، بە پیریش شەو ترسەنۆکین، چارەڕەشین. پیر بووین، نووشتەمان هەر پێوە، ترسمان لە جند و دێوە، هەرکە منالمان

ڕشاوە، دەڵێن دەستی لێوەشاوە، نەحلەتی خوایان لێدراوە، هەنگێوراوە، دەیانبەن بۆ ماڵە شێخان، بۆ بوتخانەی زەرگ و مێخان، بە تووڵە تەڕ لێیان دەدەن، جندۆکانیان، پیَهەڵدەدەن.

نەحلەتییان دەسووتێنن، باجی عەبایان دەستێنن، گیسك و قەلی خۆیان دەخۆن، لێدا دەڕۆن، شێخ دەیەوێ، هەروا گێژ بین، بار خوار نەکەین، ڕاستاوێژ بین، بۆمان لە کتێبان هەڵڕوانن، تا دەتوانن، جند و دێوانمان بۆ قڕکەن، لە خوێنی مەش، جانتا پڕ کەن، کۆشکان خۆش کەن، بنوون، بخۆن، خۆ سەرخۆش کەن، لەوان جوانە هەرچی نۆشکەن.

زۆربەی زۆرمان، سپی و بۆرمان، ئێستاش هەر واین، لە قەڕنی ئەتۆما جوداین، پشتمان لە ڕووگەی زانستە، بیرمان شلە، باوەڕ سستە، بۆ نووشتە نووسان پێخۆرین، لە هەق تۆرین، زۆرناجۆرین، کەسمان لە کەسمان ناپرسین، بە پیری، شەو، بۆ دەترسین، لەڕێ چۆڵ و قەبرەکۆنان، لە کانیلە و کوێرکە چۆمان، لە تارمایی لە ڕەشایی، لە چرپە و خشپەی لابایان، بۆ لادەدەین، خۆ با دەدەین.

## من و نازناوی ڕاوچی

یادی ڕاو بەخێر، لە خێروبێری ڕۆژانی لاوی و شیری خواحافیز.

ڕۆژانی فەقێیەتی، واتە تەمەنی کاڵی، بە خەیاڵ تاك و تەرا، لە ئێستا کاڵتر، شێعرم دەکوت، لە ئاخری شێعرەکاندا وەکوو زۆربەی شاعیرە کۆنەکانی خۆمانە، ڕاوچییەکەم پێوە دەچەسپاند.

لەزۆربەی ناوچەکانی ناسیاو، لە لایەنی پیاوە بە باوەکان و قەڵەمدارە بەداروبارەکانی بارهاتوو، نووسراو و ڕاسپێر و پیَسپێرم بۆ دەهات، لەسەر نازناوی وشەی «راوچی»، سەرکۆنە دەکرام.

دەیانگوت، وشەی ڕاوچی بۆ نازناو نابێ، ناوێکی دزێو و شێرمردە و چووك و چرووکە، لەسەر زمان و نێو نووسراوان سووکە، دوور نیە شێعر و نووسراوەشت لە برەو بخات.

دەبێ فلان ناز ناو و فیسار وشە بۆخۆت هەڵبژێری، لە ڕاو و ڕاوچی خۆ بوێری، درۆی نەبێ، تا ئێستا جوابی ڕاسپێر و نووسراوانم، نەداوەتەوە لە نازناوی وشەی ڕاوچیش، نەتۆراوم.

دەڵێن قازانی مێردان بە چل ساڵ دێتە کەف و کوڵ، وا منیش پاش چل و چەند ساڵێك، دەمەوێ، گۆڕی خۆم ئاورین نەکەم، دۆستانم بێ وەڵام ڕانەگرم. لەمەڕ تایبەتمەندی وشەی ڕاوچی، چەنەیەك لێدەم، دۆستان نەڕەنجێنم بەو هیوایە، لەمەولاوە وشەی ڕاوچی بە نامۆ نەناسرێ. لەمە زیاتر یەخەی نەگرن و بە غەوارەی نەزانن. لێرەڕا ناچار دەبێ بۆ چەن خاڵێك لە خاڵەکانی ڕاو، ڕاوێك دابەشم و شڵدمێك لە خۆ دەم و یەك لە سەدێك، لەبەرهەمەکانی ڕاو، بەرچاو بخەم و یەخەی مەبەستی پێدابەستم، دەمی تانە و تیتاڵی، کاڵە نووسراوانی پێشیرین کەم، وشەی نەشەدارێژی ڕاوچی پێوەگەشێنم.

راو

خوێنەری خوێنشیرین، پێشەکی واباشە، هۆی هەرە سەرەکی ڕوخسەتی ڕاو و شکار بدرکێنم و لەسەر سوودی ڕاو و بازبازێنی ڕاوچی، بە پێی دەرکی پێنەگرتووم، بدوێم و لێرەدا پێویستی زانین ئەوەیە کە بزانین، زانای بنەڕەتناس، خوای مەزن و بەرنامەدارێژی ڕێژەی گیان لەبەران، ڕوخسەتی ڕاوی لەبەرچی دا و ئاژاوەی بۆ هەزاران باڵدار و بێباڵ و گیانلەبەری خاڵدار و پەڕوپۆ زێڕین، بۆ دروستکرد. ئەگەر ڕمڵێك لێدەی، باش پێکیبگری لەسەر ئەو زەوییە سەروبن هەراوە، ڕەنگە بێژی لەهەر شەو و ڕۆژێکا، سەدان گیانلەبەری ژیان خۆشەویست، لەخۆشی دەبڕێ، لە خۆشەویستی خۆی هەڵدەبڕێ، کۆز و کولانی و لانی بە باڕووتی ڕاوچی، بێبەزەیی دەسووتێ.

زارۆکی زەڕنەقووتە و پێنەگرتووی، هەڵوەدا دەکەوێت، هەزاران ئاشقە و ماشقە، لەیەك دەکرێ و یا شەل و شکاو و پێکراو لە پێدەکەوێ، دوایی بە عیشق و ئەوین و هیوای دەرێ، ئاوڕێکی بەخێری لێنادرێتەوە.

**راو بۆ گۆشت نیە**

ئەگەر ڕوخسەتی ڕاو تەنیا لەبەر گۆشتە و چی‌تر، بابای ئاژەڵدار، یان یارۆی گۆشتنەخۆر و خاوەن پارە، دەبوو ڕوخسەتی ڕاوی پێ‌نەدرێ تەنانەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە سزاش لەنەزەر بگیرێت.

**هەندێك لە تایبەتمەندی‌یەکانی ڕوخسەتی ڕاو**

بە کورتی دەبێ بێژم، ڕەوتی ڕاو واتا: بەرداوبەردە، بازبازێنە، پیاسەی تاسەشکێنە،خەم‌لابەرە خۆشی هێنە، سەیرانە گەشتە، دیتنی جوانی سورشتە ، هوجوومە، پاشەکشەیە، چنگەکرە و گاگۆڵکەیە، نەترسان لە خێو و ملۆزمانی چۆڵگەیە، ڕاو وەرزشی چنگ و پەلە، شاخە و شاخ و کەلاوکەلە، ڕاو زانستە، ورد ڕوانینە، تەجرەبەیە، لێزانینە، زاخاوی مێشکی لەرزۆکە، دەوای دڵی ترسەنۆکە، چەقەساوی زیبك و برە، دەمەزەردی تیغی شرە.

گرەو لەگەڵ خەونووچکەیە، شێر لەلای ڕاوچی گچکەیە، ڕاوچی لەشەوان ناترسێ، لە سارد و گەرمی ناپرسێ، با و بۆرانان دەبینێ، چوختی دەبێ، پوختە دەبێ، لەنێو ژینێ، بۆڵەی ورچ و پشمەی بڕەك، شالاوی دڕندەی بەڕەگ. مار و مۆڵ و چرگەن و چۆڵ، تەرت و هەڵدێر، هەڵەموت و لێڕ، نای لەرزێنێ، لە هیچکامیان ناترسێ، بڕوای بەخۆیە ڕادەسێ، چی ڕۆی بێتێ، چی‌دای بێتێ، چی لێی بمرێ، بە گوللەیەك گیانی دەسمێ، مەرگی دەبڕێ.

**راوچی**

ڕاوچی، چیادۆست و دەستەمۆی نەخش و کری سروشتی‌یە، بەبۆن و بەرامی ڕووکەکان خۆڕست نەشە دەبێ و خەمان وەلا دەنێ، گیانی دەحەسێتەوە، لە مۆسیقای بەرز و نەوی مەلانی درشت و وردیلە و شانۆساز، ئیلهام وەردەگرێ، کوێرکە گرێی ژیانی پێ ڕەها دەکا.

لە ساخت و سازی، هەستی ڕادەمێنێ و سوڕ دەمێنێ و بە جوانیەکانی سورشت و بۆن و بەرامی خونچە گوڵی ساوا و بەرمەمکانە نەشە دەبێ و گڕ دەگرێ، فرمێسکی شادی دەی‌بزێوێ، دەبێتە ئاشق، دەبێتە پەروانەی بێ‌پەروا و شەقاوپت، هەڵدەکوتێتە سەر ویرە و

قام و بەندی بە تام و لای وایە شایە، خۆی لەبیر دەچێتەوە. کە ڕاوچی‌یەکی قرپۆکەی کورتەك لەبەرە و یاران ڕووی نادەنێ، دۆیان دەستی ناگرن، گراویلکەش میزی لێنادەن، بەندی بەرۆکانی بۆ ناکەنەوە.

ئەوە خەیاڵە باڵەوباڵی پێ‌دەکا و شانۆی دڵخوای بۆ ڕادەسێ. لە دنیای خەیاڵدا بۆ ماوەیەك لە دوو توێی سۆق و سوێیدا دایدەبەزێنێ، شانۆی ڕۆژان، شەوانی داوای بۆ دەسازێنێ، زۆری پێ‌ناچێ، لەپڕ فڕێك یانە هازەی تیژپەڕێك، یا خشپەی گونگەڵی کوورە کێوی‌یەك، یا ناڵەی بارێك و نیوە پساوی قرپۆقێکی مارگەزتوو ڕاوچی ڕادەپەڕێنێ، و بەهەشتی خەیاڵی پێ بەجێ‌دێڵێ و بە خوڵای کێوپارەی دەسپێرێ، ڕاوچی نەترس و دڵپتەو و ڕوحسووك ماندوو نەناس و هێواشڕوانە، وردبین و سیرەڕاست و هەنگێوەیە، ڕاوچی قوتابی سروشت و دەرسخوێنی چیای بژوێنە . فێرکراوی فێرگەی ئازموون و تەجرەبەیە. کاڕاتەبازی بازبازێن و شالاوی کوت و پڕی دڕندەی بەزەڕە، ڕاوچی زانا بە زمانی هەموو گیانلەبەرانی نامۆیە، ڕاوچی بۆ ڕۆژی مەبادا بە زۆربەی ئەشکەوت و پەنا و پەسێوی هەرێم ئاشنایە.

ڕاوچی، لە گیاناسیدا یەکەتاز و بێ‌هاوتایە، کاتێ کە باب، ئەگەر دەستی بەخوێی خۆماڵی ڕانەگەیی، کەڵك لە گیای خوێدار وەردەگرێت. کەبێ نان و تۆشە مایەوە، لە بنەگیای زۆر بەتام و بۆن و نیشاستەیی خۆ تێر دەکات. ڕاوچی هاتو بریندار کەوت، لە گیای خوێنبەست و گەڵای هێمنی هێن، خۆی لەبەڵای خوێنڕێژی و ژان و شڵەژان ڕزگار دەکات.

گوتمان ڕاوچی، لە زمانی زۆربەی جڕوجانەوەرەکانی مەڵبەند، لە خزۆکەوە بگرە تا فرۆك و تا دڕندە زەبەلاحەکانی بەزەڕ و ترسێنەر تێ‌دەگا، بۆ بەڵگە بێ‌جێ نیە بۆ کورتە ڕووداوێك کە خۆم شایەدی ڕووداوەکە بووم گوێم بۆ بگریت.

## شەوێکی ڕەش و ئەنگوستەچاو (گوندی شێنی)

لە کوێستانە شاخاوییەکانی کوردستانی عێراق بە نێوی «کێلکوگێن» (دۆڵەکۆگێ) لەگەڵ خوالێخۆشبوو ڕاوچی ناودار و هەنگێوە، خاوەن نێو (کوێخا خدر ئەسمەر) لەڕاوە حەیوان بووم، کووروٚکێکی، قەڵەومان ڕاو کردبوو. لە ئەشکەوتێك بە ناوی (بەڕنیری) شەو دابین بووین. دار و سوخت بەبار و گۆشتی کوورە کێوی بەلاش، چای جووت خەزاڵ و جگەرەی سوومێڕیش سەرقەپان، پاش شام و کرِوکاش لە نەقڵ و نەزیلەی بێجێ و جێباش، کەوتینە بیری خەو و شەڕە فڕی ڕاوی بەربەیانی داهاتوومان لە ناکاو چیا دەنگی تێگەڕا و کێوەکانی دەنگیان داوە و شاخەکان تاش و وردە تراشیان لێهەڵدەوەری. بۆنی ئەو دەنگە نامۆ و نەناسراو بوو، بەڵام دیتم کوێخا خدر، ڕەنگی پەڕیوە و کەوتۆتە پەلە و دەیەوێ هەرچی زووترە ئاورۆچکە وەکووژێنێ و ئاو و خۆڵیش وەسەر پۆلووان گێڕێ، بێشۆقیان کات، کوێخا خدر چادان و چا و ئاوی کتری و قومقومانی وەسەر پۆلوان گێڕا و فیشەکی بردە بەر تفەنگ ڕووبەدەرکی ئەشکەوت، وەك ڕاوچی بەمەچەك، هەستی لەخۆبڕی، هەرچی ویستم بۆ پرسیارێك، دەم وەکەم، بە ئێشارەی پڕ لە مەترسی دەیگوت، وست وست، دەخورێن. منیش ناچار هەروەکوو ئەو دەستمدا چەك و بەرەو دەرکی ئەشکەوتەکە ڕاوەستاوم.

زۆری نەخایاند لە دووسەد شەقاوێك لەخوار ئێمەوە، دەنگ هەڵیداوە و شاخ و ترت و تولەش بۆیان هەستاندەوە.

دەنگ دەنگ نەبوو، زەلزەلەیەکی ورەبەر بوو، تاریك . ڕەشەشە و، سامباران سێچوار دەنگی تێکەڵوپێکەڵ، هێرشی کۆمەڵێك دڕندەی بۆمن نەناسراو، لەگەڵ کوێخا شانمان جووتە، سیرەمان بەرەو دەرە هەست بەوە دەکەم کوێخا دەترسێ و لەشی دەلەرزێ. من لە ڕامان و بێهەستیدا خەستە بووم و ویستم بەبارە و بارێك خۆم وەحەسێنم، نەخێر کوێخا نەیهێشت.

پەنا بە خوا دووبارە لە نیرە و نەڕەی ئەو گیانلەبەرانە، شاخەکان دەنگیان دەسەر گەڕا، نەدەنگ بەڵکە هاوار، هەڕەشە، گریان و بەخۆدا دان، دوبارە کێوەکان لەهەرا کەوتن، کوێخا

سەری لەسەر جاسووس هەڵگرت شادە و ئیمانی هێنا، بەزەردەیەکەوە ڕوو بەمن گوتی: مەلای خۆ، خێرن لەسەرە، خوای لەوی بەڵایەی پاراستین. بەسەری سۆق محەممەدی سیکەنەی هەستی کردباین، ئیوان خەلاسی نەدەهات. گوتم: کوێخا بەڕاستی ئەوە چیبوو، کەتۆی پۆلاکرۆژی ئاوا ترساند.

کوێخا: کوڕچەش، بەسەری توو، کالۆکەت چەورن، سێ ڕۆژیتر دەبینە خاوەنی پێنجسەد دیناری شین، تێناگەم کوێخا ڕوونتر بڵێ، کوێخا کۆنەڕاوچی و تەمەنی لە شێست تێپەڕیوە، بەڵام چ جوان و جحێڵ تای نەدەکرد، وتی ئەوە پڵینگ بوون، دوو نێرە پڵینگ لەسەر دێڵەیەك شەڕیانە شەڕی ئاخری یەکیان یەکی خنکاند، کێشە تەواوبوو.

هەر بەیانی کەوڵە پڵینگت بۆ دێنم، لەقەڵادزە دەیدەم بە پێنجسەد دینار دووسەدی تۆ ئەویتریش بۆ کاکی خۆت.

کوێخای کۆنەڕاوچی ئەگەر لە زمانی جانەوەری نامۆ حاڵی نەبا چۆنی دەزانی شەڕە و داوا لەسەر چیە؟ شەو کەمی مابوو، بە تەجرەبەی کوێخا هەر جێیەك، زیرە و نیرەی پڵنگی لێبێ، حەیوانە کێوی، لێ نامێنێ، ڕەو دەکەن، بۆ دۆڵێکیتر و چۆڵگەیەکیتر، دەڕۆن لەسەر ئەو باوەڕە، بەربەیانی ئەو شەوە، بۆ بازگەنە ڕۆیشتین، تا هەتاو کێوەکانی زێڕین کرد، لەو ئەشکەوتەدا ماینەوە، دوا تاو هەڵات، زۆر ساز و باز بەرەو ئاخرین شەڕگەی پڵینگەکان، ڕۆیشتین، بەڵێ شادە و ئیمانی کوێخا بە هەق بوو، ئەوی شەو گوتی، ڕاست و دروست بوو. لاشەی گۆڵە پڵینگێك لەوێ کەوتبوو، بڕێك قەل و داڵی لەسەر میوان بوون، کەوڵی لە حاجەت کەوتبوو، وەها دڕدڕ و جنجن کرابوو، دیناریکیشی نەدەکرد.

یادی لاوی و ڕاوی کێل کۆڵین، وریایی کوێخا خدر ئەسمەر بەخێر.

بۆ هەموو ڕاوچییەکی بە دەست و چەك سڵاو.

## کورته نەقڵێکی خۆمانه بۆ پێکەنین

لـه سـەفەرێکمدا لـه شـاره جوانەکـەی سنه. دۆستێکی بیـست سـاڵ لـه من گـوم، بۆ شـام خواردن له ماڵی خۆیدا قەولی لیٚوەرگرتم.

هـەر عەسـر بـوو، سـواری پـەیكانی کـردم و تازەسـاز و دیمەنگایـەکانی شـاری سـنەی نیشاندام و لەزۆر جێگاش بـۆ وردەکاویـژ و پێداکردن، هەڵوێستەیەکمان دەکرد، لـه هێنـدێك شـوێنیش، لـه پەنجـەرەی پەیکانـەوە، ئاغایانـه دەسـتووری ئـەدا و ئـەیگوت بێـژه وەلالـۆم، وەخاڵۆم، وه باجەی خوشکم وه ڕەحه خانی میمکم بۆ شام بێن بۆ ماڵ ئێمه، براییٚکی فرەزانا و شاعیر و قسەخۆشی. مەهابادیم وەگیر هاوردووه، با ئەوانیش له وفرسەته کەڵك وەرگرن.

نوێژی شێوانمان له مزگەوتی ناوشار کرد وەختی نزیك به شام له درگـای خۆیـان، به فیقەی ماشێن درگا کراوه. بۆ پەزیرایی لـه شاعیری نەناسراوی مـەهابادی، به قـەولی خـاوەن ماڵ شەقو کوت له پلیکانەوه ژن و پیاوێکی زۆر بەرەو ڕوومان هاتن.

وایان له ڕێز و حورمەت گرتم، دەتکوت له قوڕگیراوم، گـریٚم لیٚبڕابوو، پـشت پـازده پلیکـان له ساڵۆنێکی هەراو و ڕازاوه به پشتی و نێوەمێز و وردەگوڵی دەسکار پاڵمان لێداوه.

جا وەره میوانـان، قـەلبـڕژیر کـه، بیـست و هەشـت، بـه خۆمـەوه بیـست و نـۆ زەلامـی تـازه هاتوو، زۆربەیان مێیینه بوون، موعەللیم و دەبیر و خۆشوێژ. یەك له یەك بەردڵتر و وردبینتـر بوون. گەپ و گاڵتەی زوبان، و شەڕەشێعر و فڕهاویشتن، شـامی لـەبیر بردینـەوه، بـەلاٚم ئـەوی بەڕێوه بیٚ هەر دەگاتیٚ، شام هات چ شام! وەك له شام بۆ شایان ساز کرابـیٚ، شام خـورا، نێـر و میٚ شان به شان پێکەوه، لەسەر سفرەیەك یـەکمان گـرت و لـه نێـو هەمووانـدا من پیر بووم، ببوومـه (گـای نێـو گوێلکـان) چـاو و دەم زیـاتر ڕوو بـەمن هەڵـدەبڕان، منـیش زمـانێکم هـەبوو یـەکیتریـشم قـەرز کـرد، بـه نـەقڵ و نەزیلەیـەك ڕازیـم دەکـردن. گاڵتـه و گـەپ و قـسەی تـەڕ و میوەی میخۆش، هـەر خۆشـی لێدەباریٚ بـەلاٚم بـیٚ بـەختی لـه سـەفەریش، بـەرۆکی قـەت بـەر نەداوم.

دەمزانـی ئەوشـۆش تـا سـەر نایـەڵیٚ بـه گەشـەوه سـەروەنێم، ئـای بـیٚبـەختی، لەکاڵـەدۆڕ، زیڕەیـەك بـەگویٚ گەیـشت، هاڵەکـه لـەرزاوه، گـوتی هـەی هـاوار، (دوومـاره کوڵـه)، بـەو هـاواره دەورم چۆڵکرا، هەی لەوەی زووتر هەڵیٚ و گیان دەربـەریٚ، زۆریـان بـیٚکـەوش و سـۆڵ خۆیـان

دەرباز کرد، مامەوە منی تەنها، بۆ هەوەڵین جارە، ناوی دوومارە کۆڵە دەبیستم، لام وابوو نەوعێکە لە مار، منیش چوومە کاڵەدۆڕ، کاڵەدۆڕ، لە توێکڵ و و سەرقونکی میوەی نیوە خوراو داوەستابوو. زۆرم ڕوانی لە ماری کۆڵ و ساخ چیم بەرچاو نەهات، هاوارم کرد، برا بۆ ڕەوتان کرد، بێن بزانم ڕووداو چیە. یەك لە میوانەکان هات و دەلەرزی و قامکی ڕاداشتە دیوارەکە، ها ها ها وە قەو دیوارەکەوە ئەجووڵێ. دیتم بێچووە دووپشکێکی زەردی لاواز و بێهێز، بەحاڵ ئەتوانێ وەجووڵێ، دەیەوێ ئەو هاڵە جوانە بە جوانان چۆڵ کات. منیش دەستم کێشا و ژیانم بە دوومارە کۆڵە چۆڵ کرد.

میوان زۆریان نەیانوێرا وەگەڕێن، ئەوەی گەڕاشەوە ناوی قارەمان و غیرەتیان بەسەردا بڕیم، لە سایەی دوومارە کۆڵەوە چەن شەو و ڕۆژ، هەر جەمەی لە ماڵی میمکەیەك و لالۆیەك، شاغان و داغان لێمان ڕادەکێشا، بوومە میوانی چەن شەو و ڕۆژ.

## خوێنەری خۆشەویست

ئەگەر بەوردی لەو دوو کورتە نەزیلەیە وردەوەبی. بەروونی تێدەگەی کە خوای مەزن، بە خاتری چسوودێکی مرۆیانە. ڕوخسەتی ڕاو و ڕەداوخستنی نێچیر و جانەوەری بەزەڕی داوە، ڕاو و شکار، جگە لە بەرهەمی گۆشت و داهاتی دیکەی ژیان بۆ ئەستووربوونی مەچەك و وەرگرتنی هەوای خاوێن و چێژتن و مژتنی تام و چێژی ڕۆڵەکانی بەتام و چێژ و بۆنخۆشە. ڕاهاتن بە سارد و گەرمی ڕۆژانی ژیانە. بێترسی لە خشە و مشەی شەوانی ڕەش و قیژە و نیڕەی جانەوەری بەزەڕ و هەڕەشەی تۆف و بەند و کرێوە و کوێستانە. زاڵ بوون بەسەر شەوگاری ڕەش و هوولەی کوندەبووی ناوەخت و بێباکی لە چەق و لووریتری نێو تەرت و تەلان و هەڵەمووتانە.

**با کەمۆکێکیش لەخۆم بدوێم**

پاش چلو چەند ساڵ ڕاوی ڕەوا و ڕەداو خستنی نەچیر و چیرە و قیرە لەگەڵ ورچ و بەرازی فیتەر و ڕەوە بڕڕەکی دزێو و زەندەق تۆقین، پاش چل ساڵ شاخە و شاخ و هەوارە و هەوار و ئاشنابوون، بەزار و زاراوەی زۆربەی عەشیرەت و هۆزەکانی ڕەشماڵ نشین و مەڕدار و پاش چەشتنی تاڵی دیلی کۆت و دەسبەند و ئازاری، قەمچی پیاوخۆرەکانی دەزگای حەمەڕەزاشای ئەمریکایی و پاش ماوەیەك قاچاخی و ئاشنابوون بە پیاوە شۆڕشگێڕەکانی ئازا و ڕاساو و تێکەڵی لەگەڵ نووسەری بە سەرەدەر و زانا. ئێستا وەستاو و لە فڕ کەوتوو، پیر و لەرز، بێ‌چەك و چەکە داس، هەی داس هەی داسی مەرگ، وەك داسی لێ‌کردووم و لە نزمایانی خزاندووم و پشمە و ڕاخزینی لێ‌بڕیوم.

بەڵام ماڵی خەیاڵ و هەستی تامەزرۆ ئاوەدان، دەسرمەی[1] ئەسپی دووپەل سپی شێعری بزۆز خۆش بێ، زۆربەی شەوان، هەڵمدەگرێ و گرێ‌کوێرەی تامەزرۆییم دەکاتەوە دەمباتەوە، خەت و شوێنی سەردەمی لاویم.

باوخۆش و بەگوڕ و شیوڵە لە دۆڵ و شیوان دەمکاتە میوانی ئەو شوێنانەی کە ئێستاکە لەمن بێ‌سەروبەر و شوێن ماون، عەرەب گوتەنی: (وصف العیش، نصف العیش).

بۆ ئەوەی خۆشی‌یەکانی ئەو سەردەمەم،لەبیر نەچێ و لە گولان نەبڕێم، ڕاوچیم کردە نازناو و لەسەر نووسراوەی خۆم کردە بەیداغ و زیارەتگای گاوبێ‌گای خۆم، تەنانەت کە وشەی ڕاوچیم لە هەر شوێن و لەهەر پەڕا و پەرتووکان هاتەگوێ و یان وەبەرچاو کەوت، نەشە دەبم و زۆربەی وردە شانۆکانی ئەو سەردەمەم بۆ دەژێینەوە. نازناوی ڕاوچی پڕ بە ڕاستاوی ژیانی ڕاستەقینەمن، ساخت و سازێکی درۆی تێدا نەکراوە.

زۆربەی نازناوی نووسەر و هونەرەکان، دروومانی دەرزی درۆ و هەڵخراوی خەریتەی خەیاڵی خۆیەتی.

---

[1] وە (سرمەی)ش هاتووە.

بۆ وێنە، سووتاو، حەریق، غەریق، شەیدا، بێدڵ، و... هتد ڕەنگە، نە بەئاگر داپلۆخابن، و نە لە چۆمیان دابێ، نە دڵناسیش بن، بەڵام نازناوی من، ڕیشەی لە ڕیشەی زیبك و زەبر و هەست و دەرکی بنەڕەتیمەوە هاتووە، هەوێنی گیرسانی گڕوی خوێنی مرۆییمە.

وەك لەو شیعرەدا وتوومە:

پیرە ڕاوچیم و چیایە چیمەنی هەڵدانەوەم

باوبۆران بای نەداوم دوژمنی بادانەوەم

تا بمێنێ ملچە ملچی تلتەخۆری خۆنەناس

هەردەبێ تەرت و چیابێ جێخەو و جێسانەوەم

عیشقی ئازادی وەتەن بۆتە هەوێنی بیروڕام

بۆ کەمێ ژین ناڕەوایە زیللەت و پاڕانەوەم

هەڵدێراوی تەرت و تووشی سەربەخۆییم خۆشترە

نەك وەکوو گۆ بم بەشەق بێهەڵخول و سووڕانەوەم

بۆ تەلان و زەرد و بەردی خاکی کوردم دێتەوە

سێبەری هەور و هەتاوی سەردەمی بووژانەوەم

١٣٤١ـ کوردستانی باشوور

## کورتە ڕووداوێك لەژیانی ڕاوچی

ئەگەر من تێر و تەسەل، بە بێهەڵە و پەڵە و تلاسان بێژم کە من کێم، لەکوێم، چیم پێکرا و کوێم پێکرا، کام سولەیمان ئاشی بەبای پێ وەگەڕ خستم، کێهە قەیسەر کونە مشکی لێکردم بە قەیسەری،ڕەنگە بێژی، نووسەر دۆمە و کلاشی خۆی، لە جاوی جوو دروس دەکا و تیرەی لە چەرمی گامێشان دەکێشی، هەر بە قەڵەم، خۆی، خۆی لە قووڵایی، کێشە کێشان، کێشاوە. ڕەنگە جوانیش نەبێ، شەقاوپت بگوترێ، کە کامە کەرکیتی کوردانە دان و پۆی کڕ دام. کەرەی پێکردم، بەزەنگ و زەنگی هەلات هەلات و تەق وڕەوێ، پێ وەدەنگ هێنام و قەشکەی بەغدای بەنیوە ڕێ کردم.

ئەگەر بنووسم. کام قەمچی دووسەر، سەری بە سیرمە هەڵێنام و چەق و لووری چەقەڵ و گورگی هەندەران چۆنیان لێ‌مراندووم و ئەسپێ و ڕشکی بەندی خانان، ڕەقە پەراسوویان چلۆن خان‌خان و ڕێ‌ڕێ کردووم.

یانە کوردکوژەکان، چەن جاریان بێروبەوێدا تەرە کردووم و چەن ئەشکەوتە تەڕ و چرۆ چۆڵەیان، پێ‌کردوومە خانی خات ڕابیە ڕەحمەتی.

نووسراو دەبێتە چەن باتمان قاقەز و داستان دەبێتە شانامەی. ڕۆستەمی مازەندەرانی نەبەز.

وا باشە کورت و کرمانجی بێژم ناوم عەبدولکەریمە، شۆرەتم عەزیزنەژاد، نازناوی کوردانەم ڕاوچیە و کوڕی خوا لێ‌خۆشبوو مامۆستا مەلا حەسەنی سەیادیم لە بنەماڵەی عەزیزی خاڵندم و پەچەند زەو و زوویەك، دەچنەوە بنەماڵەی خالیدی کوڕی وەلی. لەدایکبووی هەزاروسێسەد و پێنجی (١٣٠٥) کۆچی هەتاویم. لە باوەشی گوندێك بە ناوی سلامەت، گەورکی موکری، سەربەشاری بۆکان لەدایك‌بووم، هەرلەوێ خرەکەبووم و لەدارە دارە ڕەت کراوم، خراومە بەر خوێندن، شکایەت نەبێ لەڕووتان، تەتەڵەی ئەلف و بێتکان، هەموو تەتەڵەی گاڵتە و گەپی خۆشی نێو منالانی، لەدەس وەرگرتم، لە هەموو هەقری‌مەقۆی منالانەی بێ‌بەش کردم.

کێچ و مۆریانی مزگەوتە چۆلانی کردە ئاشنا و شنەی لە هەناوانی بڕیم بە تایبەتی، زەنازەنای سەر و بۆر و زەنان، چاو سپیلکەی میم و جیمان، تووڵە تەڕ و گوێ‌کێشانی نامام وەستایان، شەوانەش لە خەوی شیریندا لە ترسی تووڵەتەڕی بن بەڕە و حەسیران، وەك جنداران ڕادەپەڕیم و لە گڕوگاڵی زۆربەی خەت و دێران سامم شکا و لە لامی گەورە و تێی بێ‌دەست و دەس‌دار، دەستم نەدەلەرزی.

کورتی وەبڕین، بۆ ماوەیەکی کورت و کەم، لەمریشکە ڕەشە و کولێرە بەرگەدە و دەمی گورگ و ورچان ڕەت‌بووم، قورحانم تەواو کرد و بەربەسێڵی پیرۆزباییم بەزۆربەی مالانەوە گەڕا و پیروزباییم، ڕاگەیەنرا، ئەمجا خوێندن بوو بە وردە کتێبی وەکوو ناگەهان، جورم بەخش، ئەی‌شووده، سمایل‌نامە و وەفاتنامە و چەن پەڕتووك و پەڕاوەی‌تری منالانەش،

ئەودەم وەکوو ئێستاکە دەمقووچاو بێسەر و مێشك نەبووم. چیم دەخوێند بەپێ نەقە و چڵمهەستڕین، دەهاتە بەرم، هەر لەبەر دەورم دەکردەوە.

### مووشێعرێن واتا شەڕەشێعر

شەڕەشێعر، لەهەموو خوێنگە و فێرگەیەك و لەزۆربەی کۆبوونەی وردە خوێندەوارانـدا، بازاڕی گەرم و گوڕ بوو، هەر ئەو بازاڕەش بوو، کە بوومە ئۆگری شێعر و شێعر لەیاد گرتن بوومە چەکداری شەڕەشێعری ئەو سەردەم و زیاتر لە دووهەزار شێعرم لەبەر بوو، چما کامەکەسهەبوو لەو شەڕەدا لە حاستم ڕابێ و نەپێکرێ و لەپێ نەکەوێ.

یادی ئەو سەردەمە بەخێر، کە چەند خەپەتۆڵە و گەش و خۆش و خۆشهەڵبەزیو و نەبەزیو بووم، ئەوبەر ئەوبەری گەڕەکان بانگ دەکرام، میرزالە میرزالە گیان، دەمی گورگ و ورچانمان بۆ ببستە قەزات گرم. ئای چەن خۆشبوو، لام وابوو تەواو زۆرزانم کەس نەماوە نەی بەزێنم.

تازە بەسمە هیچیتریش ناخوێنم، بەڵام زۆری نەخایاند، تێگەیشتم کە هێشتا کاڵ و ساویلکە و پێنەگەیشتووم، هێشتا کوولەکە ڕۆنی فەقێیان دەوری پێنەگرتووم، خۆی پێهەڵنەگرتووم، بەبارە بەری نەناسیوم، سمێڵی چەوری پێنەهەستڕیوم.

### کوولەکە ڕۆنی فەقێیان

کوولەکەی سواڵی ڕۆنی، نە کوولەکە ڕۆنی سەر تەندوور و نێو تەندووران لێت تێکنەچێ و لات وانەبێ لە دەورانی فەقێیەتیدا. خواردن هەر کوولەکە و ڕۆنە و سمێڵبادان، بەڵکە ساڵی چەنجار بارە بەری و کوولەکە هەڵگرتن و ماڵە و ماڵ و هەوارە و هەوارە خوێنەری خۆشەویست! پاش تەواوبوونی، وردەکتێب و خوێندنی گوڵستان و بووستانی شێخی نەمر سەعدی شیرازی خوالێڕازی وشکە قۆناغێکیتریان بۆ ڕەچاوکردم.

قۆناغێکیتری بۆ تەرخان کردم و کرێکی بەکرتری، بۆ لەدار بەستم، خوێندنیان لێکردم بە عارەبی، دەپاڵ کێشەکێشی زەید و عەمرانیان پەستاوتم، تووشی تاریکەشەوی زەرق

مەجازی موستەقەڕ کرام و لە ترۆپکی یاسای بابی (تفعل و تفاعل) هەڵیانداشتم. بە (مبتدای مقدری مؤخر) خەڕەکی هەودایان تێکشکاندم و بە سەرە و بەرەی کەلیمەی نەخۆش و نێو بەتاڵ و سەر و قونچك پەڕیو، واتا ﴿اجوف و ناقص و لفیف﴾ چەند شتیتری بۆمن نەبیسراو هەستیان لەپێ خستم و هاتمەوە دەوری هەوەڵ. بوومەوە قوتابی جاران و سەروبەر ترسم ڕێنیشتەوە.

نایشێرمەوە، سەرلێشێواوی ئەو ترسە دەوری بۆ هەڵگرتم و ماڵی پێبەجێهێشتم، بەرەو حوجرەی هەندەران ڕایپەڕاندم، بۆ هەوەڵین جار لە گوندی شوێ شارەدێی مەڵبەندی شارۆکەی بانە، باروبنەم لێخست.

بوومە سووختەی فەقێیەکی لەخۆم گێژۆکەتر، سووختەی ئەودەم یانی قەرەواش، ژێرفەرمان، کارەکەر، بارکێش و بارەبەر. هەوەڵین دیدار هەمووشت بۆمن سەرنجڕاکێش و نەدیوبدی بوو، ڕاتووە، نان چنینەوە کولێرەی هەرزن، یاسای حوجرە، فیز و پۆزی موستەعید، دەرس و دەور، قوڕ و قەپی شەوانە، حوجرەش ڕەش و ڕووت، بێهاڵ و کەوشکەن، بێحەمام و دەسشۆری، بێمیز و کمۆد و کابینێت، بێ زمهەڕ و زەخیرە و هیزە و دیزە. ئەوی بەرچاو دەهات، کوولەکە ئاوییەك بوو. شەش مانگ بوو ئاوی نەدیبوو، زگ زل و مل باریك، چڵکن و ڕەش و ناوبۆگەن.

ڕۆژێك لە مامۆستام پرسی، گوتم: قوربان ئەم کوولەکە ڕەشە کەڵکی چیە و تەمەنی چەندە، نژادی کێهە هەرێمە و لە بنەماڵەی کامە شیناوەردە و کام هەرای قاتوقڕی مەڵبەندی وەبیردێ ئەویش بە بزەیەك و هەناسەیەك گوتی: فەقێ پرسیاری ناوێ، زۆر کەمی ماوە کە خۆی بە تۆ بناسێنێ.

بەهار شین بوو، سەرما و سۆڵە شینی وەسەر گەڕا، کەو هاتەوە و ڕاوچی مرادیان حاسڵکرا و چادر و چیغی مەڕداران بەرەو هەوارگەی سالان کەوتەڕێ، زەوی نوێیی وەبەرهات.

مامۆستاکانی حوجرە هەموو بەرگی نوێیان پۆشی، کوولەکە ڕەشە لەدار کراوە و دوو شەو و ڕۆژ، لە تیژاو و لۆرکاویان گرت، بە خۆڵی داربەڕوو ڕەنگ و روویان پێشۆشت.

لەسەربانی حوجرە بۆ هەوا خۆری حەوتەیەك ئازاد کرا. پاش ئەو چەند ڕۆژە دەیانویست بۆ ڕۆن چنینەوە و سوالّی مالّە و مالّ و دەوارە و دەوار، بەرەو کوێستان وەڕێ کەون. بارەبەری ئەو کوولەکەش دەبێ منی سووختەی هەژار بم.

مامۆستاکەم موژدەی بارەبەری ئەو کوولەکە وشترەبارەی پێدام. ڕەنگزەرد و ئەژنۆ شکاو مشکم لێکەوتە ناو دۆشاو، سامۆتەی نەترەم پسا و بەزمانی پس‌پس توانیم بڵێم ناتوانم. مامۆستا زۆر وەستایانە لەگەڵم دوا، نەیەویست زۆر بە تۆسنی ڕووبەڕووم بێت. نەکا بارەبەرێکی ساویلکەی لەدەست دەرچێ و بەرهەمی بەهاری تازە لەخێران هاتووی لە کیس بچێت. پووڵی کەوا و سەڵتەی گازڕوونی شینی بۆ پەیدا نەبێت.

زۆر مامۆستایانە گوتی: فەقێ گیان ئەو خوێندنە خەزێنەی هەردوو دنیایە پڕ لە ماندوو بوون و جەفایە، دەستی ماندوو لەسەر زگی‌تێرە، ئیتاعە لە مامۆستا واجبە، تۆفیقە سەرکەوتنە، دەتەوێ بو کام حوجرە بڕۆی، لە هەموو حوجرەیەك کوولەکە بنەی ماڵێیە.

بە ناشوکری ناڵێم، ئەوەش بەشی ئێمەی فەقێیە، دەبێ مانگێك ماڵەوماڵ بڕۆینە سواڵ، تا شتێك پەیدا کەین و جلوبەرگی ساڵی پێبکڕین. لە کوردستانی ئێمەدا ڕۆن و خوری و تووتن زۆرە بێبەشمان ناکەن. ئێستا وەختی ڕۆنە و هاوین تووتن و پاییزیش دانەوێڵە، چارمان نیە ئەو سێ وەختە بۆ ئێمە خرمانی ژیانە، دەبێ لەدەستی نەدەین، فریانەکەوین، دوادەکەوین.

بۆ فێربوونی زانست و ڕێگابڕین بۆ خوا، شەمۆتە و دوودڵی ناوێ، زۆری نەماوە تۆش دەبی بە موستەعید، کوولەکە هەڵگر دەبێتە بابایەکی‌تر، ئێمەش کاتی خۆی چێژی ئەو کۆڵەبارەمان چەژتووە سەرەڕای ئەوەش گەڕانێکە خۆناسینێکە بەو جەماوەرەی لەداهاتوودا کەڵکی ژیانیان لێوەردەگرین.

مامۆستا چی فەرموو قەبووڵم کرد، ناچار کوولەکەم لە خۆ شەتەکدا و بەرەو کوێستان وەڕێ کەوتین.

کوێستانی جوان، مەیدان چۆغە و مەڵبەندی لاسەشۆڕ و خەزاڵی مەلا نەبیان، گاگەش و گاگەشی بابهۆمەریان و شاڵەبەگی فەقێ وەیسیان و زۆرشوێن و چیای بە شوێنەوارتریش گەڕاین، ماڵئاوا، ڕاتووەی فەقێیان بە کەوچك ڕۆنیان، لەکوولەکە دەکرد، تا کوولەکە پڕ

دەبوو، دەمان فرۆشت. شان و کۆڵم لەڕۆندا خووسابوون بە تەپوتۆز و گێژەڵووکەی خاك و خۆڵ، ببوومە خوول، ببوومە سەرانگوێلکی مێشەڕەشان.

لەو شانەم دەردەکردن لەوشانیترم دەبوونە میوان. دوور لەئێوەی خوێنەر سێ ساڵی ڕەبەق بۆ ئەو کوولەکە، ساڵی دووجار بارەبەربووم ساڵی چوارەم بوومە جامیخوێن و شاقەلم لێبەردانەوە و بوومە موستەعید و لە بارەبەری کوولەکە ڕەش و قەرەواشی سیووتیخوێنان خەلاسیم هات و شیرینی موستەعیدیم خورایەوە.

با لێتان نەشێرمەوە، کە پۆزی کەوای درێژ و موستەعیدی بۆ من باشی نەهاورد، خوتخوتەی دەمار بەرەو ولاتی عێراق چیوەختەیدام و شارۆکەی هەڵەبجەی کردە هەوەڵ خانەخوێم و زۆربەی حوجرەکانی شارەزووری پێناساندم. لەو شوێنە نووسراوەی کوردی بێشوێن نەبوو. هەرچەند باشم بۆ نەدەخوێنرانەوە بەلام چونکە کوردی بوون خۆشم لێیان دەهات، هەرجۆر بوو وەدەستم خستن، لام وابوو خۆشیم تازە خەریکە ببێتە گوڵ و منیش ببمە گوڵ چنی باخچەی نووسراوەی کوردانە و کوردانە منیش دەستی خۆم بوەشێنم، بەزمانی زگماکی لاسای ئەدیبان وەکەم و شێعران بدرکێنم.

بەلام بەلای ڕۆژ، ڕۆژی لێکردمە شەو، هەواڵی نەخۆشی باوك و بێکەسی بنەماڵەییم بۆهات و نەهاتی سەری وەسەرخستم. ناچار بەرەو ئێران گەڕامەوە لەهەموو ئاوات و هیوایەك هەڵبڕام. ئەودەم نە دوکتور بوو نە دەرمان و نەپووڵ و دراو. چارەی هەموو نەخۆشان چاکوپیر و نەزەرگە وماڵەشێخ و نووشتە و دوعابوون، پاش زەحمەت و کۆششی ساڵێك، باوك فەوتی کرد. چارەڕەشیم لەوێوە دەسپێکرا. مەرگی مامۆستایەکی گەورە و مەزن. کۆچی بابایەکی عالم و عیرفانی، لە هەرێمدا، دەنگیداوە و کۆشکی مەشایخ و بارەگای ئاغایانی ناوداری لەرزاند.

لە شارۆکە و زۆربەی گوند و کوێرکە دێیان تێپەڕی. هەڕەمەی، پرسە و سەرەخۆشی. لافاوی بەربلاوی شینگێڕ و فاتیحاخوێنان. خوێنیان مژتم. هەنبانە و کیسە و چاڵ و کەندوو کەنەوەیان لێکراوکری ژیان و پێژیان لەپێ کەوت، وەبن هەرەسی قەرز و قۆلان کەوتم پەکم کەوت. خوێندن خەوت و کۆڵێك سەغیر و بێسەردارم بەرپیشەوە بوو، ڕێگەی پەرەپێدانی زانستم لێگیرا.

شین و گریانی خوشك و وردەبرا، بێسەرەدەری کردم، ناچار نیوە مەلا و نیوە فەلا، لە گوندی ساردەکۆسانی هەرێمی گەورکی موکری سەربە شاری بۆکان، بوومە سەرپەرستی خاوخێزانی هەژار. ئەودەم هەموو کەس بەهەژاری دەژیا، ژیان کراسێ بوو بە بەژنی ماڵە شێخ و بێچووە بەگ و بەگزادان بڕابوو.

لەبەر چەرمەسەرە و بێگاری ئاغاوەتان، کەس ماوەی کاری خۆی نەبوو. کار هەر نەبوو، هەموو کەس دەبوو ئیش و کاری مالیکان ڕەنێوبێنێ، لەسەر سەپانی و گوخڵەوانی، میراوی، گزیری، شوانی، قەلەوانی، سەگەوانی، نۆکەری، سەرکاری، باخەوانی، تووتنەوانی ئاغا. هەر پاڵەپەستە و خۆ ڕەپێشدانی ڕەش و ڕووت و برسی و توونیان بوو.

هەمووکەس بێ‌کەس و بێ‌نەفەس بوو. هەر ئاغا و بێچووە بەگەکانیان کەس بوو. تەنانەت گزیر و گزەکەرەکانیش لەسەر داهاتی هەژاران شێری نێر بوون، کێ دەتوانێ لە ئاستی داوای پاك و پیسی وان، بڵێ ئاش ڕاستەوانە دەگەڕێ.

ئەو ئاهۆیە باشتر بڵێم ئەو هەژار مژتنە، تایبەتی گوندێك . هەرێمێك نەبوو، بەڵکوو لەهەموو مەڵبەند و بەندەرکان سەری هەڵدابوو، کەسیش نەبوو بۆ ڕێچارە هەنگاوێك و بازێکی بەباو باوێژێت. دەوای ئەو ئازارە لەمێژینە و فرەگرە هەروا، سووك و ساویلکە کاری کەسێك و دووکەس نەبوو، حەکیمێك و دوو حەکیم ئەو ئاهۆیەیان بۆ ڕیشەبڕ نەدەبوو. بەڵکوو یەکگرتن و لەخۆبوردنێکی بەربلاو و هەمەلایەنەی گەرەك بوو، ئەویش دەبوو بەهۆی چەن کەسێکی کەسانەوە، ڕەگوێی داغ لە دڵ و لەخۆ ڕادیوان کەوێ، لاوان وەجووڵێنێ. بێچووە بەگ و نەجیبزادەکانی قەلا بڵیند ڕاچڵەکێنێ و بیان‌ترسێنێ.

بەلام ئەوی ڕاستی بێ، زوڵمی زۆر و کاری ناڕەوا بۆخۆی قارەمانی خوی دەخولقێنێ. کۆمەڵێك لێك دەبەستێ و ڕاسانێك دەسازێنێ و زار و دەمی داوایان دەکاتەوە.

هەر ئەو هۆیەش بوو، کە لە برێك مەڵبەند، تەك و تەرا کۆچ و کۆچبار بەرەو هەرێمی دوورەدەس دەستی‌پێکرا.

بەشێکی کەم لە کوێرەدێ و هەرێمە شاخاوییەکان لاوەکان لەبن باری بێگار و جەریمە هاتنە دەرەوە و بە شێوەی پەنامەکی لێرولەوێ دەژیان. هەرەشەی توند و تۆڵیان بۆ بەگەکان دەناردەوە.

مالیك و ژاندارمە تریاکی‌یەکان، زۆربەی شەوان بۆیان دەگەڕان، ڕەداویان خەن و خۆیان وەحەسێنن، خەڵکی چەوساوەی هەرێم ئەو جۆرە لاوانەیان خۆشدەویست، یارمەتیان دەکردن تەنانەت چەك و چۆڵەشیان وەدەسدەدان.

لەوسەردەمەدا خۆم و بەختم بە چارەسازی لیٚقەوماو و ئاواران ناسرابووم مالیکەکان، سامیان ڕێنیشتبوو، لایان وابوو کەمن «چاکی پیرەباوەلیٚم» هەر تیتۆڵە پەڕۆیەکم بۆ حەوت دەردان دەرمانە،هیمەتی من هەر یەکاویەکە، بەوبۆنەوە پێوەندی گەرمیان پێوە دەکردم. کەیخوایەتی زۆربەی ئاوارەکانیان پیٚدەسپاردم، ناهەقیشیان نەبوو دەیانزانی لەگەڵ قاچاخ و دەربەدەرانی بیٚ پێوەندی نیم و زۆرجاران بۆم دەبینران، ئەگەر بڵێم لەو بارەوە نەخشی سەرەکی و بنەڕەتیم هەبووە ڕەنگە لەڕاستی دوور نەبووبێت.

لە ساڵەکانی سی و چوارو پێنج لەگەڵ کادرەکانی حیزبی کوردستانی ڕێككەوتبووم، ڕێکخراوێکی پەنامەکی تێکەڵ لە زۆربەی چینە وەرزێرەکانی خەڵق لە ناوچەی گەورکی موکری دەس بەکار بوون. ئاغا و قوڵە بەگزادەکان ئەو تاس و حەمامەیان نەمابوو و لە لایەن خەڵکی هەژارەوە سامێکی بە سامیان ڕێنیشتبوو، سوێندخۆر و لایەنگری حیزب و چاوسووری هەژاران، لامواببوو، دووبەش لەسیٚ بەشی خەڵکی مەڵبەندی دەگرتەوە. جاروبارەش لە زاڵمەکان دەوەشا، هەچی دەستیٚ دەوەشا، چۆڕاوەکەی منی دەگرتەوە و گیر وگرفتێکی عەجەمانی بۆ دەتاشیم.

بێچووە بەگ و لووت بەرزەکان، لووتیان نەوی ببوو. پەنجا لە سەد، ئاکاری ناحەزیان خەت کێشابوو، دەیانەویست بەهەر قیمەت و قەوارەیەك بیٚ هێزی یاخی‌بوونی خەڵك هەلوەشێنن، بۆ ماوەیەکی‌تریش، خۆشڕابوێری خۆیان ڕاگرن، هەر ئەو هۆیەش بوو، کە بوونە چاوساخی ژاندارمەکانی حەمەڕەزاشا و گونداوگوند دەگەڕان و هەستیان ڕادەگرت، سیخوڕ و هەڵفریواویان بێروبەوێدا، بڵاو دەکردەوە. لە دواییدا بەهۆی دەستی پیس و تڵتەخۆرپیشەکانی ناحاڵی، لەنێو ڕێکخراوەی ساوا و پیٚ نەگرتووی ئەو سەردەمەدا دووسیٚ کادری باش نەمەییو ڕەداوی ساوەکییەکان کەوتن و بۆماوەیەك شوێنەون کران، کادرەکان وەك بۆ بابیان چووبنە کاروانی. سەری سیر و قونچکی پیوازیان پاش خۆنەدابوو ئێمەی ساویلکەش، لامان وانەبوو، ئەو کادرە، کارامانە، لەپەنا مەرگ و ئازاری نەیاران، وازوو کەوی

دەبن و هەموو نهێنی حیزب و هەموو بنەو بنکە و کاکڵ و کۆیەك نیشان دەدەن، تا هێرشی بەربڵاوی ساواکیەکان، لە هەموو هەرێمەکانی کوردستان باڵیان نەبەستین پێمان نەزانی، ئەو وەختەمان زانی کە زانست چاری نەدەکردین. لەسنەوە تا دەچێتەوە تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ، ئەندامی بەرز و نزم، ئەوی وەبەر هات، دەس بە دەسبەندەوە بەرەو تاران و چاڵەڕەشی قزلعەلعە بەڕێ کران. منی هەژاریش بەسەر کاروانی ئەو سازمانە نیشان درابووم، لە داو کەوتم.

ساواکیە ئەمریکی‌یەکان نانیان لە ڕۆناو کەوت، چەن‌سەد کەسیان دژی تاج و تەختی شای تاران ڕەداو خست، لە رووحانیەوە تا مالیك و تاجر و وەرزێر و شوانەوێڵە، بوونە قوربانی بێ‌غیرەتی دوو سێ کادری نەخاراوە.

پاش حەوت مانگ ﴿بازپرسی﴾ پاش دووسەد ڕۆژ، ڕۆژەڕەشی، پاش هەموو جۆرە ئازارێکی ژاراوی و تێوەگلانێکی نەبینراو لە نانووخ کێشانەوە تا هەڵاوەسین، شووشەداخی بەتین، چیان لێ‌ویستین، بۆمان نووسین و نۆبەی دادگا پێ‌گەیشت. دادگای نائاگا و بێ‌دەسەڵات ئەوەی پێیان ئەسپاردبوون بە یەکایەکی ئێمەیان ڕاگەیاند، لە ئیعدام و ئەبەدەوە، تا هەشت ساڵ و تا پێنج ساڵیان لێ‌بارکردین و بە کات و دەمی ڕۆژیان ئەسپاردین و لە بەندیخانەی قەسری قەجەر هەواڵمان بۆ دەهات. وێدەچوو کە شا و دار و دەستەکەی لەو هێرشی بەربڵاو و پەلامارە نابارەکەی بۆ سەر کوردستان پەشیمان و ناڕازی بووبێت لەهەزار ناڕازی، یەکی بۆ دەسگیر کرابوو. باقی ناڕازیانی شا بەرەو عێراق و شۆڕشەکەی زەعیم کوردان، مستەفا بارزانی ڕایان کردبوو و تاك و تەراش هەر لە ڕاکردن‌دا بوون. حەمەڕەزاشا و شلەوقوڵەکانی، چاریان نەما کە دەبێ بەرەو چارێکی‌تر هەنگاو باوێن.

پێش هەموو شتێك شێخ و مەشایەخ و دێڵەپیاوەکانی بنە دزەی خۆیان بەرەو مەرزی کوردستان بەڕێکا و ئاوارە و هەڵاتووەکان وەلاوێنێ. کەس‌وکاریان بدوێنێ و دڵسۆزی شا و شابانوویان پێ‌ڕاگەیەنێ. بۆسەر کۆز و کولان و ماڵی خۆیان وەیان‌گێڕێ بە موبارەکی سێبەری باڵی مەشایەخان بێ‌ئازار و ئارەق عەفوو بکرێن، وادیاربوو ئەو کارە بەکەڵك لەکڵ هاتە دەر و زۆربەی ئاوارە گەڕانەوە جێگا وشوێنی خۆیان. لە لایەکی‌تریشەوە، بۆدڵدانەوەی بەندی‌یە کوردەکان هەر حەوتووی سەر گەورەیەك و دمەك بە دەستێك دەهات و ڕوحم و

بەزەی شایانەی بۆ هەڵدەڕشتین و مزگێنی عەفوو و کەمکردنەوەی ماوەی مانەوەی بەندیخانەی پێدەداین.

لەمەرحەبا و جێخەو و خواردنمان زیاد کرا و هۆدەی تەنگیان بۆ هەراو کردین. حەوشە و حەساریان بۆ پڕ لە ئاو کردین، ڕۆخسەتی خوێندن و مولاقات و دیدارمان ئازاد کرا. هەر جێژن و سەرسفرەیەك عەفوویەك دەهات. ئیعدام بوو بە پازدە ساڵ، پازدە ساڵ بوو بە هەشت، هەشت بوو بە پێنج و پێنج بوو بە دوو ساڵ، دوو ساڵ بەرەو ماڵ گەڕانەوە.

ئاخری سەماوەزی ساڵی ١٣٤١ نۆبە ئازادی منیش پێگەیشت بەرەو ماڵ و دایکی پیر و ژن و منداڵی بێماڵ و باڵ گەڕامەوە. نازانم بێژم ئەو گەڕانەوەم چەندە لەبەر دڵان شیرین و تماشای چیا و بەندەنی وڵاتم لەبەر چاوان نوێ بوو. لەخۆشیان جاروبار فرمێسکە، لە گۆشەی چاوانەوە بۆ سەمای بە خێراتنم دەهاتنە سوێ.

با ئەوەش بدرکێنم بارەگای زەبروەشێنی میری دەسبەند و عەزابی بەدەنی و ڕۆحی، شکەنجە و زیندان وەهای زەبوون و زەویگیر کردبووم، لاموانەبوو بتوانم دووبارە تین و توانام بێتەوە گوڕ و گۆڕانێکیتری سیاسی باڵم بگرێ و بە کۆمەڵی گەل و دۆستان بمناسێنێ. ڕۆژێك پیاوێکی شڕۆڵی لووتپانۆکە، وەکوو کەشك و شیرێژ کرێك بوو بە میوان. شەو قسەی خۆشی دامەزراندن و هەروەکوو باوەشێنێك بوو بە هۆی حەسانەوەی خەیاڵی من و ڕێنۆمای ڕچەی داهاتووم. ئامۆژگاری وتەکانی بابای کەشکەکرم زوو بە کورتی کردنە شێعرۆکە و تاقەتم کردن. ئەوەی کەبیرم نەچوون وا لێرە دەیانخەمە بەرچاو:

**ئامۆژگاری کابرای لووتپانۆکە**

وەرە با پێکەوە هەر خۆم و خۆت — رازی شانازی بدرکێنم بۆت
تۆ بەکەم مەگرە دەس و دەسبەندت — بۆ کوڕی ژێرە پەت و بەند و کۆت
ڕۆژی تەنگانە تەکی مەحکەم بە — تەنگانە بەری کەمبەرە خاترجەم بە
یۆسف بە بەلایانەوە خۆی ڕاهێنا — هەر بەلا وەرزی، وەسەر بەرهێنا
سەنگەری سەبری بەلای تێکرووخان — ئەو سەبرە سەری پێ لەسەری دەرهێنا
هەر کووپە مەیەك کۆگلی گوڵخانانە — سازاوی دەسی گۆزەکەری لێزانانە
دەسگرە و هەنگڵی جوان بەس نین — چۆن لەکڵ دێتە دەرێ ئەو جوانە

١٣٤٢

کابرا لووتپانۆکە زۆرزان و لەبنەوەبڕ بوو، وادیار بوو دڕ بوو بەزیبك و بڕ بوو، چی دەگوت هەمووی گەوهەر بوو، دوڕ بوو. نەسیحەت بوو، هومێد بوو. هیوا داڕێژ بوو، بێتوێکڵ و توێژ بوو، ڕۆیشت و نەمناسی، لاموابوو ساواکیە و لاوەکی بۆقسە داکێشان و ناسینی بیروباوەڕی ئێمە دەگەڕێ و دەیەوێ، گەرە بە گۆڕانێکیتریشمان پێبگێڕێ.

هەرچی بوو بۆ دڵی من نیوە دەرمان بوو، تەواوێکی هیوای بەرماڵو بۆ داچاندم. بە غیرەتی ئەوەوە توانیم مێروولەیەك لەگەڵ سولەیمانی پێغەمبەر بەرابەر ڕاگرم. داهاتی زوڵمی بۆ سایە و حینجە بکات. ئەو شێعرە بسازێنم.

**مێروولەیەك**

مێروویەك ڕووتەڵ و بێئەنوا بوو
هەڵوەدا جێتەڕ و بێ بەر نوابوو

لەشی لاواز و گەدەی باریکی
بە بەلا جنجن و هەڵپروا بوو

گیانی پێ مابوو بەلا چ گیانی
لەبڕیو بێبەش و بەش لەدوا بوو

بەگری ئاگری گەڕ داڕێژان
دانەوێڵە و خەلەکەی سووتابوو

خاوخێزانی، نەمابوو خۆشی
جمجمەی شان و پەلی گروا بوو

ناوی میروو بوو، بەلا وەك میران
بەگەشەی ڕۆژی گەشی بڕوا بوو

زانا بەدەمی تۆڵەبوو، ئەمما ئەودەم
دەمی هاوار و دنەی دروا بوو

شەلەشەل هاتە دەرێ بۆچاری
ڕۆیە لای گەورەیێ پیاوی خووا بوو

کەوتە سەر باس و گوتی ئەی پاشا
تۆ نەبای مەرگی بەکۆمەڵ کوابوو

سمی ئەسپی بەزەرت بۆ هۆزم
وەك مستی زڕ و مێمڵ و ڕێبڕوابوو

نیمە تالووکە لە تۆڵەی هۆزم
هاکە ئەو سووڕ و گەڕەت بەربا بوو

ئەو دەمە مێشکتە پێخۆری من
پێمنەڵێی ئەو دەمە بێمەودا بوو

پێی نەچوو هێندە سولەیمانیش چوو
هەروەکوو مێروو گوتی هەروابوو

«ڕاوچی» ڕاوێستە وەکوو مێروولان
بەشی تۆش هاکە زەفەر پەیدا بوو

بیست و چەند ڕۆژێك، دوا ڕۆیشتنی کابرای کەشکڕ، لە لایەن کەڵەپیاوێکی گەل خۆشەویست و ناودارێکی بەدار و دەستە، شاعیری ناودار مامۆستا سەید کامیلی ئیمامی، دۆسی گیانی گیانی، نووسراوێکی دوور و درێژ و خۆشتام و چێژم پێگەیشت. بۆ شەوێکی

دیاریکراو شەممەیەکی نێوبراو، بانگکرابووم، کە کۆمەڵێك لە دۆستان دێن و کاریان بەمن و تۆ دەبێ وەخت موفەڕك و موبارەکە حەتمی لازمە بەرەو گوندی قاقلاوای زەمبیل وەڕێ کەوی، خۆبادانی بێکەڵکە. ساڵ چمحەلە، هەر ئەوەم لەیادە هەوا تۆف و کرێوە و کوولاکە بەفر فرە و سەهۆڵ و سیخواریش فرەتر.

ماڵەوماڵ بە حاڵەحاڵ و ناوچاوانی حاسمانی شینیش تاڵ و تووندرە. بۆ وادەکەش ، لەسێ ڕۆژ زیاتری نەماوە، هەرجۆربوو، بۆم جۆر بوو، کاتژمێر چواری ئێوارە تەڕو تەلیس و سیس داو و دەلینگ پیس، گەیمە قاقلاوا و مامۆستام زیارەت کرد. دەستوور درا شڕەوبڕەیان لەبەر داماڵیم و شەکەتی سەرما و سۆڵەیان ڕاماڵیم، دەستم هاتەوە گۆ، چای تاڵ و پستەی سوێر و خولقی شیرین دەمبێنی شەرم و شکۆی لەدەم داماڵیم. بەتاریف نەبێ زمانم هاتە گول و ئەوەی دەمگوت نەمدەگوتەوە. خۆشیخۆشی لاموابوو ئەو زیندان و بەندی ڕەزاخانی یانیگر، بۆمن بۆتە بۆتەی تاقیکاری.

بوومە خۆشەویستی زۆربەی بنەماڵە و بارەگای بارگەزێرینان. ئیتر لەمەولاوە لەنێو کۆشکی سوور و بەرپەنجەرەی ڕوو لە هەتاو، لەشەڕی هەتیوی دێمەدەر و هەرچی پەژارەی ئەسپەرە دارە، داری لە ئەوکێ دەبڕم، دووبارە لەگەڵ حەمەڕەزاشا، دەبێ وەشەڕ کەوم. کورتی وەبڕین لەوتەی بە چێژ و بزەی شنەداڕێژی مامۆستا سەید کامیلی ئیمامی ناسراو بە (ئاوات) نیوەتێر نەببووم، درگا کراوە، سێ جەوان وەژوور کەوتن، خوالێخۆشبوو سەید کامیل پێشوازی کردن ڕێزی بەهێزی لێگرتن. یەك لەو سیانە کابرای لووتپانۆکەی کۆنە میوانی خۆم بوو.

ناوی برایم بوو، دوایی بوو بە ئەحمەد تەوفیق، لە ڕاستیشدا سەید عەبدوڵڵا ئیسحاقی بوو. لووت پانۆکە وای ڕاگەیاند و کوتی: کاری پێویست هیمەتی کوردانە، غیرەتی لاوانە، شۆڕشی بارزانە، بەڵام لاوازە، بێنان و ئاو و بەرگ و سازە. پاڵتۆ، کەرکەکوێنە، قووت، کورۆسك و بەڕووە. فیشەکدان خاڵی و شۆڕش خۆماڵییە. کوردەکانی کوردستانی ئێران لە هەموو لایەکەوە ڕاساون. جلوبەرگی و خواردەمەنی و پوول و پارە و تەقەمەنی ڕەوانە دەکەن. کەلوپەل و کەرەسەی کۆکراوە لەنزیك ئێوە زۆرن، ئەوەش نووسراوەی بارزانی نەمرە،هاواری کوردانەی بۆ کوردستانی ئێرانە. کورتی وەبڕین لووت پانۆکە هاواری

پڕفرمێسك و تین و گوڕی کوردانەی خوێنی هێنامە جۆش، فەلاقە و شەللاقی سەگەل و سیخوڕی پەهلەوی گۆڕبەگۆڕی هێنامەوە بیر و قەولی ماقووڵی لاوانە و کوردانەمدا.

تا تێدا چوون بۆیارمەتی گەیاندن لە هاتوچۆدا بم. نەبەزانە مەرز ببەزێنم، هەر جۆرە یارمەتی‌یەکم بۆ جۆر بێ، ڕەوانەی‌کەم، سەرتان نەیەشێنم، دوو مانگ زستانی بەفراوی، بوومە بارەبەر، کۆڵهەڵگر یا سەرکاروانی یارمەتی‌هەڵگران بۆ مەرز، بۆ سەردەشت، بۆ جێگای زۆر چڕ و پێدەشت، لە بۆکان و قاقڵاوەوە، بەهۆی خوالێخۆشبووەکان (محەممەد حاجی سمایلاغا و کەڵەپیاوی بنەماڵەی ساداتی زەمبیل جەنابی (سەید کامیلی ئیمامی زەمبیلەوە)، جل‌وبەرگ و پێڵاو، خواردەمەنی تەواو، نیوەتەواو، دەست بە دەست، هەنگاو بە هەنگاو، دێ بە دێ و نووسراو بە نووسراو وەردەگیرا و ئاوەدیو دەکران و لە سیخوڕەکانی، دڵ و سی‌خۆر نەدیو دەکرا. لەشوێنی پێویست، وەدەس مستەفا بارزانی نەمر دەدرا.

بارزانی سەرکەوت حکوومەتی عێراق پاشەکشەی پێکرا، زڕە کوردەکانی هەلپەرست سەر شۆڕ، سەرەوژوور بوون.

حکوومەتی شا و داروەدەستەی ساواکیە ئەمریکیەکان، بە هەڵوێستی قافڵەی یارمەتی بازرانیان زانی. هوجوومێکی توند و بەربڵاویان دەسپێکردەوە.

بەڵام هەر تاك و تەرایان بۆ دەسگیر دەکرا و باقی خەڵك ئاگا، بەرەو تەرت و تەلان خۆشاروکێنە ڕۆیشتن و زۆربەشیان بەرەو شۆڕشەکەی بارزانی پێهەڵگەڕان، بارزانی سەرکردەیەکی زانا و دەروونناس و خاس پەسند بوو.

ئەوەی کە پێی وا بوو شۆڕشگێڕ و زوڵم لێکراو و کردەوە جوانە بۆ ناودڵی شۆڕشی بەڕێ کردن و چەکدارانە دەورەی نیزامی و سیاسی بۆ کردنەوە و ئەوەی زاڵم و مالیك و هەژار خۆریش بوو، لە دەوروبەری قەڵادزە و پێنجوێن و سولێمانی، پەنای دانیشتنی دان. لە دان و پۆی کروکاری سیاسی و ئاموشۆی ئێرانی بێبەشی کردن. ئەوانەی کە سابقەی بەندیخانە و یان کۆڵ و باری یارمەتیان بەرچاوبوو مەقەڕی پێشمەرگەی بۆ کردنەوە بە ناوی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران، ڕوخسەتی هەموو جووڵانەوەی سیاسی و نیزامی بۆ ئیمزاکردین و نیوە خەرجی ژیانیشی بۆ وەبەرچاو خستین. هێواش هێواش، تفەنگی بن شل و شاتمانە شڕ و ئینگلیسی کۆنمان لەلایەن شۆڕشەوە بۆهات و شەڵواری دەلینگ فش و

جامانەی سوور و شێوە بادینانمان بۆ هات و بووینە زرە بارزانی و لە سۆرانی و جلکی کوردی ئێرانی تۆراین. ئای منالّی و نەزانی چەن خۆش بوو، ئای شۆڕش سەرەتای چەن بەتاموبۆنە، دلّ و دەروون چەن گەش و ڕوونە. سەرکاری کاروباری ئێمەی نەزان و بێکار، ئەحمەد تۆفیق و فایق بوون، باشتر ناوی ڕاستیان لیّ‌هەلّدەم، دەبنە سەید عەبدوللای ئیسحاقی و سولەیمان موعینی، ئەو جووتە بە جووتە، جووتیاری مەزرای قاقڕی پڕ لە قڕەی ئێمەی بەقڕداچوو بوون، بەلّێی و مەلّێمان، بیلّدەی دەم و هێلّی ئەو جووتە لێك جووتانە بوو، ئەوان سابلاغی و نەجیب و ئێرە و ئەویّ گەڕابوون. ئێمەش ڕەشۆکی و بۆرە پیاگی دێهاتی و خەرج بدە شار و بەرە نەدیو و چەنەزان بووین، هەر مەرحەبایان پڕ بە پێستی بوو.

## شاری قەلآدزە

بارزانی لە قەلآدزە بوو، بنکەیەکمان لەویّ بوو، مستەفا بارزانی ئەحمەد تۆفیقی خۆشدەویست، زۆری سەفەری بەغدا و تاران و لوبنان و تەنانەت ئورووپاشی پێدەکرد. لەبن سێبەری ئازایی ئەحمەد تۆفیق‌دا ئێمەی ڕەشۆکیش بارزانی‌ناس بووین، جاروبار کێشکچی جێگە هەلّوێستی ئەو بووین.

ئەوەی ڕاستی بیّ، تفەنگەشڕەی زەمانی ترکەڕەشان و مەرحەبایی ساردوگەرمی بارزانیە قەنناسەدارەکانی بەدارو بار، هەموو خەم و کەسەر و کەمایەسییەکی لەبیر کردبووین. ئەوەمان بەس‌بوو پێمان بێژن پێشمەرگەی چەکدار.

ئەحمەد تۆفیق لە سەفەری بیست ڕۆژە گەڕاوە، چوون و گەڕانەوەی بۆ ئێمە داپۆشرابوو، ڕاسپێری بارزانییە و دەبیّ نەزانی، درۆ نەبیّ نۆ باتمان قاقەز و نۆ بۆشکە ڕەنگ و خەرەکی فرەنووسی و دەلیاتێك کەرەسەی نووسین و تایبەتی پەڕتووك و پەڕاو و شتی ورد و درشتی بۆمان هێنابوو، لالۆیەکی یەزیدی و بارزانییەك و دوو سیّ لاوی لاوەکیشی ڕەگەلّ کەوتن، بیست ڕۆژێك خەریکی نووسین و تایپ و لەچاپدانی پێویستی حیزبایەتی بوون، جاروبارەش ئێمە بۆ ژمارە لێدان و کاغەز دەستە کردن خولّك دەکراین.

بەڵام چمان لە چ نەدەزانی. فایەق و ئەحمەد تۆفیق و مەلا ڕەشید، ڕەشەکوژی ئەو نووسراوانەبوون.

لەهەر نووسراوە، دەقێك بۆ بارزانی نەمر دەچوو، بڕیاری خۆی لەسەر دەدا ئێمەش کۆمەڵێك شوان و جووتیار و مجێوری بێهەناو تەنانەت مەلاو فەقێشمان پێوە هەڵنیشتبوون، لە چمان نەدەپرسی هەر بە چەکی کۆنە و جامەدانی سوور و کەرکەلموییکی هەورامی بە نێوی کولە باڵ دڵمان هێن خۆشبوو هەمیشە هەر ویرەویرمان بوو، لەسەر کێشکی بەرنیوا و کۆنە بنکان، هەر کێشەمان بوو، هەرکەس دەمانەویست تا ئێوارە چەك بەشان، کێشكبڕ بین، شان و چەکمان بە ئەم و ئەو نیشان بدەین، ئای چ خۆشبوو بە چەکەوە پیاسە و خۆنیشان دان،هەڵسووڕان و خۆبادان، بەتایبەتی دۆلکە و کیسەی بە فیشەکدانەوە هەڵاوەسراو جامەدانەی نێوچاوان، بیچم کوردانە، ئیتر چیتر هەبوو، بیری لێوەکرێ، دەبێ بێژم هیچ منالی وردی بەجێماو دایە و بابی بێنان و ئاو، هەموو ناتەواوی بنەماڵەمان لەبیر و هۆش هەڵوەری بوون، ڕۆژێك نووسراوم بۆهات کە بەرەو بنکەی سونێ گوندی داوێنی چیای قۆماڵ وەڕێ کەوم.

زستانە و بەفر وڵاتی ڕەشبڕ و ڕێگر کردووە، سەرەڕای ئەوەش بنکەی گوندی سونێ چۆڵ و هۆڵ و درگا هەڵچنراوە. حیزبەکان بەرەو بەرزایی سنووری ئێران وعێراق ڕۆیشتبوون، لەو بەرزاییە خێوەت و بارەگایان لە عەرزی داوە، لەگەڵ ڕێنوێنێك منیش بەرەو بارەگای لاوانی ئێرانی وەسەرکەوتم.

لەچادر و خێوەتی ڕازاوەی دووهەم کونگرەی حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستانی ئێران بوومە میوان. میوان هەر تەنها من نەبووم، بەڵکوو سەد نەفەرێکی غەریبە، و بۆ زۆربەمان نەناسراو تێخزابوو، لە کوردی هەمەدانەوە بگرە تا سنووری ترکیا و سووریا، بانە و سەقز و مەهاباد ناوچە کوردەکانی زاروزمان لەیەك جیاوازیش لەوێدا دەبینران.

بارەگا لەهەر لاوە زۆر لاو و بەرچاو و ڕازاوە بوو، لە خواردەمەنی و پێداکردن و سارد و گەرمی بێ کەمایەسی بوو، قەل و مریشکی زۆر و وردە حەیوانی قەڵەو و بژاردە لە شومار نەهاتوو بوو، سندووقە چای جووت غەزاڵ و باقە جگەرەی کوردی و ئینگلیزی بەلاش کلاشەی پێدەکرا.

کۆنگرە پازدە ڕۆژان لە گەردوگوڵی گوڕوگاڵی خۆیدا، هەر خۆی دەنواند، وتەوێژ و پتەڕەوان، هەر کاك ئەحمەد تۆفیق بوو، سەفەری ناوچە کوردەکان و بە ئورووپا هەڵگەڕان، شەونخوونی و تاڵ و توونی ڕێگا و بیچمی کارکردی چەن ساڵەی چەور و شیرین و خۆش کێش و چێژەی بە میوان و ئەندام و لایەنگران ڕادەگەیاند و کاك فائیقیش جاروبارە دەی حەساندەوە. وێژراوەکەی بۆ جووت مۆر دەکرد، ئێمەش دەست و دەسەلاتمان هەر چەپڵە و بڕۆی کاك ئەحمەد بوو، چی دی. با ئەوەش نەشێرمەوە، زۆربەمان کاڵ و کرچ و نەگەڕاو نەدوواو کۆمەڵگا نەدیو بووین، چمان نەدەزانی، چەپڵە و بڕۆیش تازە فێرکرابووین، گۆنگرە ناونرا، کۆنگرەی دووی حیزبی. لەدوا تێکچوونی کۆماری مەهاباد، مەشهوور بە کۆنگرەی قۆماڵی، قۆماڵ ناوی ئەو کێوە بوو، کە چادر و خێوەتمان لێهەڵدابوو. وابزانم ساڵی هەزار و سێسەد و چل و دووی هەتاوی بوو.

کاغەز و نووسراوەی زۆر و بۆر. نامیلکە و پەیام و پەیڕە و پرۆگرام و زۆرنووسراویتر، کە لە مەڕ ئافەرینی هێندێك و دەرکردنی چەندێك و تاوانبارکردنی بڕێك عەشیرەت و پۆلە کوردی بەڕەگ و ڕەچەڵۆك، سەریان دەرهێنا و نیشاندران و ئێمەش بێ سێ و دوو بەتاوان و بێتاوانمان مۆر کرد، ئێمزامان لێدان، کۆنگرەی دوو زۆر کوردی باشی لەکیس داین. هەر لەوێ ئەندامی ناوەندی، تاقمی چاوەدێری بەرزی بەشی ماڵی و سیاسی و بەشی نیزامی و قەزایی هەڵبژێران.

خۆم و بەختم من بە سێ سەرە هەڵبژێرام و بوومە حەمەقدوی شاری مێری. ١- ئەندامی ناوەندی ٢- چاوەدێری بەرزی ماڵی حیزب ٣- قازی دادگای گاوبێگای هەڵەی ئەندامانی حیزب.

کۆبوونەوە پازدە شەو و ڕۆژی خایاند. قەل و مریشك، کوور و گیسك بەشی زۆریان، کرانە کەباب و کەوڵ و پێستیان بۆ چەقەڵ و مام ڕێوییان بەجێما، بەفر تاوڵ و خێوەتی بە چۆك داهێنا و کوێستانی پێ چۆلکردین. هەرکەس بەرەو کەسی خۆی گەڕاوە. کۆمەڵی لە هەموو سیاسەت و پێش‌بینی بێ‌خەبەر، بلاوەی پێکرا و ڕەشە بڕکران.

بەر لە کۆنگرە خۆم بەشێوەی مەلایەتی لە گوندی شینێ زۆرم خۆش بۆ دەگوزەرا، زۆربەی ڕۆژان لەگەڵ ڕاوچی دەسڕاست و نەبوێر، لە ڕاوە حەیوان دەبووم لە کێوە بەرزەکانی لە

جوانیدا تۆخ و لە بەرزیدا شۆخ، تێر تماشا و دڵ گەش و بێخەم دەژیام. زۆربەی شەوان لەگەڵ مەلکەوان و سەیدەوانان، لەگەڵ کوڕەکوڕەی لێزان و شاخەوانان لە ئەشکەوتەکانی خۆڕست و نێوە دەسکار بە نێوی ئەشکەوتی «کونە هەتاو ـ لەتە سواڵەت ـ کێل کولێن ـ بەرنیری ـ بازی بزنەگەلان و پاردەی کچە دێوێ ـ و حەساری مامەڕەشی) ماومەتەوە و کەبابی بێمنەت و بەلاشم لێ سازکردووە. بێخەم و خەیاڵ خپ وەرکەوتووم شام بە سەپان نەزانیوە.

## بەڵام بێشانسی خۆم

فەڕ و فیتی کۆنگرە تووشی سەدان بێنەوبەرەی بێسەرە و بەرەی کردم. خۆم لەلا گەورەبوو، تووشی گەڕی سیاسی و بەڵای خۆهەڵماسین بووم، ژن و منداڵی وردم بێ ڕێ و شوێن و نان و نوێن، بەجێهێشتن و خۆم تووشی چەقە و دەمەتەقە و شەڕەفڕی حیزبایەتی کرد.

خۆشیم لەدەس چوو، چووەم پووکانەوە و پرێسکەی ژانە سەرم گرێدرا و لە زەلاوی سیاسی چەقیم، چەق و چۆی چەقە پارێز و سەدان بەلێنی کەلێن و درۆی شاخدار شاخیان لێدام، بۆ هەمیشە فوویان لە شەمی خۆشی کردم، زستان ڕۆیشت و بەهار هات و بە سەدان ڕاز و نیاز و جوانی چیاکانی ڕازاندەوە، بەرەبەیان و بولبول هاوباوەش بوون، لاوك و وردەقامی مەلە وردیلەکانی کۆچەر، سەربان و سوێ بانیان بە گیان هێنا و مەڕدار بەرەو چیا و جێگە هەواری نوێ بار و بنەیان تێك نا و ڕاوچیان بەرەو چیا پێهەڵگەڕان. بیری ڕاو و بەرداوبەردی زەرد و تەلان و بەردان لێم بوو بە فرکەی گورچووبڕ و ئارام و ئۆقرەی چنیم و چەنەی مەرەخەسی و داوای پشوودانی پێنووسیم و چل و دوو شەو و ڕۆژ بوو، لەماڵ و منداڵی وردم بێخەبەر مابووم. چڵکن و دژوێن. کون لەدڵ دژدامابووم، پاش چەندجار داوای ڕۆخسەتی مەرەخەسی بێ جواب مام و بێدەسەلات هەر بۆ هەڵسووڕانی کاروباری حیزبی لە وردە بێگاری شۆڕشی لە جێگەی کاروباری سەروبن نادیار مامەوە.

## کۆبوونەوەی پاش کۆنگرەی (قومالٚ)

لەبەهاری ساڵی نوێدا بۆ پیرۆزبایی کۆنگرەی تازە نویٚ، لاوانی مەهاباتی و بڕێك لەڕ و لاوازکەی دێهاتی و ڕیزێك قاچاخ و قوچاخی بێکار و بار تەشریفیان هێنا و نانخۆری بنکە زۆر بوو، چالٚ و کەندوو تووشی قات و قڕی هات و شۆڕشی بارزانی لە بەخێوکردنمان بەزی، برا سابلاخیەکانی تازە هاتوو، کە بریتی بوون لە دەستەی شەریفزادە و ڕەستگار و بەرەی قازییەکان هەموو تێر و تۆخ و بەپۆز خۆیان بە بێچووە قازی و مەلەوانی زانست و زانای بنج و بناوانی سیاسی دەزانی لە هەموان دەمڕاستتر ئەمیری قازی بوو کە لەسەر پەیڕە و پرۆگرامی داتاشراوی کونگرەی تازەی سازمان، ڕەخنە و عەیب و عاری لیٚ بەدی کردبوو، لام وا بوو هەقیان بوو، پاش حەوتەیەك مشت و مڕ و مۆڕە لەیەك، بڕیار درا، بڕیاری کۆنگرەی دووی حیزبی دێموکڕات بڕبڕ بکریٚ و لە تێبینی و بڕیاری نەبیسراو وشەی. لاوەش تێر و تەسەلتر بەرچاو بخرێت.

لە کۆمەڵی حیزبی ئێرانی دە کەڵەکوڕ و دە سیاسەتزان و خاوەن ڕمڵ هەڵبژێران کە لەسەر خێران هەموو بڕیار و بەند و نیوبەندی ناتەواوی کۆنگرەکە لە لاوازی و کەم و کەسەری بپارێزن، داوای چوار پارچەی کوردی تێدا بسازێنن. لەناواخندا دژایەتی زەق و بەرچاو لەگەڵ چوار دەوڵەتی خاوەن هێز و باو بەرچاو بیٚ. لە دانگەی ئەو دەنەفەرە چارەنووسانەدا من بووم. لە کەوانەشەوە کاك ئەمیری قازی نەمر بوو. کۆبوونەوەی دە نەفەری زۆر خۆمانە و مەحرەمانە بوو تەنانەت دەبوو بارزانی نەمریش هەستی پیٚنەکات. من لام وابوو ڕاستە هەموو کوردێك هەر ڕاستە، نەمزانی وێنەی من و دەنگی زۆربەی ئەو دەنەفەرە دەچێتەوە ساواکی مەهاباد و بۆ ڕۆژی خۆی لەسەر پەروەندەی ئێمە دەبێتە قیلی کەوای سپی.

کۆبوونەوە ڕەسمی بوو چایی ڕەش و جگەرەی سۆمێر و سفرەی میرانە هەر سڵاوات و ماشەڵلای دەویست. یەك حەوتوو لەسەر وشەی لاوەکی وەکوو شۆڤێنیست، سوسیالیست، ئانتێرناسیۆنالیست، ڕادیکالٚ، بورژووا و شتی بەولاوەتریش هەرچەقە و دەمەتەقە و لەیەك

هەڵتەقین بوو،سابلاخییەکان خۆیان بە مامۆستا دەزانی. بەڵێیان هەر نەبوو، نەخەیریشیان بۆ خێر و شەڕ، بەپێی فیلان بوو. ڕۆژێك خودا دەرکی بە خێری لەمن کردەوە، زەلامێك دەرکی مۆڵگەی کۆبوونەوەی کردەوە، بێ ڕوخسەت و داوا وەژوور کەوت.

لەرکەڵە و شلەپەتە و شەڵوار شڕ بوو. بە سووکە سلاوێك لە خوارەوە بۆی تەخت بوو هاتنی سەیر و پرسیارەکانیشی بۆمەی ساوا سەرسووڕهێنەر بوو، ڕێزێکمان لێنەگرت و بە هێندەمان نەزانی.

بەڵکوو بڕێکیش ڕووگرژ و تووڕەبووین. کەبەبێ ڕوخسەت هەقی نەبوو بێتە ناوکۆبوونەوەمان، دەمەتەقە و کاوێژی سیاسی بەسی لێکرا. جەلەسە بێدەنگ و نە ئاشتی و نە جەنگ بوو، بە فەلای بێ دەنگ. میوان لە بەرپرسی کۆبوونەوەی دەپرسی، هەموو قامکمان بۆ ئەمیری قازی ڕاکێشا و بە بنەماڵەی قازیمان دەزانی و جیا لە هەموومان لەسەر پەتووی چوار لۆ جێگای بۆ ساز کرابوو.

میوانە لەرکەڵە پرسیاری قووڵ و ماقووڵ و کەڵەکەڵەی زۆر کردن، تەنانەت دانەیەکیشمان بۆ ئەو جوابانە بە جواب نەهاتین، زۆر بە باشی لەخۆمان گەیشتین کە پێ نەگەیشت و تێنەگەیشتوو چی نەزانین.

## (پرسیارەکانی کابرای نەناسراو)

١. برا گیان ئێوەی تازە حیزبی، ژمارە و تەعدادو دەگاتە چەند کەسێك؟

٢. ئاوارە پەڕیوەتان بەندی و ئەسیرکراوتان چەندە؟

٣. گیراوەکان لە تیپی کارگەر و ڕەنجکێشن، یا مالك و بازرگانن؟

٤. بەندیخانەکەیان لە کێهە شار و لاپەڕی ولاتەکەتانە؟

٥. کێ مشوورخۆری نان و پێخۆری ژن و منداڵی ئەو بەندییانەیە؟

٦. ئەگەر ئەو بەندییانە حیزبێك و سازمانێك، لایان لێ نەکاتەوە کە هاتنەوە نابن بە دژی حیزب و دەگەڵ دژان نابن بە دژی ڕێکخراوەتان؟

٧. ئەگەر شۆڕشی بارزانی بەڕێوەچوونو نەداتێ دراوێکیتر و هەس؟

و....

زۆر پرسیاری‌تری پاراو و دەمتەڕانەی کردن و بێجواب و وڵامی پاراو بەجێمان و نەتەقەمان لێکرد و نە نقەمان لێهات.

کابرا لاوازەکە لە جانتا شڕ و بە گیانەکەی دەستەوارێکی نووسراوکە هێنادەر و چی بەندی و ڕاکردووی کوردی ئێرانییەکان بوو، ناو و شۆرەتی هەڵدان.

شاری و شارویرانی، سەردەشتی و دەشتەکی، خوێندەوار و بێخوێن. جێدار و بنەماڵە و بێ ماڵ و حاڵ، تەنانەت ناوی گوند و کووچە و گەڕەك و نەشیمەنگای زۆربەشیانی پێبوو. ئەو پیاوە بەباوە بۆ ئێمە فریشتە بوو، زۆر باشی تێگەیاندین کە هێشتا خاوین و تێنەگەیشتوو نەخاراوین.

کوێر کە شوێن گێڕی شوێنی سیاسی نین، لێبڕاوێکی بەرەی ڕاستی نین، نە کەڵەپیاو نە کۆمەڵناسین، چەکە داسین، کەڕ و کاسین، بۆ باسی لاو خاسی نابین ، بێ سەواد و نەحاملاوین، بێ تەجرەبە و هێز و باوین، پوختە و ڕاستاوێژ نەکراوین.

بەش بە حاڵی خۆم ڕاچەنیم، تێگەیشتم من ئەوە نیم کە خۆم دەڵێم، باشتر وایە زووتر هەڵێم، قڕەی سیاسی بەجێبێڵم، بچمەوە سەر کێڵگە و هێڵم، پەنانشین بژیم بمرم، ئۆباڵان وەئەستۆ نەگرم، لەبەرپرسی خۆ وەشێرم، بەرچاو نەبم لایەن گریم، قاڕ لێنەدەم، قاڕ وەربگرم، نە بنبار و نە سەربار بم، خێرخوای چینی هەژار بم، هەر لەوێ بەو دەمودەستە ئیستیعفای خۆم نووسی بەو دەستە. چیم نووسی بوو چیم بادابوو شیم کردەوە، هەڵەی بەرپرسیم شردەوە، گەڕامەوە ماڵ و حاڵم، حاڵی بەبێ ماڵی تاڵم، ماڵم لە گوندی شینێ بوو، شینێ لە شینایی نوێ بوو، بۆمن بەهەشتی بەجێ بوو، ڕازاوەتر لە هەردێ بوو. لەگوپ لە باغ لەدار و بار، لە کانیاوی شیرین تەیار، لەمیوەی شیرین و ئی خۆش، لە ئاوماڵی سەر و ڕووخۆش، لە بزە و لاتاو و جەفەنگ، لە بەیت و باو قام و ئاهەنگ، چی دڵ گوڕووی تێدەبەستێ، چی گەرا و بنەما بوو، بۆ هەستێ، بۆ قامێ، بۆ هەڵبەستێ، بۆ هەر ژیر و بۆ هەر مەستێ، خوای سروشت بەو گوندەی بەخشی بوو، جوانتر لەگەڵی کر و نەخشان نەخشیبوو.

بەرەو ئەو گوندە چرگەنی سیاسەتم بەجێهێشت، ئازا و بازای منالی ورد و باب یەخسیرم لە ئەستۆی نیوە فەقیری خۆم دارنی. چوومەوە ناو باوەشی خۆشی و منالی خۆشی نەدیوی

خۆم، لە مێزیٚ گرتن و زۆربەی ڕۆژان بەڕاوی حەیوان هەڵدا و پێدای تەلان و تەرتان، تەم و خەمی دەربەدەریم هەڵدەوەران. سەرەڕای ئەوەش بیری بڵاو، خەیاڵ پڵاو گرنەی شۆڕش و شۆڕشگێڕی، هێزی خولی وەسەر گێڕام. شەشدەری لێگرتم، دەرەتانی لیٚبڕیم، لە خوشی هەڵبڕیم و خەوی شەوانی پیٚکردمە شەونخوونی، خەونی بیٚتام و لە تامیلا نەهاتوو. تووشی ڕۆژی تووشی بیٚ سەرەدەری بووم و تەنانەت لە بوونی خۆشم خۆش باوەڕ و بە متمانە نەبووم.

پۆلێك کوڕوکاڵی کرچوکاڵ، هەریەك هەلاتووی دەسبەتاڵ، کیٚ دەیزانی کیٚ لە کوێیە، لەکامە چین و کام توێیە، لەمەڕ کێهە داوا وێڵە، دزە، زۆردارە، بیٚوێڵە، یان خۆشەویستی ناو خێڵە، چزوو مەرجی لەیەك بەستین، کۆمەڵگایەکی پیٚبەستین، هەموو بووینە برا برای نانی، نەبووینە هاوەڵی گیانی، چووینە سەر سفرەی بارزانی.

بڕیار درابوو هاوەڵ بین، بەبیٚ پەڵە و بیٚداوەڵ بین، بۆ هەمیشە مێر و کەڵ بین، زۆر پێنەچوو، تۆ تۆ و من من، سرتەی ناو کەلێن و قوژبن، لێکی کردین، خۆشی بردین، لەگەڵ یەکتر خوار و خێچ بووین، بووینە دوژمن، لەبەر کاڵی و مناڵیمان، لەبەر مێشکی ناحاڵیمان، حاڵ و باڵمان وەها شڕ بوو، خواست و داوامان بڕبڕ بوو. لێك هەڵبڕاین، لەیەك بڕاین، بە ورتەی میوانی نەناس، پرسیاری هێندی قسە و باس، مابووینەوە کاڵ بووینەوە، زۆربەمان بەرەو باو بووینەوە.

## بارزانی هەوێنی شۆڕشی میللەتی کورد

میوان کوردێکی فەیلی بوو، لە شۆڕشی بارزانی یەکەم کەس بوو، بۆ لیٚزانی بەرپرسی ژینی شۆڕش بوو، زانا بیٚ کرێژ. بزر بوو، خۆشەویستی بارزانی بوو، شەمی تاقی لیٚزانی بوو، بەڵام هیچمان نەماننناسی نەمانديبوو، نەبیسرابوو دەنگوباسی. میوان لەسەر چەن پرسیاریٚ، لەهەر لابیٚ لەهەر باریٚ، تاقیکاری لیٚوەرگرتین، تێمانگەیی خاوین وردین، ناتوانین قەڵای شۆڕش بین، لەمپەری سەدان هێرش بین، ڕاستە و ڕیٚ وەکوو ڕاستان بین،

چاوسووری چاو لەدەستان بین. بۆ دیل بو هەڵوەدایان، بۆ هەر شەهید و بابایان، بەرنوا بین جێ پەنا بین، بۆ هەمووان خێری خوا بین.

وتی برام، بۆتان زووە، ڕاسان و بێڕەنگ و ڕووە، شۆڕش، مەرج و هەلی هەیە، سەدان گەوە و کەلی هەیە، پێش هەموو کار وەرن کورد بن، مێر بن، شێر بن لە بارزانی شۆڕش فێربن، لەمێژوو ناسان بپرسن، لەزۆڵە کوردان بترسن، ڕێگای نان و ئاو ڕەچاو کەن، ئەمجار بەدەو شۆڕش قاو کەن، شۆڕش شەڕی مەرگ و مانە، لێقەومانە، تەنگانە و خۆڵەگۆڕنانە، هێشتا ئێوە شلك و خاون، تاڵ و سوێری کوێرەوەری، ئەرکی گرانی ڕێبەری، بای نەداون. بەر گرمەی بۆم بۆنی باڕووت، بە تەقەی تفەنگ نەشەمزاون، نە ژاکاون، دەتانەوێ وەك سەربەرزان، بگرن قلف و گەوی بەرزان، وەرنە ناو شۆڕشی بارزان، بارزانی کوردە کردەیە، بۆ هۆزی کورد لە هەر کوێ بن، درشت و ورد، سەرکردەیە، لەمێژ ساڵە تێدەکۆشێ، لەو ڕێگەدا خوێن دەڕێژێ، خوێن دەنۆشێ، داشداری داشی کوردانن، کوردان لەئەوڕایە جوانن، ئێوەی کورد، کوردی ئێرانی وەرنە ناو جەبهەی بارزانی، بەناوی کوردی ئێرانی، ببنە شۆڕشگێڕ، لە دەشت و هەڵەت و هەڵدێر، بەرەو داگیرکەری خاك و بەرەو زۆڵەکی ناپاك و بەرەو یانی گروسیسان، بەرەو دەست و داوێنپیسان، بەرەو سەهەندە و نەگریسان، بەگیان و دڵ بەچەك ڕابن، ڕابوون فێر بن، شێر بن، نێر بن، بو کۆمەڵتان پێشمەرگە بن، خێری خوابن، تاڵاوی تاڵی بچێژن، تەرمی ڕەفیقتان بنێژن، بۆنی باڕووت، گازی خەرەدەل، گرمەی فڕۆکە، ناڵەی شەل، نیوە نووزەی مناڵی کورد، زارۆکی ورد هەرای پیرە پیاوی پێکز، دەخڵ و دان و خەڵەی سووتاو، شالاوی دز، خوێنی ڕژاو. سەدان کۆسپ و قۆرت و ڕۆچوون، پاشەکشە و بەگژداچوون، بەچاوی خۆتان ببینن، شۆڕش شیناوەردی شینە، تا شین نەڕژێتە سەرزەوی، خوێن سوور نەکا بەرز و نەوی، وەرزی ئازادی شین نابێ، دوژمن هێزی بێتین نابێ، کلێتە و جامانە و کورتەك، دۆشکە فیشەکدانی دوو تەك، خۆ بادان و سمێڵی ڕەش، نابنە بەڵگەی شۆڕشگێڕی، بۆی ناسێ چ ماف و بەش، وەك ڕۆڵەی کورد، وەك سەربەرزان، وەرنە ناو شۆڕشی بەرزان، بارزانی کوردی دڵپاکە، ڕچەی چاکە، ڕێك و پێکە، داوای بۆ هەموو کوردێکە، سەرکەوتی ئەو سوودی گەلە، یارمەتی بارزانی هەلە، ئەو سەرکەوێ بەغدا بشکێ، ئابڕووی بچێ حەیای بتکێ، تاران لەبەرمان خۆ ناگرێ، بێپێدەبێ کورد پێدەگرێ، بێماف

مافیان دێتە دەستێ، داگیرکەر گەڕیان دەوەستێ، هێز و چاریان دادەچۆڕێ، ماف کوردان، دێتە گۆڕێ، کوردی هەرچوار دەوری خۆمان، دەبنە پێشمەرگەیەك بۆمان، دەچتە ناو کۆمەڵان کۆمان، دەنگ و باسمان، ڕاپەڕ و هێز و ورەی خاسمان، خۆ دەناسێ بە هەندەران دەچینە ڕیزی بەشبەران، چی کوردە پاکی یەكدەگرێ، مافیان دەدرێ، کوردستان یەك پارچە دەبێ، بۆ هەزاران خوانچە دەبێ، داگیرکەر داریان لێدەدرێ، بەشیان لە کوردستان دەبڕێ، ئیتر سەودامان پێناکەن، تەما لە داهاتمان ناکەن، یەکتر بگرین سەردەکەوین، دوو جەبهە بین هەڵدەکەوین، بەرناگرین پێناوەستین، بڕبڕ بڕۆین، ڕێك دەوەستین، دەبینە پارووی بێگانان، کوێلە دەبین وەك نەزانان.

هەروەکوو بووین هەروادەبین، هەروا دەژین، بێسەردار و بەبێ یاسا، خۆمان ئاسا هەردیل دەبین، زەلیل دەبین، کوێلەی دەیان چەرچیل دەبین.

## لالۆی میوان

لالۆی میوان بەجێی هێشتین، تاڵی هەڵەی وا پێچەشتین، دریای داوای پێلێڵ کردین، بیروبڕوای پێوێڵ کردین. سرتە و خورتەمان لێبار بوو، بارمان کەوت هێزمان خەوت، ڕۆژمان ڕەش و نالەبار بوو، هەرکەس بەرەو بارێ سواربوو بنکە بوو بەجێگەی قەلان، بەرنوا بۆ کوند و مەلان، ناوەندی حیزبی بڵاو بوو، هەرکەس بۆ جێیە بەتاو بوو، یەك ڕۆیە ناو شۆڕشی بارزان، یەك بوو بە قاچاخچی مەرزان، هێندێك بوونە مام جەلالی، بەبێپشتێن بەزگی خاڵی، چەن جار سرك و چەن جار ماڵی،پۆلێك ڕابووون بەرەو ئێران، نەترساو هەروەکوو شێران، خۆیان ون کرد لەهەر باسان، بە ناوەندی خۆیان ناساند، لە چیایان، لەدژ ڕاسان، هێندێترمان خاو بوونەوە، سەرشۆڕ بەرەو باو بوونەوە، بوونە تۆ بەکاری پاشا، لە بوونە کورد، هەزار حاشا، تەنیا و تەنیا باڵ مامەوە، لەنێو خەیالات و خەما دەتلامەوە چارم نەبوو، ڕێگای کاروبارم نەبوو، بوومە مەلای گوندی شینێ، هەر ئەوڕۆ خۆزگەم بە دوێنێ، هەر چەند لەژێن تێروپڕ بووم، بەڵام لە خەم، خەیاڵاوی مات و کڕ بووم. لە داهاتووم. سەرسووڕ مابووم، بێسەرەدەر بێدەر مابووم. لە زەلی فکران چەقی بووم، بە دوای چارەدا شەقیبووم، گلاوی

هەڵدێری سیاسی، ناحەز دەبێ دەنگ و باسی، خاس و خرا و خاس نایێژن، چی خراوە بۆی دەبێژن، خوێنی لەتەشتان دەڕێژن، بەرەو قودووسی دەنێژن.

## بارزانی بە بڵاوەی زانی

سەرۆکی شۆڕشی کوردان، خەمخۆری درشت و وردان، مەلا مستەفا بارزانی، بەوکارە ناحەزەی زانی، تاك و تەرا بانگی کردین، وەکۆی کردین، هاتە نێومان، بوو بە خێومان، چەپەڵی خەمانی شردین، دەستی گرتین بەرەو هیواداری بردین، مووچەی ژیانی ناوبردین، بۆمەی ئاوارەی ڕەشوڕووت، بەزەی بزووت. جلوبەرگ و کەرەسەی شەڕ، بنکەومەقەڕ، دەفتەری کار میزی نووسین، خورجێن، بێسیم، دووربین بۆ دین. لەناو شۆڕشی بارزانی، هێزمان دیار بوو، ڕیزمان دیار بوو، بووینە برای گیانی گیانی، پێسپێرمان ڕادەپەڕان، شەو دوشمنمان دەردەپەڕان، لەپەڕان سەنگەرمان دەگرت، جاشمان دەکوشت دیلمان دەگرت، تەحویلی حەسۆمان[1] دەدان، حەسۆ سمێڵی لێبادەدان، بەهێزی خۆی تەواو دەکرد، پێشکەشی بۆخۆی وەردەگرت. ئێمەش هەرهیچ، بەناو ئێرانی ڕیچ و قیچ، ناومان نەبوو باومان نەبوو، بێئافەرین و بێموژدە، بخۆ و بڕۆ و خۆ بەکوژدە، ببە شەهیدێکی بێنێو، بێکێل، بێخێو، قەل و داڵ چاوت دەردێنێ، کەس نەبێ بۆت ببارێنێ، نەخرێیە ناو مێژووی گەلت، فیڕۆ دەڕوا کات و هەلت، بەوبۆنەوە وچانمان گرت، ڕێك مانمان گرت، نامەمان دا بە بارزانی، بارزانی بە مانی زانی. لە جەبهە مەعاف کردین، تێمانگەیی خاوین وردین، ئەرکی سووکتر لەچاو چووکتر، پێی ئەسپاردین، بەرنامەی کاری بۆ ناردین، بووینە کێشك لە زیندانان، لەمەقەڕ و دەرك و بانان، بووینە بنبارێلی شۆڕش، دوور لە جەبهە و دوورە هێرش. خواردن و خەو و نۆڕیزکە، سەردانوێنە و چاوان حیز کە، داهاتوو چۆن دەبێ بابێ، بۆی مەلەرزە لەلات بابێ.

[1] ـ حەسۆ ئەمیرخان، سەرپەرستێکی شۆڕشی بارزانی بوو.

## شۆڕشی بارزانی وێك هات

وابزانم شۆڕشی بارزانی، بەرەو پێنج ساڵە دەچوو، پێنج ساڵ شەڕ گەڕ بۆمباران، سووتمان هێرش پاشەکشە، هومێد، بێهیوایی، تەقوڕەو، تالان و بڕۆ و ڕۆڕۆ، پەلبوون، شەلبوون، لەخوێن گەوزین، زاڵبوون، بەزین، گەرما سەرما برسیایەتی، توونیایەتی، بۆنی باڕووت گرمەی تۆپان، لەپی دەشت و یاڵ و پۆپان، ویزەی مێك و سۆخۆ هەنتێر، لە کۆخ و گوند، چیا و هەڵدێر. شێری دەویٚ خۆڕاگربیٚ، بەتینتر لە پۆلا و گڕبیٚ، بارزانی بیٚ، کورد بیٚ کوڕ بیٚ سنوور بڕبیٚ، بۆسەربەرزی بەرزەفڕبیٚ، لەڕووی داگیرکەری دڕ بیٚ. فڕۆکەی لەعنەتی بەعسی تا پازدە و هەتا بیست و سی، سپی و ڕەش و ئاویلکە . بۆر لە عاسمانی کورد، نۆر بە نۆر، گڕ دەڕێژن، دەسووتێنن، دەستی پیسان دەوەشێنن، بێبەزەوی، لەسەر زەوی، دەسووتێنن، بەرز و نەوی، کۆماخەلە و داهاتی ساڵ، گەوڕ گەلە خان، کۆخومال، دارو گەڵوپووش و پەواو، بە قومەلە و بوومی ئاور، بەدەستووری بەعسی گاور. بوونە دەستەچیلەی ئاور. کیٚ دەتوانیٚ لە ڕۆژێدا چەن قەدەم بڕوا بەڕێدا، تەیارە دەوری لێنەدەن، وەبەر گوللە و بۆمی نەدەن، کوردستانی پانی عێراق، ببووە گۆشەی شین و مەراق، بەڕۆژگاران چۆڵوهۆڵ بوو، ئەوی بەرچاو بوو هەر گڕ بوو تۆزوخۆڵ بوو، لەدەنگی بۆم گوێچکە پڕ بوو، ئەشکەوت و کەلێن و قوچبن، بێشەلان لە ترسی دوژمن، لە ژنوژاڵ و منالی ورد، لە پیرەپیاو لە گێڕ و کۆڵ، لەکۆچ و باری شل و شۆڵ، لە ئاوارەی هەرێمی کورد، وەکوو دەریا داوەستابوون، بێسەروسەدا وەستا بوون، کوردان لەوبارە وەستابوون، چاوەڕوانی شەوی ڕەش بوون، شەوە قەلای مێر و شێران، شەوبار دەکرا بەرەو ئێران، بەرەو مەرز و جێپەسیوان، بەرەو لاپاڵ و نەدیوان، حاسمان شەویش هەر بەگەڕ بوو، بە نرکەی فڕۆکان کەڕ بوو، فڕۆکە وەك داڵی لاکی، شەو دەگەڕا جووتە و تاکی، لەچۆلەچرا و ئاوری سیغار دەچوونە سەر کلك وەك مار، وەك سەگی هار، وەك باب کوژاوی دەم بە خوێن، ئەو جیٚ ئەو شوێن، دایان دەکرد بە نیشانە، گیانە و گوللەی لیٚ میوانە، سیغارکێشان بەشەوی ڕەش، هەتا بەربەیانێکی گەش، لەهەر خێڵیٚ لە هەر هۆزیٚ، لەهەر جێگە پەنا و کۆزیٚ، قەدەغەی

دەنگی دەستوور بوو، دوور لە یاسا و لە شعوور بوو. کوردان چەمی شەڕ دەزانن، گاڵتە بەدژ لەوان جوانن.

زۆربەی شەوان بۆ گاڵتەی دەم بیرەخەوان، لاوێك دەڕۆییە لاپەڕان، دوور لەڕێگە و جێگە گەڕان، ئاورۆچکەی لە دوو سێ جێیان، هەڵدەگەڕان وەك جیّدێیان، فڕۆکە پێیان دەزانی، مرەمڕ تا بەیانی. بە تۆپ بە بۆم بە سارۆخان، لەهەر لاو هەر بارودۆخان، لێیان دەدا، هەرکات و سات، ئەویان تەواو با ئەودەهات.

زۆر شەوان ئەو گاڵتە باو بوو، بەرەو چاو بوو، زاخاوی مێشك و هەناو بوو، لەشکر لەخۆی ناڕازی بوو لە پەلاماران بەزیبوو، سەرگەرمی جێگا سازی بوو، بۆ دیفاع لە خاك و ئاوی، لە نامووس و دەنگ و ناوی، لەپێش دەمی تانگ و تۆپان. لەهەر دەشت و تەرت و لۆپان، بیّوچان و خواردن و خەو، هەڵنەدەستان، بەڕۆژ بەشەو، هەرچی کوڕ بوو، خاوەن بڕ بوو، تێکەڵ گر بوو، تێکشکێنی تانگی زڕ بوو، هەرچی جادە و شیو و خڕ بوو، لە لاشی بە عسییان پڕ بوو، دەیان سریەیان لیّقڕ بوو، قەل و داڵ بەلاکیان مڕ بوو، لۆری شکاو تانگی سووتاو، چەك و چۆڵەی لە کار خراو فڕیّ دراو، لەکار نەکراو، خوار و بار، خواردەمەنی سووتەمنی، چەکی دووربیندار و بیّسیم، دەواودەرمان دوو جێن سیّ جێن، گەلیّ فیشەکی جۆراوجۆر، بەتا بەبار سندووقی مۆر. بەجیّمابوون لە جیّ شەڕگان، لەبن بەردۆکە و جیّقرگان. ببوونە دەسکەوتی شۆڕش، لێیان تێکچوو جێژین هێرش، یابا و تەعالیان لیّتێکچوو، سەرومالێیان مالّوبالیان، بەرنامەی خێو و خەیالیان، ئاواتی لەمێژین سالیان، کەوتە گێژاوی فەسالیان، شەل و پەت هەلاتن، بەزین، لە خوێن گەوزین، تەسلیم تەسلیم یابوو یابوو، لە حەرەس قەومان پەیدا بوو، لەناو پێشمەرگەی بارزانی، بوو بە شایی شادمانی، دیل و ئەسیریان ریز کردن، چەك و چۆڵەیان بارکردن، حەواڵەی لاپەڕیان کردن. هێرشی بەعسی، قۆڵێك نەبوو، چەن جادە و چەن دۆڵێك نەبوو، لە حاسمان و لەسەر زەوی، لەپیّ دەشت و بەرز و نەوی، لەهەموو هێل و شوێن و وریّ بەتانگ، بەزیل بە ڕەوتی پیّ، ویستیان، کوردستان چۆلگە بیّ، بۆ عارەبان جیّمۆڵگە بیّ، کورد دەنگ و باسی نەمێنیّ، ڕیشەیان لەبن دەربێنیّ، ڕاستە «چ ماست بیّموو نابیّ»، هەموو ڕوویەك بۆ ڕوو نابیّ، بیشەی بەبیّ چەقەڵ کەمە، ئاوری بیّدووکەڵ حەستەمە.

شۆڕش فسۆسی لێنابڕێ، جارجار دەدا و جارجار دەخورێ، بێبڕوایە بەرچاو تەنگە تێناکۆشێ، ئازار بدرێ خۆ دەفرۆشێ، ترسەنۆکە مێشك بۆشە، شەڕەف دەفرۆشێ بە قۆشە. خۆفرۆشان لەچەند لاوە، بۆ لای سەددام بایانداوە، ئاسۆسیان[1]دا بەخاروبار، دەربەندیان فرۆشت بەدینار، قوا خاسە و جەیش و جاش، سیریەك لەپێش و یەك لەپاش، دێلان پێشیان بۆ چۆلکردن، لە کوردستانیان مۆلکردن، چوونە سەربەرزایی ئاسۆس، جەیش و جاشی خوێڕی و فسۆس، بەیارمەتی زڕ و زۆلان، جەیش گەیشتە سەرقۆلان، بەسەد حیلە و فێلّ و گزە، داگیریان کرد قەلادزە. شۆڕش وێکهات و کشاوە، کەوتە ناو شاخان ئاژاوە، عەڕەب قازن پێبەقوونەن[2]، کوڕی ئەفتاوە و مەدوونەن، لە شاخی شاخیان شکاوە، باویان خاوە، بە وشتەیەك بڕووسکاون، تێکشکاون، کەوی کولاون، عەڕەب شاریان هاتەوە دەس، هەڵبەز هەڵبەز، خۆشی خۆشی، بوونەوە ئەز، بوونەوە گورگی مەڕ و گەز، بە کەیفی خۆیان لێدەخوڕن، دەخۆن دەخوڕن، دەبڕن، دەدڕن، ناموس لە ناموّیان دەکڕن. نەیانزانی تا بارزانی، لەسەر بەرزان وەك سەربەرزان، سەرۆکی کوردی هەژار بێ، دوژمن دەبێ بریندار بێ، شەو بێخەوبێ، نەچیری پێشمەرگەی ئەو بێ. هەر لەناوقەدی شاریدا، لەژێر باری نابارێدا کوڕە کورد قۆلّیان هەلّمالّی، شەو دوژمن و ڕۆژ خۆمالّی، پارتیزانی بووژایەوە، چرای سەددام کوژایەوە، حەرەس قەومی لێیان قەوما، نەبزەیان پێما نەخەوما، کوڕە کوردی بە دەستوبرد، لەگەلّ پێشمەرگەی بە بیر ورد، سەرهەلّقەنەیان دروست کرد. لەهەر کووچە و جێگە خەوان، لێیان بوونە مۆتەی شەوان، لێیان دەدان دەیان کوشتن، خوێنیان ڕشتن، دەست و ئەستۆیان دەبەستن، زاق و زووقیان وێ دەخستن، جاشەکانیان وێكدەخستن، ئاخوڕەیان بۆ هەلّدەبەستن، کاو و جۆیان لەبەر دەکردن، بۆ نەمردن، لەنامەردان، لەهەموو شارۆکەی کوردان، سەرهەلّقەنە شەو دەگەڕان، لە شاریگە و لە لاپەڕان، هەر لاشە بوو بێسەر دەبوو،هەر سەر بوو لەپڕ دەپەڕان، سەددام زانی پیرۆز نییە، ئەو سەرکەوتەی خۆ کوژییە، سوودی نیە، هاواری کردە بارزانی بۆ وتووێژ، بۆ ڕێچارێکی یەکسانی، بۆ سولّحێکی دوورە هەرا، کورد

[1] ئاسۆس و دەربەند، ناون بۆ دوو شوێنی حەسساسی شۆڕش.

[2] - پێبەقوونە، بالندەیەکی ئاوی بێبالە.

و عەرەب ببنە برا، شەڕ و پێکدادان بیٚکەڵکە، سوود و بەرهەمی بۆ خەڵکە، کورد و عەرەب لە کۆنەوە، دوانەیەکن، شەریکی داهاتی یەکن، بە پانەوە لە عێراقا وەك برابوون، خاوەن ماف و بیروڕابوون، عێراق بێشکەی هەر دوو لایە، لەوێوە شەڕ ناڕەوایە، بیٚشەڕ بیٚداوا بەشداربن، کورد و عەرەب برا و یار بن، باشەڕ بەس بێ، وتوویٚژ چەکی مەبەس بیٚ، لەوخاکەدا کاکی یەك بین، دڵسۆز و دڵپاکی یەك بین، بانگەوازی حاجی و ڕێوی، گەیشتە شار گەیشتە دیٚ، تەقە ڕاوەستیٚ جیٚبەجیٚ، دەدریٚ ماف داوای بەجیٚ.

## شەڕ وەستانی وەستایانە

سەرۆکی کوردان، بارزانی، ئەو داوایەی بەهەڵ زانی، بە بەڵێی وەڵام دایەوە، دوبارە شەڕ وەستایەوە، لاوی ماندوو حەسایەوە، کورد و عەرەب لەشاری کورد، درشت و ورد لەگەڵ یەکا بوونە برا، کووچان چرایان ویٚخرا، بوو بەشاری برایەتی، کوردایەتی ئازایەتی، دەنگی بژی کورد و عەرەب، جارەیٚ بەدڵ، چەن جار بە گەپ، بوو بە وێرە بوو بە بژیو، بۆ ساویلکانی گەڕ نەدیو، بوو بەخۆشی و بادەنۆشی، چەپڵەلێدان. بەڵام بارزانی دەیزانی، حاجی ڕێوی لەسەر فێڵە، ماتەی بۆ جووجەڵەی وێڵە، دەیەویٚ عەشرەتان بدوێنیٚ، شەقڵی نامووسیان بشکێنیٚ، پارە و دۆلاریان لیٚبار کا، شۆڕشیان پیٚ نالەبار کا. بیانکاتە گویری دوو ئاخوڕ، نامووس شڕ و ئاخوڕ پڕبن، سیخوڕ و خۆگەز و دڕ بن، دێڵە کوردیش ئەوەی دەویٚ، پارەی دەریٚ، چۆنت دەویٚ وا دەخەویٚ، پارەی زۆرە ئەو دەورەی دیوە، ئەو ڕاوەی نیوە بژیوە، پارەدار لای وایە پارە، بۆ ئەو لوقمانە و ڕیٚچارە، بەڵام نەخێر ڕۆژیٚ دادیٚ کوڕ و کیژی شار و لادیٚ، دێنە سەرپیٚ، پیٚدەگرن، ڕێی پیٚدەگرن، کۆشکی لەبن دەڕووخێنن، بەپارەوە دەیسووتێنن، دوایی بە هەموو شت دێنن.

## کوردستانی ئێراق ئەودەم

کوردستان بە بۆم سووتابوو، بڕووسکابوو، چاڵ و کەند و هەڵتەکابوو، کەموکووڕی لەهەر لاوە، چنگی لە شاپەڕی دابوو، بارەبار و کۆچکۆچی کورد. بەرداوبەردی درشت و ورد. خەڵك تامەزرۆی پشوو[1] بوون، ماندوو نەناسیش ماندوو بوون. ناسیاو نەناس، خراو و خاس، قوتە و قۆیتاس، لایان خاس بوو، شەڕ بووەستێ، بۆ پووشوویەك، دەرچێ لە گیانان تەزوویەك، بازان بچنەوە ڕەوەزیان، بە پەرچەم و بسك و کەزیان، هەڵومرێنن کوڵ و دۆیان، دەرد و خەمی دەم وەڕەزیان، بچنەوە گیان لالەخەوان، گەرمە گەمەی نیوەشەوان، گراوی خۆیان بێتە مێزێ، دەم دەم بگرێ خەم داهێزێ، شادی لە نوێ سەردەرێنێ، گیان بفرۆشێ، ماچ بستێنێ، هەڵوەدا وردە پەرچەمان، دەگرێ قاڕێ جووتەی مەمان، کۆنە خەمان فەرامۆشکا لەوماوەدا عەیش و نۆشکا، بەداهاتووی خۆ دڵ خۆشکا، تا چل شەوێ شەڕ ڕاوەستا، تەقە وەستا، شەکەتی دەوری دەگەڕا، لاوان باویان دەبەر گەڕا، دەستی درێژی دلێران، گەیشتە سەرپشتی شێران، یارمەتی گەرمی جیهانی وەڕێ کەوت، فریا کەوت بۆ بارزانی، چی بەسوودی ژینی خەڵکە، بۆ شۆڕشان جێگەی کەڵکە، تێر و تەواو گەیشتە جێ، بەڕێووجێ، بەش بەشکرا، بەشداران بەشیان پێدرا، قات و قڕی کەموکووڕی، چەپڵەیان لێ‌تەقان، فڕی، کوردستان جارێکی دیکەش، لە جوانیا هاتەوە کەش، گوندۆکە و شارۆکە و بازار، بوونەوە بێشکەی بێ‌ئازار، بەغدا و کوردستانی بەخوێن، لەسەر چەن خاڵ و یاڵ و شوێن. چوونە سەرباری وتووێژ، بەتام بێ‌تام، کورت و درێژ، تەفرە فریو بێ‌تام و چێژ، زاڵم سوڵحی پێوەنایە، ئاشتی بەلاوە خەتایە، بەڵام بۆ تەفرەقەچێیە، بەوری خاوەن دەست و پێیە، پێوەدێ دەم ببزێوێ، دەهەنگێوێ.

---

[1] «پووپوو»ش هاتووە.

## شۆڕش خۆی دەپالێوێ

شنەی شۆڕش سروەی مێژوو، چ دێر چ زوو، خەرمانی شۆڕش هەڵداوێ، کلکە و زیوانی دەرداوێ، چەت و دۆڵی وەلادەنێ، ژێر پێی دەنێ، شۆڕش لە توولەگ دێتەدەر، بەگ و زۆردار و جاش و کەر، خوار و خێچ و چەوت و خەنۆک[1]، ڕێوی و دەڵەك، کوڕی پارە و فێڵ و کەڵەك، باریان هەبێ خۆ دەنوێنن، شەرەف خۆیان دەشکێنن، بۆ تۆزێ ژین کەمێ ئارا، گەلیان دەفرۆشن بەپارە، زاڵمیش بەو ڕاوە فێرە، هەر بەوەش زاڵە نەبوێرە، ئێمەش هەر بەوە فەوتاوین، سەرنەکەوتوو بێباڵ ماوین، زەرنەقووتە و کەوی کوڵاوین، لێرەولەوێ، لێبڕاوین، هەڵبڕاو و بەجێماوین. لەماوەی ئاشتی و ئاوربەس، داوای ڕەوانەهاتەدەس، بەڵام سەددام گوردی خۆی گرت، لەدێز و دێڵ و زۆڵە کورد، وەکۆی کردن وەخۆی کردن، لەشۆڕشگێڕی هەڵبڕین، بەپارە نامووسی کڕین، بەرەو جاشیەتی لێخوڕین، لەدێز و دێڵ و ترسەنۆك، هێندێك عەشیرەتی فسۆك، وەلاکەوتن بۆ دژ خەوتن، بەزین گەوزین لەگەڕ کەوتن، شۆڕشی بارزانیان جێهێشت، بۆ پووڵ بۆ خەو بۆ نان و چێشت، چوونە بەغداییە بوونە کەر، بۆ میری بوونە بارەبەر، میریش هەر ئەوەندەی دەوێ، کوردان لە یەکتر هەڵبڕێ، ڕۆژ و شەوێ، بەشەڕیاندا پێکیاندادا بێناویان کا لێر و لەوێ، شۆڕش مەحەکی خستەکار، وەلای خستن دزێو و خوار، دووڕوو و ڕووکەش، بێکێش و کەش، پیاوی بەفێڵ، لاوی ڕووڕەش، هەرچی دەمەوەر، بیانوو گر، نەبان، بەیچەڵ، خۆدز، خۆگر، وەبەر تفی مەحەك کەوتن، لەناو شۆڕش وەدەر کەوتن، شۆڕش مێروو بژێر کرا، خڵتە و پڵتەی لێلابرا، کۆمای شۆڕش بێگورگە بوو، هەرچی مابوو، پێشمەرگە بوو، کوردی بڕاو بەرەگە بوو، وێنەی بەرچاوی مەردی بوون، سوێندخۆری خاکی کوردی بوون، خاوەن ورە و هێز و مەچەك، ڕۆبوونە چەك، سوێندخۆری، خوێنی گەلانن، پێشمەرگەی تەرت و تەلانن، لە جەیش و جاشان دڵپڕن، بە ئەزموون و سنووربڕن، شێری مێشەڵان و لانن، تا سەربەستی چەك دانانێن.

---

[1] «خەنەك»یش هاتووە

## بارزانی (قەڵای خەبات و لێزانی)

سەرۆکی شۆڕش بارزانی، گیانی پتەو بۆ لێزانی، چاکی زانی، دوژمن لەپای ئاوربەستا، چی لەدڵدا لە مەبەستە، کام تەڵە و داوی بەدەستە. بارزانی نووسراوی دەرکرد، دەشتی بەپێشمەرگان چۆڵ کرد، ڕیزی لاوانی قۆڵ قۆڵ کرد، بنار بوونە زیندانخانە، نووسینگە چوونە ئەشکەوتان، بۆ زیندوو بوون بۆ نەفەوتان، تۆپچی چوونەوە سەر تۆپان، لەبەرزایی یالّوپۆپان. وتوویژ، لە مەڕ ئاوربەست، بێ بەرهەم ڕاوەستا بێ‌هەست، بێ‌تەلیان لەبارزانی کرد، تەل بەدەستی پێشمەرگەی کورد، وتیان بەغدا هەرچەند دوورە، لە بێ‌سیمیان هەر هەرایە، چەق و لوورە، بڕیارە هێرشێ بێنن تەڕ وشکان بسووتێنن، زیل و دەبابە بێن بۆمان، بکوتن جادە و پەرچ و چۆمان، دەستێکی وا بوەشێنن، کۆز و کولانان بڕووخێنن، ڕیشەی کوردان لەبن بێنن، کورد نەمێنێ. بارزانی پەیامی دەرکرد، سەرکردەی کورد وای ڕاگەیان، نامە و بەیان، سەرە ڕێگایان خاڵی کەن، پێشمەرگان لەیەك حاڵی کەن، بێ‌ڕاسان، بێ دەغدەغە بن، بێ تەقە بن، لەنەدیو سەنگەران، بگرن، پێش بە جەیش و جاشان مەگرن، با بێنە پێش لوقمەی چەورن، عەرەبی کراس درێژن، بێ‌باڵ، کەرەوانەی لێژن، خاروباری زۆریان پێیە، عەرەب لە شاخی بێ‌پێیە، چیان هەبێ درشت و ورد، دیارین بۆ کورد، بە کۆڵێك خێر و بێر هاتوون، تەماڵی ڕۆژی داهاتوون.

### لە بەغداوە

لە بەغداوە، چی حەساوە، بۆ گەڕ بۆ شەڕ، بۆ ئاگردانی و شك و تەڕ، بۆ تێکدانی دێهات و شار، بۆ قەلاچۆی کوردی هەژار، لەتۆپ لە بۆم لە خومپارە، لە تانگ لە تانکێڕ، تەیارە، چەکی دوورکوژ، ئاگرپژێن، سەنگەرشکێن، زەندەق تۆقێن، تاقمی عەسکەر بەکرێ‌گیراو، قوا خاسەی سەرلێشێواو، بەرەو کوردستانی بەرچاو، پێ‌هەڵگەڕان، بۆگەڕ بۆڕاو، وەك چۆمی خوڕ، تۆفی لافاو، هەتا گەیشتە بنگەڕان. تاگەیشتنە قەلادزێ، تا ڕانیە و ئەوبەری زێ، تا شارۆکەکانی بنگەڕ، جێگای لەگۆڕنانی بەدفەڕ، تەقە نەکرا لە چەکۆیان، بێ‌بەش لەهەر ڕووش و دەردان، تا گەینە نێو تەرت و بەردان، لێی دابەزین، لە خۆڵ گەوزین، کورتان بە پشت و شان بەزین، لە تەپۆڵکان، لە جێ‌مۆڵگان، لەبێ‌ڕاهە و لە جێ‌چۆڵگان. بوونە مڵە و جرجە کوێرە، عەرزیان

کۆڵی، لەویٚ و لێرە، قەڵا و سەنگەریان هەڵبەستن، تۆپی گەورەیان دابەستن، تروتۆپیان وەڕیٚ خستن، بەخەیاڵ و خەونی خۆیان، کوردستان ئاخوڕەیە بۆیان، لایان وابوو کەس نەماوە، پێشمەرگەیان لیٚتۆقاوە. تیٚنەگەیین درشت و ورد، بوونەتە مەتاڵ بوونە نچیر بۆ کوڕی کورد، بۆ پێشمەرگەی بە دەست و برد، هەر ئەورۆ ئەوڕۆیان ماوە، لەمێژە گۆڕیان کەناوە، ڕێگەی هەڵاتین تەنراوە، پاش و پێشیان لیٚگیراوە، بۆ کویٚ دەچن بۆکویٚ هەڵدێن، بچنە پەڕ پەڕۆکەی هەوران هەر وەبەر دێن هەروەبەر دێن. پێشمەرگە شیریان بۆ دەسوون، چاوەڕێی دەستووری سەروون، کاکە سەرۆك لە زەنگیدا، بڕیاری باری جەنگی دا، عەفلەق جێیان پیٚ لەق دەبیٚ، دەست و دەمیان واڕەق دەبیٚ. چەك و چۆڵان لەجیٚ چۆڵان، لەنێو مۆڵان، بەجێدێڵن، لە ئاستی پێشمەرگە دێڵن، تەسلیم تەسلیم دێتە گۆڕیٚ، بەعسی ورەی هەڵدەچۆڕیٚ، وەك دۆڕاوە هەر دەدۆڕیٚ، لەو پیلانەش بیٚبەش دەبیٚ، بۆ هەمیشە ڕووڕەش دەبیٚ.

## شەوێکی ڕەش

شەوێکی ڕەش، ڕەشتر لە هەش، لەسەر بڕیاری ڕوون و گەش، پێشمەرگەکان دابەش دابەش، بەرەو هێرەش، بەرەو هەڵمەت، بەرەو شانازی کوردستان، وێڕا هەستان، بەبیٚ وەستان، لەڕۆژئاوا لە خۆرهەڵات، لەدیٚ لەشار و سەرقەڵات، لەخاکی کوردستانی کورد، کوردی ئێراق درشت و ورد. بە بڕیارێکی ڕێکوپێك، لە کاتێکی دیاری کراو، بۆ هوجووم و شەڕ دامەزرا، بگرەوبەردە مەرێك مەرێك، برکەبرکی لوولەی چەکان، ورەی پێشمەرگەی بەتەکان، سەنگەری دژیان هەڵتەکان، هەڵتەکا بوو دڕی گەڕان، بەرەو شکان زڕ وەرگەڕان، دەرپێیان لەپیٚ داماڵا، بوونە پەڕۆی داری ئالا، بەبای پێشمەرگە لێكهاڵان، سەروماڵیان بوو بەتاڵان، تۆپ و تفەنگ و زریٚپۆش، سیپە و سەنگەر، کەمینی بۆش، بۆم و سارۆخی فڕۆکان، سوودی نەبوو بۆ فسۆکان، فسۆك خۆی بۆڕانەگیرا، هێندیٚ کوژرا، هێندیٚ هەڵات هێندیٚ گیرا، زەبری هجووم گورچووبڕ بوو، سوپای بەعسی لێكبڕبڕ بوو، چەقەڵ بەلاشەیان مڕ بوو، زیلی خاروباری گورگان، کەوتە ژێردەستی پێشمەرگان، پێشمەرگەی ماندوو و تۆزاوی، برسی توونی لەش خوێناوی، سیٚ ڕۆژ سیٚ شەو، بیٚنان و ئاو، بیٚچۆرت و خەو، دەس بەچەك تێکەڵ بەگڕ بوون، دوشمن بەزێن کورد و کوڕ بوون، شێر و پڵنگی ناو شەڕگەن، خاوەن خەت و شوێن و برگەن، تین و تەنگانە نەناسن، هێن لاوخاسن، بۆ سەربەرزی ئاو و خاکی،

پێشکەش دەکا خوێنی پاکی. پلانی بەعسی فەشەل بوو، تانگ و عەڕابەیان شەل بوو، لە جادە و لەپەنا دێیان، لە کۆمەڵگە و لە لاڕێیان، لەزۆر جێیان، نەبوێرابوون، گشت پێکرا بوون، پێشمەرگە چیتری دەوێ، هەر سەرکەوێ، هەر سەرکەوێ، بۆی ئاواتە، نانە پێخۆرە خەڵاتە، دوشمنی هۆزی ڕەپێنێ، خۆبنوێنێ، بەعسی ئەو هەلەش هەڵە بوو، تووشی شەداو و تەڵە بوو، ڕەداو کەوت، زەبری پێشمەرگەی وێکەوت، عەسکەر بەرەو بەغدا قاشتی، جاش دەشتی و جەیشی داشتی، کەر گەوزێنیان داگیر کرا، کوردستانیان پێچۆڵکرا. بارزانیش گەلێك ڕازی بوو. ئاڵا هەڵگری قازی بوو. قەولی گورگی لا بازی بوو. هەل و دەرفەتی دەناسی. خەبات بۆ وی شانازی بوو.

ماڵئاوا: ڕاوچی ساردەکۆسانی

## پاڕانەوە

بە ناوی تۆ خودایە دادەبەستم — دەرووی، بیر و بناوانی مەبەستم

بەزەی تیشکت نەکا ڕۆشن هەناوم — زەین‌کوێر و نەزان و تێ‌شکاوم

دەسم نەگری لە نێزیک و لە دووران — بەبێ شک دێمە ڕیزی بێ‌شعووران

بەزەت نەڕژێتە ناو تەبعی کڕاڵم — بەیار و بێ‌کەشە، وەرزی خەیاڵم

خووا هێزی وەها، باوێژە وێژەم — بە یادی تۆ، بنازێ، نازی چێژەم

بە عیشقی تۆ، لە گوڵدا بێ‌بەرووبووم — لە تۆڕا بێ، هەچی نەمبوو، ئەوی بووم

پەسندی تۆ سەر و تاجی قەڵەم بێ — تکەی فرمێسکی گەش، باجی هەڵەم بێ

لە تۆڕا بێتە دەستم، تۆ بناسی — بە عیشقی تۆ حەماسی بم حەماسی

ئەتۆناسی مەحاڵە هەر وەکوو هەی — هەموو نەخش و کروکارت، دەڵێ هەی

بەهێزێکی بناخەی بێ‌گڵ و قوڕ — بە تۆسقاڵێ، دڵی چووکی لە سڵ پڕ

بەهێزێکی، شل‌وشۆڵ و بە تاوان — بە شۆقی عەینەکی سەرباری چاوان

بە ڕیشی بۆز و چاوی کەم بەرووبوو — بە زەینی کۆڵ و کوێر و کەم دەمودوو

لەمەڕ تۆوە دەبێ چ بڵێت حەماسەم — ڕچە و ڕێ بێ، بەرەو تۆ بێ پیاسەم

بڵێ ئەی ڕانەڕی، هەر دوو جیهانان — چرا ڕادێری دێری ڕێ نەزانان

هەبووی و هەردەبیت و هەردەمێنی — هەچی بوون و نەبوونە، تۆی، هەوێنی

سەری سووڕماوە هۆزانی جیهانان — لە سووڕانی، زەوین، و ئاسمانان

بە کۆمەڵ، کۆمەڵێ مانگ و ستێرەن — سەدان کاکێش و بورجی بێ‌ژومێرەن

یەکێ بێ‌نوور و یەک تیشکی دەڕێژێ — یەکێ ئاوا دەبێت و خۆ دەنێژێ

بە مەیلی تۆ دەڕۆن و یانە لە سوێن — بە ویستی تۆ نە دەشکێن و نە دەسوێن

هەموو فەرمانبەری باری ئەلەستن — شەو و گوردێکی ڕێک و پڕ مەبەستن

تەعالەللە لە فەرمان و لە داوات — هەموو ئەسپاردەیە کاری سەماوات

لە تەقدیر و سپێراوت بەدەر نین — وەکوو مە، شەرمەسار و سەرلەبەر نین

لەژێر دەریاوە دەریایە کروکار — لە شاکارت کش‌وماتە کەس‌وکار

گەرووی وشك‌وبرینگە، هۆش و دانش — لە زانایی خوای زانا بە دانش

خوایە بۆ خوایی تۆ گەواهن — هەچی بەر چاو و بن پەرچ و پەناهن

بە هەر قەست و مەبەستێ ئاشنا تۆی — لە هەر ترس و هەراسێ جێ پەنا تۆی

خوا کوردێکی بێ‌هێز و کەساسم — نەزان و ڕێ‌نەزان و تۆنەناسم

کەموو کورتێکە کورتەی خوێندەواریم — چ بەر چاو و بەرەو باوە هەژاریم

لە خۆ تووڕە و بەرەو گۆڕ و نەخۆشم — نە تۆم ناسیوە تا ئەوڕۆ نە خۆشم

دزێوی دەستوداوێنی گوناحم — بەرەو بەخشینی تۆ دەخشێ تەماحم

خوا بێ‌ناوی ڕووداوی قەزا نیم — شەق‌وشەمزاوی گێژاوی نەزانیم

لە بسپێرت بەلاساری کلا بووم — لە زەلکاوی ڕیادا بەربەلا بووم

لە وەرزی کردەوەم، دیارە کە پووچم — کە بێچارە و بەتاوان و بەسووچم

لە ئەژنۆم داوە بەردی بێ‌فەڕی خۆم — بەرەو دەرکت ئەوا هاتم کەل‌وکۆم

خوا ڕاوچیم و کوردی خۆولاتیم — دەسم ئەگری بەرەو چاڵی نەهاتیم

چ بەرچاوە لە کۆمەڵ دا کلۆڵیم — لە کۆمەڵ هەڵبڕاو و ڕوو لە چۆڵیم

لەبەر بادایە شەمعی بێ‌نەواییم — بەرەو تۆیە دەس‌ومستی گەداییم

گەدام و بێ‌نەوام و بێ‌پەسیوم — لەناو ژەنگی نەفامیدا ڕزیوم

لەشی لەرز و سەری پیری بەتاوان — بە هەر دوو دەس لە قوڕ دەگرم لەتاوان

بەرەو دەرکت ئەوا هاتم خودایە — لە دەرکت ناهومێد نەبووە گەدایە

دەرمکەی ڕوو بە کام جێگە بەڕێ بم — لە تۆ بەولاوە بێ ڕو، ڕوو لە کوێ بم

خوا «ڕاوچی» گەلی کوردی بلاوم — بەرەو گۆڕێکی ناگۆڕ و دڕاوم

بەرەی کوردێکی بێ‌خێو و هەژارم — تەرەی نەردێکی نەردێنی نەیارم

بەرەو قاپی بەزەی تۆ دێم و هاتووم — لەدەس کرداری نابارم هەلاتووم

بە بەخشینی خوایی تۆ حەساوەم — بەزەی تۆ دەمگرێ ڕوون و گەشاوەم

گوندی مووسەکی . کوردستانی باشوور ١٣٤٥

**پەشیمانی**

تـــەرەی خـــەون و خـــەیاڵی نالـــەبارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

لـــەڕ و بـــێڕوو لـــە ڕووتـــا شەرمەســـارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

کـــز و بابردەڵـــە و ســـووك و چـــرووکی چـــرگەنی ژیـــنم

تەڵاشـــی دەم خـــوڕێنی بـــێبـــوارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

شـــەمی بـــێ پیـــوی بـــاڕۆگی شـــەوی تـــاریکی هـــەنگاوم[1]

مـــەلی ئەســـتۆ شـــکاوی جـــێ شـــکارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

لـــە زەلکـــاوی نەزانیـــدا قـــومی کـــردم خـــودا چـــبکەم؟[2]

هەڵـــەی چـــەوت و چـــەوێڵ و نالـــەبارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

لـــە بـــن بـــاری ڕیـــا، کـــۆڵ و کڵـــۆڵ و کۆڵـــە کـــوتراوم

دەســـم نـــەگری کـــەلاك و کۆڵـــەوارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا[3]

پـــەل و پـــۆ هـــەڵوەریوم، ڕووتـــەڵۆك و ڕوو لـــە پـــاییزم

وەکـــوو شـــینکەی کراڵـــی بـــێ بـــەهارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا[4]

تەمـــەن مـــەی پـــڕ لـــە ژاراوی گونـــاهی کـــردە نێـــو کاســـەم

فەقـــەت ڕێبـــازی تۆیـــە ڕێگەچـــارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

بـــەرەو قـــاپی شـــەفاعەت وا بـــە بـــێڕوو، شـــین و ڕۆڕۆمـــە

پەشـــیمان و پەشـــێو و تۆبـــەکارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

بـــە «ڕاوچـــی» خـــۆم بناســـێنم و یـــا ترســـا و ســـڵ بێـــژم:

لـــە ئـــاپۆرەی گـــەلی کـــوردی هـــەژارم یـــا ڕەســـووڵەڵڵا

١٣٧٣/٥/٢ . گوندی ترکاشە

---

[1] ئاواش نووسراوە: پەڕی زەردی هومێدی ڕاپەڕ و هیوابڕاوم من

[2] ئاواش نووسراوە: شەمی دیوانی ئەشقی لێ وەبەر با دام و خنکاندی

[3] ئاواش نووسراوە: دەسم نەگری کز و کۆم و کەلاکم یا ڕەسووڵەڵڵا

[4] ئاواش نووسراوە: وەکوو شینکەی بەیاری جێکراڵم یا ڕەسووڵەڵڵا

## بزەی شۆڕش

تاکو گڕ نەگرێ سەری دوند و گەوان
تاکو خوێن نەڕژێتە ڕێگە و ڕێڕەوان

تاکو شادی تووشی جێ گۆڕکێ نەبێ
تاکو شیوەن، سازی هەڵپەڕکێ نەبێ

تا شەوی زاوا، لە شەو ڕەشتر نەکەن
تا بەروبوو، دێم و بێکەشتر نەکەن

تا نەبێتە لایەلایە، شینی شەو
تا لە خەو نەبڕێ، کوڕی نێو لالەخەو

تا بە خەم بۆسۆ نەبێ، کووز و کولان
تا بە خوێن بۆژۆ نەبێ، تەرت و تەلان

تا نەسووتێ بەرهەمی چینی هەژار
تا نەبێتە دیل و بەندی، خوێندەوار

تاکوو نەشکێ جمجمەی پشتی بژێو
تا بە بێکورسی بە شەو، نەگری هەتیو

تا نەناڵێنێ وەکوو یەك ساخ و شەل
تاکوو کوێنی ڕەش لەبەر نەکرێ بەگەل

تا تەقورەو، ڕێڕەوی نەگرێتەبەر
تا بە شەو پیر و جدەو، نەکرێنە دەر

تا شەمی شیوەن بە کۆمەڵ هەڵنەبێ
تا ڕەش و سوور و سپی تێکەڵ نەبێ

کەی «بزەی شۆڕش» دەبزوێنێ دەمار
کەی دەماری گەل دەڕاسێ بۆ نەیار

کەی کوڕی کورتەك لەبەر دەچنە سەران
کەی دەس و خەنجەر دەڕاسێ بۆ سەران

کەی بە سۆزی خۆی دەنازێ، هۆزی قۆز
کەی دەس‌وچەك چەك‌دەکا دەستی بزۆز

کەی گەلی بێبەش دەڵێ زیندووم و هەم
کە ی دەبێتە، خاوەنی دەست و قەڵەم

هەر دە مێ، دەستودڵ و قۆڵ و مەچەك
خۆبەخۆ، بۆ سەربەخۆیی بوونەیەك

هەر دەمێکی تێگەیشتوو، تێگەیین
مێرمناڵی خاو و نوستوو، پێگەیین

ئەو دەمی، دەبڕێ لە گەڕچی، فرتوفێڵ
سیخوڕ و سیخورمەچی، دەکرێنە دێڵ

ئەو دەمی، کورتانی خوارە گەل فرۆش
فیکە هەی دێی لێ دەکا، لاوی بەهۆش

ئەو دەمی، ڕیشە لە ڕیشەی دێتەدەر
کلکی دەبڕێ، کلکەدار و زۆڵە کەر

شڕ دەبێ بەیداخی زوڵم و شۆر وشەڕ
شل دەبێ، شەڵواری هاروهاج وگەڕ

قڕ دەبێ خێڵی قڕە و قیرە و پلان
کڕ دەبێ زرمەی، تەلاری میروخان

نۆبەهاری هاتی کۆمەڵ، دێتە ڕوو
ڕیشەبڕ دەکرێ، گەڕی زوقم و کەڕوو

دیل و لاوی بەندکراوم دێنەوە
ئەشکی خەم بێخەم لەڕوو دەسڕێنەوە

دیل و بەندی دێنەوە، بۆ هەڵبەزین — هەڵبەزینی ڕۆژی دوژمن پێبەزین
بولبول و گوڵ دەبنەوە میر و وەفا — شوان و بێری، دەچنەوە پێگەی سەفا
ئەی چ خۆشە سەردەمی دژ تێشکان — بێنە شایی گوێبەگوارە و چەکبەشان
دەستی دیلانێ گرێ دەن کیژ و کوڕ — شایی سەربەستی بگێڕن، گەرموگوڕ
کورتەک و بەرموور و خارا پێکەوە — لێکدڕین و هەڵخولێن و بێنەوە
خرمەخرمی بازن و خرخاڵی قوڵ — ساز و پیک و دووزەل و دەنگی دەهۆڵ
شاعیر و شێعر و سرودی، ئەی ڕەقیب — بۆ بڕینی دڵ، بە دڵ، ببنە تەبیب
بێتە شایە، هێمنی ویرانە ماڵ — دووگەڕم بۆ هەڵپەڕێ تادێتە حاڵ
روو لە ساقی کا بڵێ، دۆ بێنە بۆم — شاعێری پیری هەژاری، دوورە دۆم
دۆیە، هەتوانی خەم و دەردی بەتین — «بۆ منی بابردڵەی گردەنشین»
دۆیە بۆ هێزی دڵ و باوی بەدەن — «بۆ منی ئاوارە و دوورە وەتەن»
دۆیە دەرمانی خەم و دەرد و کەسەر — «بۆ منی پیر و کەنەفت و دەربەدەر»
ساقیبیا، وا بادەوە دۆ بێنە دۆ — بۆ منی ئەستۆشکاوی ڕەنجەڕۆ
با مڕووی بشکێ دەم و لێو و گەرووم — شاعیرێکی هەردی کوردی بێدەرووم
دۆم دەوێ، دۆ بێنە دەستی چرچەڵەم — شاعیری پیر و گەش و بێکۆتەڵم
دۆم نەگاتێ، مەرگی شێعرم پێدەگا — شێعری تەڕ بمرێ، گەلم کەی پێدەگا
دۆ حەرامە بۆ کوڕی لاپان و زۆڵ — دەستی نەگری کیژە کوردی نەرمونۆڵ
کیژەکوردە واوەرە لێم لامەدە — دوورە من پەرچەم بەرە و دژ بامەدە
باوەڕت بێ دژ، دژە نابێتە یار — کەی بەرەو متمانە، دەخزێ توولەمار
باوەڕت بێ من کوڕی کوردی گەشم — شاعیرێکی دەرکراوی بێبەشم
ماڵخراو و دەرکراوی ئەو سەدەم — دڵدزاو و هە نگواوی ئەو سەدەم
شاعیری تەرت و تەلان و بەربنم — ئاشقی ڕەوتی کچۆڵەی خڕپنم
واوەرە، جوانێ، بەرەو من، جەم جەمێ — خەم بە بادەین، لێک ڕەبادەین دەم دەمێ

روو لە من کە، لامەدە بۆ لاپەڕان[1]
دۆ حەرامە بۆ جڕ و جۆنگ و گەڕان

ئەو کەسەی بێ دۆ، نەبووبێ ڕۆژ و ساڵ
ئەو کەسەی ڕاوی نەنابێ بێ فەساڵ

ئەو کەسەی نەیچەشتووە تاڵی خەبات
ئەو کەسەی ڕێگەی نەکەوتە زەردوتات

ئەو کەسەی جێگا خەوی نەچووە تەلان
لێینەسووتاوە بنە و کووز و کولان

ئەو کەسەی بێکەس نەما لێرە و لەوێ
نەیگەزیوە مار و دووپشکی شەوێ

ئەو کەسەی بۆ چاری هۆزی چارەڕەش
ڕوومەتی نەڕنیوە، ئەشکی سوور و گەش

با نەبێ ئەو زۆڵەکە، دۆی بۆ چییە؟
خۆگەز و زیانیخورۆ ڕۆی بۆ چییە؟

سەرمەڕی، زگگورگە، گورگە مەڕ نییە
بێفەڕ و فیتە، فسۆکە ــ فەڕ نییە

دووزمان و دوودەم ودو سێ سەرە
لەم بەرێیە، لەوبەریشە، دەم کەرە

بێبڕست و پووڵپەرست و پووچەڵە
پێکوڵە، دڕکە، بزارە، هەژگەڵە

زڕپەرست و خۆنەویست و خۆگەزە
حەیتەیە، کەربابە، بێپیو و بەزە

خزمی دووپشك و مڵەی ڕیشەبڕە
خۆفرۆشە، خۆگەزە، سفرەدڕە

چی بەدەم دابێ، بە سوودی خۆیەتی
دەمکەرێکە، کەی دەفامێ، خۆیەتی

خت فسی پێویستە، کتکی، زیانییە
خت[1] کرێ باشە، کەمانی چا نییە

بتهەوێ چا تێکەوی ڕێوی دەغەڵ
«راوچی» لێزانی[2] دەوێ ڕاوی چەقەڵ

«کار هر بز نیست خرمن کوفتن
گاو نر میخواهد و مرد کهن»

بێژە ڕاوچی بێتەوە بۆ قیل و بیل
ئەو دەزانێ کێهە قرتە و کێ لە بیل

ئەو دەزانێ کێیە ملهوڕ و کێهە دڕ
کێ چنۆکە، کێ فسۆکە، کێیە کوڕ

بەهاری ٨٠

---

[1] سەرپەڕانیش هاتووە.

## دەروێشە کوڵکە

دەدەی دەروێشە، بۆم لێدە دەف و نەی
دەداوی پەردە بادە، بادە با بێ
لە دوورەنگی دەرم بێنە دەسادەی
بە لەیلم بێژە ها وێستاوە مەجنوون
هەناوم وشکە، زۆنگم کا بە بادان
دڵم ژەنگی هەڵێناوە دەسادەی
لەژێر پێی مەیفرۆشی‌دا فڕێم دەن
دەدەی دەروێشە بۆم بێژە بە مەستی
لە ترسی چی دەترسی زووکە مەی چی
شەوە، کووکەی ڕیا بڕە لەمەولا
دەدەی دەروێشە کوڵکەی کۆڵە کەشکۆڵ
دڵم دەربێنە، وەیشۆ پاك و خاوێن
لە تەکیەی پاکی هاوێ، دەس بە داوێن
مژۆڵی جادەمالی، پیری ڕێ بێ
گلێنەی پڕ لە مەی نووری سینا کەن
زمانی دووزمانی ڕیشەبڕ کەن
لە خەڵوەتخانەدا، خاکی ئەوین بێ
مەکۆی فرمێسك و شێواوی، گوڕوو بێ
سەری با پردەبازی ڕێی گوزەر بێ
بە ناڵینی شەوی هەڵبەست و بەستەی
فەلەك یەك‌یەك بەجێ بێڵێ بە یاهوو
لەبەر تیشکی حوزووری حەزرەتی حەق
برام دەروێشە «ڕاوچی» بێ بەرووبووم

مەی و ساقیم وەسەر گێڕە بەیاحەی
تراو و تفت‌وتاڵ و سادە با بێ
بڵێ ساقی بەرەو من بێ بە مەی مەی
گلێنەی چڵکنم پڕ کا لە مەی ڕوون
خەلاسم کا لە ژەنگی، خۆ بە بادان
وەرم گێڕە بەرەو مەستی بەرەو مەی
غولامی پیری مەیخانەم، کە ڕێم دەن
بڵێ مەستیم دەوێ حاشا لە هەستی
دز و قازی بە خەو مەستن لە مەی چی
چ دەخوازی، دە بخوازە لەمەولا
وەلا وێنە لەشی شۆڵ و دڵی چۆڵ
ڕەوانەی کە بەرەو پیری بلاوێن
بەرەو پیری موغان بێ‌پاك و خاوێن
بە پیری ملکەچی، مەیگێڕی وێ بێ
گرێپووچکەی پڕوپووچی ڕەها کەن
لە مەی عیشق و ئەوین، داوێنی پڕ کەن
لەسەر خۆ بێ، کوڵ‌ودۆ بێ، بەشین بێ
لە پشتی پەردە بڕوانێ بەڕوو بێ
بەرەو ئەڕواحی بێ‌لەش ڕوو لە سەر بێ
کەوی کا، جوبرەئیل و دارودەستەی
بەرەو لاهووت و بەزمی یاهوو یاهوو
وەڕازێنێ گەشنەی بەزمی ئەنەلحەق
بە های‌وهوو دەسم نەگری لە دەس چووم

١٣٧٢/٨/٥ . ترکاشە

---

[1] لە نوسخەیەکدا: ڕاو کرێ باشە کەمانی چا نییە.

[2] لە نوسخەیەکدا: ڕاوچی ڕوناکی دەوێ....

## زەنبیل

زەنبیل دۆڵێکی باریك و تەریك و قاقڕ و زوورکانە، چەن کیلۆمیترێ لە بۆکان دوورە و لە باشووری ئەو شارە هەڵکەوتووە. یەکێ لە عاریفانی ڕێبازی سۆفیگەری(نەخشی) بە ناوی حاجی سەید عەبدولکەریم، ماڵۆکەیێکی لەو دۆڵە دا پێکەوەنا و بە ناوی شێخێکی تەریقەتی «نەخشبەندی» داوای لە هەموو چین و کۆڕێك کردووە کە بێن تۆبە بکەن، ڕێباز و شێوەی سۆفیگەری، ڕەچاو کەن، دەس لە چاوەچاوی تەما و تەجاوزی ئەم جیهانە بێ‌وەفایە هەڵگرن. لەو کاتەوە زەنبیل بوو بە قەرەباڵغ و ئاپۆرەی خەڵکی وەسەرگەڕاو، بوو بە کابەی ڕازونیاز و جێگە و پێگەی چلە و ڕیازەت و هوولەی دەروێش و نووکەنووکی سۆفی ڕیش پان.هەربۆیە ویستم یادێ لە زەنبیل بکەم و ناوی بڕێ لە شێخەکانیان، لەناو هەڵبەستا، هەڵبەستم و دوارۆژیش قەزاوەتی خۆی بکا و لەسەر مەسەلەی عیرفان و سۆفیگەری چ دێژێ بێژێ.

دڵم تا کەی بە دونیا دڵ دەبەستی هەتا کەی شێت و پێت و تێ‌نەوەستی

لەناو لەشدا هەتا کەنگێ بە بازی بە سازێکی نەسازاوم دەنازی

تەمەن ژینی بە بـا داوی، دەزانی؟ کەچی هێشتا سڵۆسڕك و نەزانی

نەزانی تا بەکەی بەسیە بە خۆ بە وەشۆ شۆکەی هەڵە و سووچت بە تۆبە

هەتا شەو مات و بێدەنگ و سریوەن هەتا دەرمان و چارەن، ئەشك و شیوەن

هەتا شەو مات و بێدەنگ و غەراوەن هەتا دەرکی نزا، بۆ دڵ کراوەن

هەتا شەمعی ئەویـنداری لە گۆڕێن هەتا ئەشکی پەشیمانی دەچۆڕێن

هەتا میوانە خورپەی ئاشقانەو هەتا چاوی لە خەو دایە بەهانەو

هەتا لاشەت نەبەسراوە بەرەو گۆڕ هەتا گۆڕت نەکەنراوە تەڕوتۆڕ

هەتا نەچناوە قسنێ بۆ پەلوپۆت هەتا شینکاڵە نەڕواوە لە گڵکۆت

هەتا نەپساوە تاڵێ ژینی خاوت هەتا لاشەت نەدرواوە لە جاوت

بەرەو تۆبە و بەرەو زەنبیلی ڕابە لەمەولا یادی مەولا کە و بڕابە

مەکەی ڕازونیازی دڵ لە ڕێگەن نیازی دڵ لە ئەو جێگا، بە جێگەن

شیفاخانێکی خاکی کوردەوارین دەواسازێکی سازی ودمی بارین

دەدەستی دڵ لەوێ بگرە بە پیران ببە ڕێ‌مالّی ڕێگەی دەستەگیران

بچۆ سەر مەرقەدی پیرانی نوورین جونەید و بووتەڕاب و بشر و بەسرین

یەکێ عەبدولکەریمە و یەک حەکیمن
یەکێ نوورانییە و یەک شاعەلیمن

یەکێ سەید کامیل و میری هونەر بوو
لە هەندەریا، هونەر دەستی پکەر بوو

بە کامیل شاوە کامڵ بوو گوڕویان
وەکوو کۆ نوورە، مەڵبەند و مەکۆیان

ژومێرێکن لە نووری ڕوونی باری
بزێراون لە چڵك و چەوت و لاری

ئەمین و مەحرەمی ڕاز و سپێرەن
کەمەندار و کەمەنکێش و بەسێرەن

بلێسەی مەکتەبی نەخشی خووایین
لە نەخشی ڕێنومایی‌دا، بەبایین

مەپرسە مەکتەبی نەخشی لە کێوەن
لە کوێ نەخشی خودا ڕوونە، لەوێوەن

هەر ئەو هێزەی لە کێوی تووری نووریێ
عەسای مووسای کە کردە مارە سووریێ

هەر ئەو دەستەی لە تووریدا بە تیشکێ
وەسەر زەنبیلی گێڕاوە پریشکێ

لەهەر شوێنێ بەزەی خوا بێتە بارین
ئەویش تۆوێك و نوورێکی دیارین

لە ئاورگی گەڤ گاور بنۆڕن
دەزانێ حیکمەتی باری لە گۆڕن

چ ڕازێ بوو کە ئاگر بوو بە دووکان
خەلیلێکی خودایی بۆ نەسووتان

چ سەرشۆڕە سەری سەرداری گاور
خەلیلی پێنەسووتا هێزی ئاور

لەوێوە با بەباوەڕ بێ، دڵی گێل
لە پشتی پەردە هەن سەرخێڵ و سەرعێل

دەبا ئەو سا بەباوەڕ بێ بە پیران
لە زەنبیلم وەگێڕە، چەن نەزیران

بڵێ دەروێشی لێیە ورگن و کر
لەگەڵ ئاگر بە شەڕ بێ شڕ دەبێ گڕ

هەموو دەروێش و سۆڤ دەم بە جادوون
کوڕی ناو ئاگر و کوڕی هەیاهوون

کە دەروێشێکی کوڵکن بێتە ڕاسان
دڵی ئاگر لە ترسان دێتە تاسان

لە هەر شوێنێ خەلیلی شێخی زەنبیل
بهوولێنێ بڵێ یا پیری زەنبیل

بە سنگی ڕووت و هێزی یاهوویاهوو
وەکوو جادوو، لە ئاور دەبنە جادوو

دەبێ گاور وەسەر خۆکا قوڕ و خۆڵ
کە ئاورخۆرە دەروێشی فشوفۆڵ

دە «ڕاوچی» ڕاوە بەتاڵیکە لە ڕاوت
وەپێچە پێچەك و تۆڕ و شەداوت

وەکوو سۆفیلکەیێک سۆفییە خاوێن
هەموو سووچت، بە یاهوو با وەتاوێن

١٣٧٣/٧/١٥

# شینگێڕی:

**شینی مامۆستا هەژار**

یادێك لە مامەوستای بزان و بلیمەتی کورد لە قەرنی بیستەمدا، هۆنەر و وەرگێڕی ناوداری گەلی کورد و مامەوستا هەژاری موکریانی.

بۆ هەمیشە زیندوو لە ناو دڵاندا، هەروا دڵدار و خۆشەویست.

رۆژی رەشـــی کـــوردە، بـــێ هـــەژاری
شـــانازی بـــەوی بـــوو، زانیـــاری

تیـشکێکی خـودا بوو،هاتـە سوێمان
دەنگێکـــی فریـــشتە بـــوو لـــە گوێمـــان

پێنوسـی بـزۆزی ئـەو بـوو ڕاسـا
نووسـراوە بـە کـوردی بوونـە یاسـا

کـوردێکی رەشـید و مـیر و بـز بـوو
هـاودەنگی فـەقیر و چـینی کـز بـوو

شـاکاری بنووسـی ئـەو دیـارن
بـێزبـڵ و زیـوان و بـێبـژارن

بـۆ بەڵگـە جزیـرە یـا خـەیامن
هـۆی ژیـری هـەژارە وا بـە تـامن

هەرچـەند کـە خـانی خـۆی خـەنی بـوو
شـانازی بزانـی خـۆی تـەنی بـوو

ئـاوڕێکی هـەژاری لێـدراوە
خـانی لـە جیهـانێ دەنگـی داوە

جـوانی مـەم و زیـن کـە وا دیـارن
شـاکاری بنووسـی ئـەو هـەژارن

ئـەو بـاخی گـوڵانی بـۆ ڕوانـدن
جێـژوانی دڵانـی پـێنوانـدن

ئـەو شـینی ئـەوینی دابـەزینێ
هێنایـە ترۆپکـی دڵتـەزینێ

هـۆزان و بـزان و خۆبوێـژ بـوو
سـەربەرز و بـەپێز و بـێکرێـژ بـوو

لـەو ڕابـوو کـەلاوی کـوردەواری
شـیرنایی وتـاری[1] کەوتـە زاری

ئەو بوو بـە هـەوێنی «کورتـە باسـان»
رێنووسـی بـە کـوردی بـۆ مـە ناسـان

کـێ هەسـتێ مەبەسـتێ دابڕێـژێ
لـەو ڕایـە، چـلۆن و چـی دەوێـژێ

[1] ئاواش هەر هاتووە: چوارینەی وتاری....

هەر مانگێ کە دێتەدەر لە شەودا — رووزەردە، لە ڕوونی، ڕۆژی ئەودا

ڕووناکی، بەیان و گیانی ڕوونی — پێشکەش بە بەیان و گیانی ڕوونی

ئەی خۆزگە ئەمەش وەکوو هەزار باین — وەرزێکی بەپیت و بێبژار باین

١٣٦٩/١٢/٢٥ . بۆکان

**شینی مامۆستا هێمن**

فەلەك ڕشتی لەسەر سوێگەی هومێدم، ماتەمێکی تر

وەسەر کۆما خەمی خستم، بەکۆ کۆما خەمێکی تر

لە بەختم ڕەوڕەوەی مێژوو بە سەد حەستەم لەرێدایە

بە حەستەم، حەستەمێ ببڕێ، دەگاتە حەستەمێکی تر

بە مەرگی هۆنەری کوردی موکریانی، قەزا دیسا

گوتی ها وەرگرە کوردە، بەلاشە وەرهەمێکی تر

لەسەر سوێگەی هونەر، هێمن شەمێ بوو ڕۆشنوهێمن

قەزا ماوەی نەدا بگرێ هەتا کوو سەردەمێکی تر

بەداخم حاتەمی باخی ئەدەب، باروبنەی لێنا[1]

مەحاڵە بۆ ئەدەب بلوێ وەکوو ئەو حاتەمێکی[2] تر

بە هەڵبەستت، برا هێمن، دەمێ مەستم، دەمێ هێمن

چ موحتاجم بە هەڵبەست و شەراب و زەمزەمێکی تر[3]

دەڵێی عیسا دەمە، دەست و دەمی«تاریك و ڕوون»ی تۆ

لە گۆڕت ئافەرینڕێژن هەتا دەم مەحشەرێکی تر

---

[1] - ئەم شیعرە ئاواش هاتووە: حەیدەری شاری ئەدەب .....

[2] - ... حەیدەرێکی تر

[3] - چ موحتاجم بە مەیگێڕ و شەراب و کەوسەرێکی تر

یان: چ موحتاجم بە مەیگێڕ و شەراب و مەیدەرێکی تر

دەبێ هەڵکەم شەمی ژینم لەسەر گۆڕت نەکا بێژی
لەسەر کێکی تەمەن هەڵناکرێ ئیتر شەمێکی تر
برا سوێی سەنگەری شێعرت بەجێهێشتن مەڵێ فەوتام
گەلێ «ڕاوچی» لە سوێی گۆڕت دەکوڵن سەنگەرێکی تر

١٣٦٥/٣/١٢ . بۆکان

## شینی سەید کامیل ئیمامی (ئاوات)

فەلەك نەیهێشتەوە بۆمان پشوویەك
لە دڵ دەچزێنێ هەر ساڵێ چزوویەك
گوڵوکی گوڵشەنی هێمن و هەژاران
بە ساوایی لە پای دەخرێ دڕوویەك
بزەی سەر لێوی خونچەی پێگەیشتوو
دەخاتە ژێر پەلاماری کەڕوویەك
ستێرەی ڕۆشنی کوردم بوێژن
ئەوانیش، ڕوو لە ڕۆچوونن لە دوویەك
نە هێمن ما لە ئارادا، نە ئاوات
خودا بۆ کوردی بێ‌ئارا، دەروویەك
شەمی شانازی کۆمەڵ بوو، شنەی ئەو
ئەویشت کردە قوربانی، بە فوویەك
بە کۆچی ئەو هونەرمەندە، گەلی کورد
دەڵێی بوونە مەکۆی شین و گوڕوویەك
پزیشکی شیوەنی خەڵکی دەترسم
بسووتێنێ هەموو خوار و سەروویەك
بەرەو باباو، شێخ مەحموودە کۆچت
لەمەولا بۆت نییە ترس و تەزوویەك
بەشێخ‌مەحموودی خۆت بێژە هەڵەبجەی
بەبێ هۆ، چۆتە ناوزاری زەروویەك
کەلاوێکە سکەی داری کەلی ئەو
بەعس بردوویە، هەر بوونونەبوویەك
لە بەرزایی ژیانی تۆ «ئیمامی»
نەبینراوە خەل و خەوش و گولوویەك
قوبوول نەکراوە «ڕاوچی» بۆ بەلاگێڕ
دەنا باریکترە[1] گەردن لە موویەك

خەرمانانی ٦٨ی هەتاوی

---

[1] یان: ناسکترە

**شینی مامۆستا حەقیقی**

چ قـەوماوە بـەبێ سازوسـەما، ماتـە سـەما دیـسا

مەگـەر چـی دی لـەبن سـەردا، دەس‌ومـستی قـەزا، دیـسا

بە ڕەش گیراوە ڕۆژی سوێی سنووری شاری بۆکانم

شـەکەر تاڵـە لەسـەر زار و زمـانی بـێ‌نـەوا دیـسا

لەسـەر کـوڵمی بـەڵا گـەزتوو قەتیـسە شـەونمی شیوەن

لەسـەر لێـو و دەمـی شـادی، وەری نازونـەوا دیـسا

لەسـەر بـاری کلـۆڵی شـاعیری ئـەم شـارە سـەربارە

چـزەی دەردی نـەتاراوی بـڕینی بـێ‌دەوا دیـسا

وەری بـەرگی گـوڵ و گـوڵ ڕووتەڵۆکـە، بولبـولی ڕۆیـی

پـەیامی مـەرگی هێنـاوە، لـە بـەختی ڕەش سـەبا دیـسا

لـە هـەر لاوە عەزایـە، شـیوەنە، ڕۆیـە، لـە خۆدانـە

وەبـیری خـستەوە شـینی حوسـەین و کەربـەلا دیـسا[1]

پسا بەنـدۆکی بـووکی گوڵ،سنەوبەر سەربەهەش‌ماوە

بـەرەو مـردن لەرێـدا، شـاعیری شـێعر و هـەوا دیـسا

حـەقیقی وێـژەری کـورد و زمـانی شـێعر و زانـایی

ئـەوە باروبنـەی لێنـا، نـەما ئـیتر تـەما دیـسا

دەڵـێن کۆچـی هونەرمەنـدێ وەکـوو کۆچـی گـەلێ وایـە

بـە مـەرگی ئـەو نیـشانیدا، جیهـانی بـێ‌وەفـا دیـسا

حـەقیقی تـۆ نـەمر مـاوی لـە مێـژوودا بـەرەو چـاوی

لەمـەو لا چـمکی لێزانـی گوڵـت پێـدا دەدا دیـسا

---

[1] یان: وەبیری خستەوە شین و شەپۆڕی نەینەوا دیسا

لــە مــەولا ئافــەرین دەڕژێ، بــە ژیــنی لاوەتــی تــۆدا

لـــە گۆڕیـــشا ســـڵاوت لێـــدەکا، بەســـتەی ڕەوا دیـــسا

حــەقیقی شــاری بۆکانــت گــەلێ دەرد و بــەڵای دیــون

بـــە کۆچـــی تـــۆ ئەونـــدەی دی، عەزابیـــدا بـــەڵا دیـــسا

لەگـەڵ دەسـتی قـەزا چ بکا دەسـی بـێهێـز و لـەرزۆکم

لـــە گوڵخانـــەی ژیـــانی تـــۆ وەشـــا دەســـتی عـــەزا دیـــسا

لە ڕاوچی چی دەوێ خەڵکی بە شینی چینی ئەو شارە

لەســـەر گـــۆڕی ئـــەدیبی گـــەل، بـــە کۆمـــەڵ فاتیحـــا دیـــسا

ترکاشە

**شینێ بۆ کاک برایمی ئەفخەمی بۆکانی**

ســـەما بـــۆ مـــەی بـــەبێ ســـاز و ســـەما جـــارێ ســـەما ناکـــا

ئـــەوەن بـــێدڵ دەژی جـــارێ لـــە ئـــازاری حـــەیا ناکـــا

بـــەڵای مـــەرگی بـــە گـــژ ڕاچـــێ بـــەهارێ بـــێبـــەڵا ناکـــا

ئەگـــەر ئـــەو بـــا بەدەســـتە، بـــۆ خـــەمی ئێمـــە بـــەبا ناکـــا

چـیە بـۆ مـەی بـەبێمـەیگێڕ و مـەی کـارێ ڕەوا ناکـا

وەهــا گورچــووبڕە، مــستی قــەزا، هەســـتی لـــە پـــێخـــستم

لـــە بـــارۆگی خەزانیـــدا، گـــوڵی گوڵـــدانی هەڵبەســـتم

هـــەناوی پـــڕ لـــە زووخـــاو و لـــە کێمـــە پێتـــەکی هەســـتم

لـــە دوو کۆچـــی کـــوڕی زانـــا هـــەموو شـــینگێـــڕە هەڵوەســـتم

ئەگـــەر چـــی شـــیوەنم چـــاری دەس‌وداری قـــەزا ناکـــا

لـە گـوڵزاری ئـەدەب هـەردەم، گـوڵێ بـێبـەرگ‌وگـوڵ دەکـرێ

بـــەرەو پێـــچاڵی گـــاگۆڕ و بـــەرەو گـــۆڕی بـــە گـــڵ دەبـــرێ

فەلـەك سـەرکارە لـەو کـارە، یـەکێ دێـنێ و یـەکێ دەمـرێ

یـەکێ خـاوەن سـەر و مافـە، یـەکێ خـاکی وەسـەر دەکـرێ

هـەموو کـاری فەلـەك بۆتـە بـەرەو بێنـە و جـەفا کاکـا

هومێـدم پـێ لـەدەس نـادا، شـەوی تاریـك و ڕۆژی زاڵ

دەس و ئـەژنۆم گـرێنـادا لـە یـەك ڕووداوی تفـت وتـاڵ

دڵـم ڕوونـە بـە ڕاسـانی کـوڕی قۆچـاخ و کیـژی کـاڵ

دەڵـێن ڕۆژێ دەبـێ لاچـێ، وەچـی ئـازار و دڕکودالْ

گـەلم ئـەو دەم جـلوبـەرگی عـەزاباری لەبـەر ناکـا

لـە شـاری تـۆ عـەزیزی مـن، هونەرمەنـدی هونـەر زۆرن

لـە ئـامێزی ئەدەبـدا، پێگـەییو کیـژ و کـوڕی مـۆرن

سـەدان «ئاسـۆ»[١] لـە ئاسـۆگی هیـوا بەشـدار و پـسپۆڕن

فەلـەك حەیتـە زەلامێکـە، خـەیاڵی بەیـچەڵ و تـۆڕن

زەلیلـی دەسـتی تۆڵـەی ڕۆڵـەکانی تـۆ دەبـێ هاکـا

کـوڕی زانـا لەگـەڵ زانـستە، زانینـە زەماوەنـدی

بـەرەو بـەرزی بەلـەز دەفـڕێ بـە شـاباڵی هونەرمەنـدی

لەسـەر پـشتی فەلـەك ڕۆژێ دەگـیرێ شـایی مەڵبەنـدی

دەڵـێ ئـازادی ئـازادە کـوڕی دیـل و کـچی بەنـدی

سـەدەی ئازادییـە، چـی دی فەلـەك کـاری خـەتا ناکـا

سـەری هـەودا درێـژە، چـی تـری پێـوە لـە دوو نـادەم

لـە ژێـر بـاری خـەما، ڕێگـا بـە چـڕنووکی گـوڕوو نـادەم

---

[١] مامۆستا سەعیدی نەجاری بۆکان «ئاسۆ»

هـــەتا هێـــزم لەبـــەر بـــێ، ڕێ بـــە ڕێبـــازی تـــەزوو نـــادەم

لـــە ڕێبـــازی ئەدەبـــدا گوڵـــچنم، ســـاتێ پـــشوو نـــادەم

دەس و مستی دەبێ ڕاسێ، ئەوەی ڕاسا و ڕێی پاکە

عـــەزیزم کـــێ دەڵـــێ مـــردی، نـــەما ئاســـار و ئاکـــارت

لـــە گوڵجـــاڕی ئەدەبـــدا، هـــەر لـــە گوڵـــدا، پۆلـــە ئەشـــعارت

هـــەژار و هـــێمن و ئـــاواتن کـــە هاوکـــار و هـــەوادارت

لـــە مێـــژوو گـــوڵ دەبـــارێنێ، گـــوڵی گفـــتی دەم و زارت

بەســـەر گـــۆڕی هـــەمووتانا، ببـــارێ ڕەحمـــەت و چـــاکە

لـە «راوچـی» چـی دەپرسـی چـی لـە دەسـتا سـەردەمی پـیری

لەســـەر پـــەلکی گـــوڵی ژیـــنی، فڕیـــوە بولبـــولی ژیـــری

عـــەجایب ئـــاش‌بەتاڵێکـــە لـــە مەیـــدانی فـــڕوگیری

بـــەبێ نێـــچیرە، جـــێگیرە، چ نـــاپێکێ دەس‌وتـــیری

لەمـــەولا بـــۆ مـــنی کـــەوتوو، دۆعـــا و فاتیحـــا چـــاکە

گوندی ترکاشە

**شینی زانای خواناس، مامۆستا مەلا عەزیز تورجانی**

لـەناو زۆنگـی خـەما، داری سـەدەی خـەم شین نەکـەم چ بکـەم

مـژۆڵی چـاوی کـز، فێـری کلـەی ئەسـرین نەکـەم چ بکـەم

فەلـــەك گـــۆڕی عـــەزیزێکم دەکـــۆڵێ کۆڵـــە کـــوتراوم

گوڵی سەر گۆڕی سـەرکەوتن، بە شین پـەرژین نەکـەم چ بکـەم

بـە کۆچـی تـۆ عـەزیزی گـەل، دڵـی کۆمـەڵ بریـنـدارن

کـە خـوێنڕێـژی لەسـەر زامـی دڵـی بـەبرین نەکـەم چ بکـەم

دەری دێنم، دەبێ دەربێ، بەبێ تۆ دیدە بڕوانێ
لە چاوی ناخونەکدار و دزێو و تۆنەبین چ بکەم
فەلەك دەستی شکێ، بۆچی شەمی هۆزی وەبەر بادام
لە داخی تۆ فەلەك، حاشا لە شۆقی ژین نەکەم چ بکەم
بەڵا، ناڵە و چڵۆزانی لە بن سەردایە، ناچارم
کە خۆم تووشی چڵ و ژان و گڕ و ناڵین نەکەم چ بکەم
شەمی بە گیانی تورجانم، کوژاوی بادەوەی مەرگە
لە تورجانی بەبێ گیان و لە گیانی بێئەوین چ بکەم
لەسەر گۆڕی هەموو ژین دۆڕەکانی گەل دەڵێ «ڕاوچی»:
کە هاوارێ لە سوود و بەرهەمی یاسین نەکەم چ بکەم

١٣٧٣/٢/١٤

**شینی خوشکە ژیلای حوسەینی: «سیمیناری ڕەشپۆش»**

لەسەر بستووی گەشی شێعری گەشم هاواری ژیلایە
لەشی پیت و وشەی وشکم کز و زاماری ژیلایە
سیمیناری سپی شاری سنەم، ڕەشپۆش و شێواوە
لە دەرکی کۆنگرەی داوە قەزای ئازاری ژیلایە
هەناسەی تاسەباری گەل، گوڵی شادی وەبەر بادام
هەموو پەلك و کەزێ دەڕنێ، کچی نێوشاری ژیلایە
بە خەم خنکا گەرووی بلوێری سەربێری کچی بێری
کە دیتی ڕووبەڕووی گۆڕە، گەرووی گوفتاری ژیلایە
دەسا بولبول بە خۆ دادە، چەپۆکی نۆبەرەی شینت
وەری بەرگوبەری باخی، سنەی دڵداری ژیلایە

دەسـادەی ئاویـەر، ئـاگر ببارێنـە لەسـەر شـێعرم

شـەوی شـێعرم، کـە نایـیسیٚ شـەمی ئەشـعاری ژیلایـە

بـە فرمێـسکی عـەزا شـاعیر وەڕازێنـە بـەهاری شـین

هـەتا گەشـتر وەبـیٚ شـینکەی کـەژی ئـەفکاری ژیلایـە

دەبگری کیژە کوردی دڵ بە خەم، تا خەم لە خەم بارە

بـە شـیوەن دێتـە سەرشـان و گـوڵی گـوڵزاری ژیلایـە

هەژارئاسا لـە کێلـی ئـەو بنووسـیٚ، نووسـەری کـوردی

کـە کێلـی گـەردنی کێلـە و شـەهیدە و نـاوی ژیلایـە

نەچـی «ڕاوچـی» بڵێـی ژیـلا لـە گـۆڕا بـیٚبەشـی کـۆڕن

دەقـی مێـژوو لەمـەولا، گوڵـشەن و بلـواری ژیلایـە

٧٥/٧/٢٠ . ترکاشە

## رۆڕی ڕەشی باڵداران

سەردەمێ دەمدەمی لاساری بوو — نۆبەرەی بەرهەمی چەکداری بوو
دەست و دڵ گەرمی پلانی چەك بوو — بۆرەپیاگێ لە چەکا وەك بەگ بوو
راو و ڕاوێچکە بە باو و بڕ بوو — چەپلەر و لاوی خەنەك، مەلکوژ بوو
کێ بە کێ، کەس لە کەس و کەس کەس بوو — ساچمەیەك بۆ مەلی بێکەس بەس بوو
هەر مەلێ بۆ کەژ و کێوی دەفڕی — ساچمەیەك باڵی فڕینی دەبڕی
پەلەوەر هەرچی دەمێ بینرابا — یانە بۆ ئاو و هەوایێ ڕابا
هەر لە ناکاوێ، تەقەی لێدەکرا — چی دەبوو نەکرێ ئەوەی پێ دەکرا
تینی باڕووتی دەم و دڵ ڕووتان — لان و هێلانی مەلانی سووتان
ئای چ قەوما لە مەل و زارۆکان — بوونە پارووی دەمی دەم لەرزۆکان
تەق و ڕەو بوو لە چیای باڵندان — چێ پەنا کەوتەوە پەرچ و کەندان
بێچۆ قازی فەلەج و زەڕناقووت — هەلۆدا مانەوە گشت ڕووت و قووت
کەو و کەوباڕی تەلان و شاخان — کورکوڕ و پۆڕی بنار و باخان
چوونە لای یەك، لە کوڵ و خەم، دڵ پڕ — شەل و شەمزاو و کەنەفت و کڕ و سڕ
کۆوە بوون خۆشبەز و جێبژۆێنان — چاوڕەش و ڕەشبەش و ملبەکوێنان
قەل مرا و قەل و قاز، پۆڕ و سی — تەسەل و تێر و پڕ و زگ برسی
کوڕ کوژاو و بەخەم و ئاوارە — رووتەڵ و بێپەڕ و پۆ و بێچارە
چێ مەلی ناوچە هەبوو گشتی هات — کۆنفرانسێکی هەژاری پێکهات
یەك دڵ و یەك دەم و بڕوا کۆ بوون — چەند هەزار تیرە بەڵام یەك کۆ بوون
پۆڕێ هەستایە سەر تریبۆنی — رایگەیان دەردی لە بنڕا کۆنی
وتی خزمینە ئەوەندە خاوین — بۆیە دژ دەست و دەمی تێناوین
لێرە بەو لاوە کە یەکتر نەگرین — هەر دەبێ لارەمل و کز بمرین
گۆڕ نەبێ دووبەرەکی وا بۆمان — ناسرێ چاوی بە شین و ڕۆمان
تاکوو بێڕێبەر و میر و شا بین — ئێستە هەر جۆرە دەبێ هەر وا بین
هەلە بابایێ[1] لە خۆمان جۆر کەین — وردە پەیمان و بەڵێنان جۆر کەین

---

[1] بابایی: گەورەیێ

با ئەویش خێوی مە بێ وەك خێوان
ناوی مەش گەش بێ لە نێوی نێوان

تەل بکا بۆ هەموو جێگە و هەردان
ڕاگەیێنێ خەم و کۆما دەردان

کۆمەڵی بەرگرەکان بدوێنێ
خوێنی ئێمەش بە کەسان بخوێنێ

لەبۆ چار برۆینە لای لێزانێ
هەڵۆیێ، کوندەبوویێ، باڵپانێ

پۆڕ وتەی هێندە بە پێز و پڕ بوو
چی گوتی هەروەکوو لەعل و دوڕ بوو

ئافەرینیان بەسەرا داباران
دەورەیان کردە گوڵ و گوڵباران

جێبەجێ یەکدەم و یەكڕێ ڕۆین
چوونە لای کوندەبەبوویی ئۆین

چوونە لای کوندەبوویەکی سەر زل
چاوزەق و بۆر و وڕ و خاوەن مل

چاو بە فرمێسکەوە گوتیان ئاغا
ئەی بە ڕووداوی چیا و شاخ ئاگا

خۆت دەزانی لە چیا چی دەکرێ
ژینی مەل چۆن و چلۆن ڕادەبرێ

تا تەق و تۆقی چەکی«ڕاوچی» هەس
تامی ژین بۆمن و بۆ تۆ چی هەس

بەو تەق و تۆقەوە دڵ تۆقیوین
بەو چەق و چۆقەوە هەڵچۆقیوین

ژینی مەل تاکوو بڵێی پێپەستە
ئێستە فرسەت کە لە دەستا هەستە

چارەزانی بە حاڵی مەی بێحاڵ
چارەسازی مەش ئەتۆی ئەی تیژباڵ

خۆ وەڕازێنە وەکوو لاوی قۆز
پێ بە پێ ڕێکەوە سا پێ پیرۆز!

ڕاگەیێنە بە لاوی پارێزەر
سەری پێواز و قونچکی گێزەر

هەستە ڕاسێنە گەلی فریاڕەس
خێوی مەل هەر بە تەنێ تۆیی و بەس

بێتو بتوانی هەلی وا ڕێخەی
کۆمەڵی بەرگرەکان، سەر ڕێخەی

بۆ مەلان تەرت و کەلان وەستێنی
مەچەکی دەست و چەکان بشکێنی

یەك پشوو، بێتەوە بەرمان تاوێ
بێ درۆ لێتی دەکەین جا چاوێ

بێتو وەستێنی وەتەنمان بۆمان
سوبح و شامی تۆ لەسەر ئەستۆمان

کوندەبوو کاتێ کە ئاوای زانی
تووکی قژ بۆوە لە بانی شانی

هوولەهوویێکی وەهای لێهەستا
کێو لە ترسانی دڵی ڕاوەستا

هاتە گوفتار و دەمی جوولاوە
سەد دڵی دڵ بە خەمی دڵ داوە

سەری دەندووکی لە سەر بەردی دا
ترس و سامی وە چیا و هەردی دا

ڕۆیە ناو مەرج و بەڵێنی پیاوان
قەولی وای دا بە گەلی داماوان

پێی وتن: گیانە بە گۆڕی بابم
بێتو بەو ئەرکەوە هەستم، ڕابم

یا دەبێ کفنی سپی بێ نوێنم
یانە ئازادی لەگەڵ خۆم دێنم

تا چیا تەرت و تەلانی مابێ
نیشتمانی مەیە، بۆ کەس نابێ

وەی گوت و دای لە فڕەی شاباڵی
روو بە مەڵبەندی مەحاڵی حاڵی

ڕۆیە ناو مێزی بەهێزی لاوان
کۆمەڵی بەرگری، هەرد و تاوان

ڕۆیە ژێر سێبەر و لای پسپۆڕان
جێ پەنای بێکەس و سرك و تۆڕان

ڕۆیە ناو خێڵی دڕ و فریاڕەس
ئەشکی چاوانی سڕی یەك دوو دەس

وتی ئەی خێڵی خودا پێداوان
جێ پەنای دڵ بەخەم و داماوان

پێمە ڕاسپێری لە هۆز و گەلی مەل
هەر لە پەرکوورەوە تا قاز و قەل

هەر لە ریشۆلەوە تاکوو بێڕیش
دەرکراون لە بەشی کار و ئیش

بڕبڕ و وازەپەڕ و ئاوارەن
بێبەشی چینە، لە کێو و پارەن

کێو و کەژ پاکی لە بەر بۆنی خوێن
کۆنە زامی دەمی کۆن و لە نوێن

بە چەکی ڕاوە، چەکی لاساران
لە چیا خوێنە، بە جێگەی باران

چەك نەکەن، بۆرە زەلامی ورگن
بۆ مەلان، داڵ و زەواڵ و گورگن

کوندەبوو بوو، وتەکەی باوی بوو
چەك کرا هەرچی مەلی ڕاوی بوو

تەل کرا لەو بەری ڕۆژئاواوە
بەس کری با لە چیا ئاژاوە

گیانلەبەر مەل بێ وەیا پێڕۆ بێ
چۆن دەبێ خوێنی گەشی فیڕۆ بێ

کێ لەمەو لاوە لە دووی ڕاوی بێ
خاوەنی دەست و چەك و داوی بێ

رستە داوێکی لە ئەستۆ دەکرێ
چی دەبێ نەکرێ، ئەوەی پێ دەکرێ

ئافەرین کوندەبوو بۆ ڕاوێژی
لە عەبا و مێزەر و بەردی نوێژی

چەك کرا چەکمە ڕەقی بێڕاوێژ
بەس کرا ڕاوە مەلی زیت و گێژ

چۆل کرا بن ڕەوەز و جێ ڕاوگ
هەڵکەنا، داوی بە پشت و خاوگ

هەر شکاربانە لە سوێی سێڕایان
چاوەچاویانە لە بەر بابایان

بێتو چەکدار و دڕێ پەیدا کەن
نیوگەزێکی بە گەزێ لێ ڕاکەن

ڕاوی هاوین بێ وەیا زستانێ
دەدرێ تاوانی بە دادستانێ

دادستان کردەیە، زۆر وەستایە
جیبی دەدڕێت و کرەی لێ نایە

کون دەکا کیسەدڕاوی ژینی
خوێ دەکا زامی دڵ و بەربینی

سەنەدی کاری وەها ڕادەگرێ
گۆشتی هەر بخورێ هەتاکوو دەمرێ

ئێستە باڵندە لە خۆبایی بوون — تێروپڕ گشتی ئوروپایی بوون
لە چیا بێ تەق و ڕەو، حاواوەن — خاوەنی گەرد و گوڵی ئەو تاوەن
کێ مەلێکی لە خەوێ هەستێنێ — یانە هێلانەیی لێ بڕووخێنێ
زوو دەکا ڕاوی بە داو دادستان — خوێنی دەڕژێ بە بێچرپە و هەستان
ماف بەرچاوە هەمووی حەیوانات — ژینی ئارامە، بە بێ سوور و سات
خاوەنی شاخ و هەرێم و ناون — دوورە شاڵاوی پەلانی ڕاون

## ئێمەی مرۆش

ئای سەد خۆزگە ئەمەش هەر مەل باین — خاوەنی بستێ هەرێم و کەل باین
بۆ مرۆش خۆزگە هەبا وێڵداشێ — نوێنەرێ، نامەبەرێ، سووورباشێ
بۆ بەرەی ئێمە ئەویش ڕێبەر با — بۆ سەری بێکەس و بێدەر سەر با
هەڵگری کۆتەڵی خوێناویمان — لابەرێ لەمپەری بێناویمان
بچێتە ناو کۆمەڵ و کۆمەڵگایان — وتەدارێژێ وەکوو زانایان
هەرچی دەردمان هەیە بیدرکێنێ — نووستووان پاکی لە خەو هەڵسێنێ
لێرە بەولاوە مرۆ ڕاو نەکرێ — دەربەدەر، بێکەس و بێدەر نەمرێ
عەنقەرەی تۆڕ و تەعالی بەغدا — ڕاو نەکەن ئێمە بە چەشنی دەعبا
شەڕ و شۆڕ، شڕ بکرێ یەکجاری — هێمنی بێتەوە ڕوو، بڕیاری
خێر خوا بێن و بە دڵ تێکۆشن — چی چەکوچۆڵە هەمووی بفرۆشن
پارەکەی بەرنە وڵاتی کۆکان — بۆ بەرەی سستە پەل و ناکۆکان
دانەوێڵان و خەڵەی پێ بکڕن — ئەشکی لاواز و کزی پێ بسڕن
سوور و ڕەش پێکەوە تێروپڕ بن — بێهەرا و گێچەڵ و مشتومڕ بن
خۆزگە ڕۆژێکی وەها بێتە سوێ — گەل بە بێ خورپە و بێخەم بنوێ
کۆنەداوبازی گەلیش تەنبێ کەن — داوزنجیری لە دەست و پێ کەن

٣/٥/٧٠. بۆکان

## «پەسنی خوا»

یا ڕازێنەری ڕازان     یا ئاگا بە نیازان

یا قەدیم و یا قەوی     یا خاوەن سەما و زەوی

یا ڕازێنەری سرتەم     یا تام و بۆنی ورتەم

یا هێز و پێزی پێیان     یا ڕێنوما لە ڕێیان

یا هەوێنی ئەوینان     یا مەلحەمی برینان

یا شابالّی خەیالّان     یا زانا بە هەوالّان

یا ڕازێنەری هەوران     یا گەورەتر لە گەوران

یا ئاگا بە زەمانان     یا حالّی لە زمانان

زمانم وا بڕاسیێ     ئەتۆ بە حەق بناسیێ

هێزیێ باوێژە، وێژەم     بە یادی تۆ بێ‌چێژەم

بە حەمدی تۆوە خامەم     بڕێژیێ ڕەنگی نامەم

باسم باسێکی وابیێ     بۆن و بەرامی چا بیێ

هەرچی لایەق بە تۆ بیێ     هەموو لە وێژەم کۆ بیێ

چەوت و هەلّەی خەیالّان     ئەمخاتە چۆلّ و چالّان

چیم گوت نیوە تەواوم     بێ‌تین و بێ‌هەناوم

بێ‌بەش لە هۆش و گۆشم     نە تۆم ناسی نە خۆشم

بە کام زار و زمانم     بتناسێنیێ بەیانم

کام وتەم بێتە زاری     لایەق بە تۆ بیێ باری!

لەو بارەوە نەزانم     لەنگ و لۆرە زوانم

حەمد و سپاس و ورتە     چی بێژم کەم و کورتە

گەورەتر لە تاریفی     بێ‌هاوتا و هاوڕەدیفی

ئەوەن بەهێز و قەوی     هەرچی بێژم، نە هەوی

خاوەن هەتاو و هەستی     بە تۆوە بەندە هەستی

قەدیم هەر بووی و هەر هەی
نەناسراوی وەکوو هەی
بەهۆش و گۆش و گیانی
روونی یەکی عەیانی
بەشەر نی، بیٚشەریکی
لە هەرچی هەس نزیکی
بیٚجیٚ و بیٚ مەکانی
لە هەر جیٚگە عەیانی
خاوەن سەما و زەوینی
بیٚچاو و سەر دەبینی
بیٚدلٚ و گویٚ بەهەستی
ئاگا بە هەست و خوستی
بیٚزارودەم، بە دەنگی
بیٚڕەنگ و ڕوو بەڕەنگی
هەویٚنی مان و بوونی
لە تۆ دووره زەبوونی
بە بوونی تۆ خوایە
سەما و زەوی گەوایە
بیرم لەویٚوه ڕوونە
بە تۆیە هەرچی بوونە

## «پرسیاریٚك»

خوایە کفت و زەبوونم
پڕ، پرسینە، دەروونم
لەو بارەوە بەزیوم
بڕووسکاو و تەزیوم
بیٚزیپك و زاتە هەستم
شیٚراوەیە مەبەستم
ناویٚرم ئەو پرسینە
باویٚمە دەر لە سینە
پرسیار بیٚتە زمانیٚ
خەلٚکی نەزان بزانیٚ
کوفرم لە پیٚ دەبەستن
نەزان و تیٚنەوەستن
پرسینی من، خوایە
داوایەکی ڕەوایە
دەرکی دەروون و بیرە
گەورەیە، گەرووگیرە
بیٚژم بەر لە جیهانیٚ
نەبوو جیٚگە و مەکانیٚ
نەبوو پەنا و حەشاریٚ
میٚروو، تیٚدا وەشاریٚ
نەبوو ئاو و هەواییٚ
نە فەلەك نەفەزاییٚ
نە بیٚلا و بەر نواییٚ
تۆ لەکویٚ بووی خواییٚ؟

که جێ نەبوو لە کوێ بووی — لە کام جێ جێبەجێ بووی؟

لە من ببورە باری — چیم دەرپەڕی لە زاری

پرسینە نەك مەتەڵە — نە لاڕێ بووم نە هەڵە

گورووی هەناوی زاڵە — درکاندنی حەلاڵە

بیرم لەوێوە گیرە — بێ سەرەدەر، ئەسیرە

کێ لەو بیرانە ڕۆچوو — سڕ بوو،تەزی، لە گۆ چوو

بیری ڕزیو و بوورا — چیبەچی بوو نەگوورا

زانین کوژاوە شۆقی — زانا زەندەقی تۆقی

پرسین هەر وەکوو خۆیە — وەلام بێدان و پۆیە

لەو پرسینە بەرینە — زەین هەر وا نەبینە

لەوێوە هەر چی وێژەن — بێتاموبۆن و چێژەن

وەلام هێشتا بەیارە — لاوازە ، کۆڵەوارە

نەزانراوە کە چۆنی — لەچی ڕایە بە بۆنی

زاڵێکی بێزەواڵی — گەورەتر لە خەیاڵی

لە خۆمەوە دیاری — کرگاری نادیاری

لە چۆڵوچڕ حازری — لە سەر کران نازری

بێهەوەڵ و ئاخری — سەما و زەوی ڕاگری

کام کر بە ڕەنگ و ڕوویە — کامەی درك و دڕوویە

کام کەس ڕووت و ڕەجاڵە — کامەی تەواوی ماڵە

کێ لە ڕکێ بەجێیە — کێ ژێر پلان و پێیە

کێ کوێر و کوێرەڕێیە — کێ خاس و ڕاستەڕێیە

کێ ژێر و خوێندەوارە — کێ کۆڵ و کۆڵەوارە

کێ دیل و ژێر تەنافە — کێ خاوەن بەش و مافە

کێ بەخت و باری گێڕە — کێ کیسەی پڕ لە زێڕە

هاتوون یا خۆ بەڕێوەن      چی وشك و تەڕ لە جێوەن

هەمووی بە ویستی تۆیە      چی هەرزە چی بە پۆیە

لە پۆشتە و لە هەژارت      سەردەرناچێ لە کارت

چ ناڕێك و چ ڕێکن      هەر دەس کاری کەسێکن

هەر وادەبێ وەبەر بێ      هەچی مەیلتِ لەسەر بێ

بە تۆم بیروبڕوایە      لێم ببورە خوایە

لە حیکمەتت نەزانم      کوردێکی بێ زمانم

راوچی بێ هێز و باوم      پیری پێوەند کراوم

کوردی ئەو خاکە پاکەم      بێ کروکاری چاکەم

کوردی خۆشی نەبینم      چاوەڕوانی بەخشینم

دەس بەتاڵ و هەژارم      بەرەو گۆڕە هەوارم

تاوان بە کۆڵ و بارە      کردەوەم نالەبارە

بۆی ناگوترێ زمانم      هێند بە گەورەت دەزانم

بێ کینە و قێزوبێزی      هێند بەڕوحم و بەهێزی

دەچینە ڕیزی خاسان      بەزەی تۆ بێتە ڕاسان

نامینێ، مل بە هەشمان      بەهەشت دەبێتە بەشمان

**«رانرانی سەما و زەوی»**

رۆژی بەری خوایە — نەبوو هەور و هەڵایە
هەستی نەبوو لە گۆڕێ — نە ڕامێ بوو نە تۆرێ
نە گیانێ بوو نە لەشێ — نە ماقێ بوو نە بەشێ
نە ساوێ بوو نە تەمێ — نە شادی بوو نە خەمێ
نە خەونێ نە خەیاڵێ — نە شیرینی و نە تاڵێ
نە سەما بوو نە زەوی — نە بەرزی بوو نە نەوی
نە دژ هەبوو، نە یارێ — نە گوڵ هەبوو نە خارێ
دەور، دەوری عەدەم بوو — بێبەش لە دەرد و خەم بوو
نە عامێ بوو نە خاسێ — نە کەس هەبوو بتناسێ
ویستت خۆت بناسێنی — جیهانێ وەڕازێنی
ویستت لەسەر بوو، باری! — ژین بێتە باری یاری
مەکووکت هێنا کران — سەما و زەوی ڕۆ نران
تەواو بوو سەما و زەوی — یەکێ بەرز و یەك نەوی
حیکمەتت هاتە کارێ — سەما و زەوی بە جارێ
یەك لە سەر یەك لە خوارێ — هەریەك بۆ ئیش و کارێ
راستەڕێ بوون، لە تۆوە — بە نەخش و تانوپۆوە
کورات چ کەم چ زۆرن — چ گەش یا ڕەش و بۆرن
چ نزیك، یا نە دوورن — بێشەوقە، یا بە نوورن
گڕن یا نە دووکەڵن — جیاوازە یا تێکەڵن
لەگەڕان یا لە جێوەن — بە ویستی تۆ، بەڕێوەن
چی لە ئاو و لە بەڕ دان — بە مەیلی تۆ لەگەڕ دان
کە تۆ نەبی بەیارن — شکاو و خێچ و خوارن
لە ویستی تۆ بەدەر نین — وەکوو مە سەر لەبەر نین

مەجبووری ﴿من تشایە﴾ | لە سەرڕا تا سەمایە
بوونەوەر، چی بە چاون | لە زەوی یا بناون
تان و کری لە تۆیە | هەرچی ڕایەڵ و پۆیە
«سبحان‌الله» لە هێزت | بێزیوانە، پەرێزت
زەوی مەیی، بە تاوێ | دەوری درا، بە ئاوێ
سەما بە «کفلەکوونێ» | تەواو هێناتە بوونێ
بوونە پێگەی مەلاییك | پەیکی بێباب و دایك
مەلەك بێلەش و لارن | بێدەم و لووت و زارن
نە زێڕن نە لە زیون[1] | لە چاوی مە نەدیون
بێسەر و بێسێبەرن | بێجلوبەرگ و بەرن
بێوەزن و کێش و پێون | نە نێرینە و نە مێون
بێڕەنگ و دەنگ و بۆنن | هەر خۆت دەزانی چۆنن
هێزێکی فەرمانبەرن | لەسەر سەما ئەسکەرن
بێفێڵ و بێکەڵەکن | کارگەری نێو فەلەکن
نەنێر، نەمێ، بەکارن | لە نووری نادیارن
ئەو بۆ ئێمە نەناسن | لەنووری ڕوونی خاسن
لێرە دایە دەوێژم | لە کارت کاس و گێژم
خوایە بۆ خۆت بسازی | بێئیحتیاج و نیازی
ڕانەری هەر فەلەکی | چ موحتاجی مەلەکی
مەلەکت بۆ چی هێنان | یەکەی ناوێکت لێنان
بۆچت هێنانە کایە | لە زەوی و لە سەمایە
بەپێی زەمانی هێنان | یەکەی کارێکت پێدان
یەکێ سەرکاری مەرگە | یەك هی پێلاو و بەرگە

---

[1] «زیون» هاتووە.

یەك هێز و تینی بایە     یەك سەرکاری هەوایە
یەك بەوری هەوری مەستە     یەك تووفانی بەدەستە
یەك هەڵگری بەهەشتە     یەك ئەمینداری گەشتە
یەك بەرپرسی عەزابە     خاوەن زەرگ و قولابە
یەك لە نێو بارەگایە     کاری حەمد و سەنایە
سوپاسی تۆ دەوێژن     وەك مە، نەکاس و گێژن
خوایە نەمان ناسیوی     لە فکری مە نەدیوی
مەلائیکەش نەناسن     لە زۆر جێ، جێگە باسن
باس سەری لێشێواوە     چ بێژێ ناتەواوە
مەلەکی بێڕەنگ و ڕوو     چ بوو، بۆ هێناتە ڕوو
چی فکری زەنگوزاڵن     لەوێوە لاڵ و پاڵن
کامە زانا بە نێوە     نەزانێکە لەوێوە
کێ بەهێز و بەباوە     لەو بیرەدا شێواوە
کێ فەیلەسووف و ژیرە     لەو بیرەدا ئەسیرە
ببورە لێم، خوایە     پرسین لە تۆ خەتایە
زانستی من بەحاڵە     ناسینی تۆ مەحاڵە
بێدەرەسەر لە کارت     نەناسراوە عەیارت
کەل و کۆڵە زمانم     ناتەواوە بەیانم
هەستە، کۆڵم لێنادا     ڕەنگە بمخا بە لادا
دەیەوێ سەر دەرێنێ     کەمێ هەستی بدوێنێ
(هەستی) بۆ هاتە گۆڕێ     لە گۆڕە، بۆ دەدۆڕێ
من چیم و بۆچی هاتم     هاتم بۆ شەل و ماتم
کە بۆ خۆم، خۆم هێنابا     نۆکەرم دەبوو ، شابا
هاتووم بەرەو کوێ دەچم     مەزن یا ئەستۆ کەچم

پێش هاتنم لە کوێ بووم   لە کام سوێگە بەسوێ بووم

ڕێگەم نییە بپرسم   لە سۆفیلکان دەترسم

دەنا دەمگوت خوایە   بۆ چیتە ئەم سەرایە

سەروبەر خۆت گیانی   چ موحتاجی جیهانی

جیهان بەتاڵ و پووچە   پێگەی تاوان و سووچە

ئێمە لەسەر جیهانین   سەر دەرنەچوو نەزانین

تەلاشی دەم خوڕێنین   مەرج و بەڵێن پەڕێنین

لەنێو ئەو ژینە تاڵە   بێتاوانی مەحاڵە

لەسەر ئەو زەوییە لارە   نەوس و هەواش بەبارە

هەنبانی نەوسی زاڵین   بۆ ئەو نەوسە، بە باڵین

چ سۆفی، یا نە غەوسین   تالانکراوی نەوسین

نەوس نەبا مەلەك بووین   خاوێن و بێکەڵەك بووین

نەوست لێ کەڵەك کردین   لێرە و لەوێشت کردین

نەوس زاڵە لەسەرمان   کووێنت کردۆتە بەرمان

تەما دەمی تێناوین   لە لاڕێدا گلاوین

خوایە خۆت و خواییت   بەهێز و پێز و باییت

هێزی باوێژە دڵمان   هەوا نەشکێنێ کڵمان

مێرێکی شێر و نێر بین   بەکەڵك و خێر و بێر بین

هەچی بوو لێرە ڕۆیین   لەو لاش مەمانکە ئۆیین

پیرە پیاوێکی خاوم   ڕاوچیم و چەك کراوم

بێچەك هاتوومە کایە   بەزێکی تۆم دەوایە

**«دروسبوونی ئادەم»**

ئەو سەرزەوینە جوانە
پڕ لە خانە[1] و کولانە

ڕۆژی بەرێ بەگڕ بوو
یا گاز و تەمی پڕ بوو

بێبوونەوەر، بێبەشەر
بێگوڵ و بەرگ و سەمەر

بێ کەشم و نەشم و کەش بوو
بێبەش لە سوور و ڕەش بوو

دانەر ویستی بەڕوو بێ
زەوی ڕەنگی لە ڕوو بێ

مستە گڵێکی هێنا
هەوێنی مەی لەوێ نا

کاسە قوڕێکی هانی
بۆ نەخشی ئاوەدانی

قوڕ بۆنی کرد بڕووسکا
ویستی لاوێ درووسکا

بەختی ڕەشی مەمانان
هەر ئەودەم و زەمانان

تێکەڵ بە قوڕ کراوین
هەر بۆیە قڕ کراوین

لە قوڕ کوڕێ دروس بوو
لاوچاك و جێ دروسبوو

لە قوڕ کوڕێ هاتەدەر
وریا، بەزەین و هەتەر

کوڕ هاتە وتووێژیان
زانا بە گش ڕاوێژیان

بەڕێ و جێ وتاری
زانا بە حەمدی باری

مەلائیك تێگەیشتن
بە خوایە پێگەیشتن

مەلەك چی بوون لە سەما
خوا پێی گوتن ئادەمە

سوژدەی بەرنە، بەر پێیان
شارەزایە لە ڕێیان

کوڕی قوڕ بوو بە ئادەم
باوەگەورەی بنیادەم

ئادەم گەرچی لە قوڕ بوو
لێزان و بەرزەفڕ بوو

لەسەرووی سەر فەلەکان
بوو بە گەورەی مەلەکان

مەلەکی نێو سەمایە
بۆ هەموو ڕەوت و ڕایە

بەبێ دەمار و ئۆیین
بۆ لای ئادەم دەڕۆیین

[1] «ماڵ»یش هاتووە.

ئادەمیش خۆی نەناسی     بێخەبەر بوو لە باسی

لای وابوو ئەو سەمایە     بۆ ئەوە تا هەتایە

ئەو کەشمونەشمە جوانە     بۆ ئەو تەرخانە، خانە

نەیزانێ ئەو بەشەرە     تەقەوڕەقەی لەسەرە

نەیزانی چی بەسەر دێ     سەری دەدرێ لە بەردێ

نەیزانی بێژانە سەر     ژینی بۆ ناڕواتە سەر

خۆشی تا سەر خەیاڵە     سەرکەوتنی مەحاڵە

ئادەم وەکوو پاشایێ     هەردەم بۆ تەماشایێ

دەچووە سوێی سیلە باخان     بێبەش لە ئاخوداخان

کۆسپی نەبوو لە ڕێگەی     بەهەشت کرا بە جێگەی

بابی مە لە بەهەشتێ     ماندوو نەبوو لە گەشتێ

هەنگوین و کەرە و ترێ     موفت و بێکرێ و جرێ

نەوسی کەیفی لە چی بوو     جێبەجێ بۆی بەزی بوو

وێڕای خۆشی بەهەشتێ     بابەدەم دەچووە گەشتێ

جاروبار خەم لەبەر بوو     ئاڵە و مۆتەی لەسەر بوو

خەیاڵ و خەم نەکاوێ     خۆشی دەخستە ئاوێ

نەیدەزانی چ باسە     بۆ هێندە گێل‌وکاسە

چی پێ دەوێ بەردەمە     نەیدەزانی چی کەمە

تاکوتەنیا بابەدەم     پەپوولێ بوو بەبێ شەم

بە بێدۆس و بێهاوەڵ     لە ژین، ببوو بە داوەڵ

داوەڵێ بێ پەرێز بێ     گەشتی، بە قیزوبێز بێ

ڕۆژێ لەدەم ئێوارێ     لەژێر سێبەری دارێ

دارەدارەی خەیاڵی     ببووە سەرباری حاڵی

تێنەگەیی چ باسە     بۆ هێندە کفت‌وکاسە

بێخەبەر چی لە پێشە  بۆچی بە ژان و ئێشە
نەیدەزانی خواوەن  چی بۆ دەخاتە هاوەن
مێیەك دەخاتە کایە  بۆ ئێمە دایکە وایە
نێری بێ مێ خەسارە  ژیانی ژارەمارە
بابەدەم لە بەهەشتێ  ماندوو ببوو لە گەشتێ
بە خەم گیانی تەزیبوو  وەك من لە ژین بەزیبوو
خەیاڵ دەستی دەباتێ  وەنەوزێکی دەداتێ
لە ناو وەنەوزە و خەما  حەمدی خوا لە دەما
راپەڕی وەرگەڕاوە  چی دی، لێی عەبەساوە
دیتی لە شانی چەپی  میوانە گاڵتە و گەپی
حۆرییە لێی میوانە  میوانی، جێگە، ژوانە
حۆرییە ڕوو بە خاڵە  ڕووخۆش و کوڵمە ئاڵە
رازاوە تازە بووکە  لێو قەند و دەم بچووکە
هەوەڵ بووکی جیهانە  دیاری، دەستی سوبحانە
پێشکەشی بابەدەمە  تەنیایە بێهاودەمە
جووتە لاوی نەناسن  مات و بێدەنگ و باسن
دوو نۆجوانی غەریبن  بێفێڵ و بێفەریبن
دایی و بابی بەشەرن  لە خۆیان بێخەبەرن
جێژنە، چێژنی ڕووانە  دڵ لە دڵان میوانە
شەم و پەروانە جووتن  توونی گەردنی ڕووتن
سێرەسێرەی ئەوینە  هەنگێوەیە بەتینە
دوو لاوی هەنگاون  تاساو و عەبەساون
دوو دڵ لە دڵ میوانن  شەرمێونی دووانن
دوو سیلە چاوی نەرمن  زۆر بەحەیا و بەشەرمن

بۆ یەك هەر دوو لە جۆشن مەست و خومار و خۆشن

داوا و تەما هەزارن کەیفە، باری لە بارن

دوو یاری پێ بە داون بۆ یەك لە جۆشوتاون

جۆشوتاوی ئەوینێ هەردەم کە بێتە تینێ

مێروو دەکاتە مێرێ مێرێ دەخاتە بیرێ

ئادەم مەستی ئەوینە گراوی، داوی زینە

ئەوین پێخۆری ژینە ژین بێ‌ئەوین نەژینە

خوای جیهان و عالەم ئیلهامی دا بە ئادەم

فەرمووی ئەو کیژە قۆزە هی تۆیە پێ پیرۆزە

هەر دوو کاڵ و فەریکن مزگێنی بێ، شەریکن

نێر و مێوی بەکەڵکن هەوێنی بوونی خەڵکن

دوو لاوی مێو و نێرن شەریکی خێروبێرن

دایی و بابی بەشەرن پێگەی زەین و هەتەرن

دەسگیرانت حەوایە دڵپاکە، بێ‌هەوایە

دڵدار و دڵبزێوە خێر و خۆشی بە پێوە

میوەی مێوان بە تامە بێ‌مارەیی حەرامە

مارەی ئەو بووکە زێڕە سوجدە و سوپاسە وێڕا

بۆ سوجدە خۆ نەوی کە گراوی خۆت کەوی کە

سوپاسی باری بێژە بیکە نوێژە درێژە

شوکری نێعمەتی باری بیکە بە وێرەی زاری

سەد سەلامی بە ئەژمار بە دڵ بە لێو و بە زار

بۆ محەمەدی نازدار بە ڕێکە، ڕێك و تەیار

ئەوسا ئەو ڕوو بە خاڵە ئی تۆیە بۆت حەڵاڵە

ببنە ماکەی هونەران دایی و بابی بەشەران

لاوی زیت و وریا بن
نەچن لاڕێ و کلا بن

**«هەوەڵ سەجدەی بابەئادەم»**

ئادەم ڕۆییە سەجدەوە
نەیزانی ڕۆژە، شەوە

حەمد و سوپاسی باری
ڕێکی خستن بە زاری

زمان بە «بسم‌اللە»یی
روو بە دیوانی شایی

سەری لە سەجدە دانا
وەیگوت زمانی زانا

لەگەڵ حەمد و یا حەمید
یا ڕەحیم و یا مەجید

هەرتۆ ساز و بسازی
ئاگا بە هەر نیازی

لە شوکری نێعمەتی تۆ
مەلێکم بێ‌پەڕ وپۆ

بێ‌هێز و لاڵ‌وپاڵم
نەزان و کرچ‌وکاڵم

چی داروبەرد و چێون
ئەوەی لە چۆم و کێون

ئەوەی لە چاو هەتەرن
چی گوڵ و بەرگ و بەرن

هەمووی زار و زمان بێ
چابێژ و وێژەوان بێ

چەند ساڵ و چەند زەمانێ
بۆ حەمدت بێنە سانێ

بۆ نێعمەتێکی چووکت
هەموو بێنە سلووکت

هێشتا هەر کەموکووڕە
بێ‌هێز و باو و سووڕە

بۆ مارەیی حەوایە
ئادەم لە سەجدە دایە

سەرنەرمە بۆ ئەوینێ
شۆڕەو بێ بۆ زەمینێ

سەجدە سەجدەی مرادە
پڕ لە نزا و لە دادە

فرمێسکی گەش خشاون
ئالۆز و هەڵڕژاون

دڵدار و دەروونپاکە
لە خاکە، ڕێکی خاکە

وەها لە سەجدە دایە
غەرقی دۆعا و نزایە

خاوەن پەیامی دایە          هەستە حاجەت ڕەوایە
حەمەدت بە تانوپۆیە          حەوا حەلاڵی تۆیە
سوپاسی باری بێژە          لە بەرهەمی بچێژە
بەرهەمی بەژن و بالا          شیفای هەناو و حاڵە
مزگێنی بێ لە ئێوە          ئەو بەهەشتە بە نێوە
جۆگەی شەراب و شیری          شەهد و شەکر و پەنیرێ
وەتاخ و کۆز و کاخی          هەنار و سێو و باخی
سوبح و نەهار و شامی          بۆ و بەرامی تامی
سەنتوور و تار و سازی          تەڕ و تەرلان و بازی
گەپ و گاڵتە و گەزاف          بادە و شەرابی ساقی
عەنباری زێڕ و زێوی          بەرهەمی سێو و مێوی
هەمووی دیاری خولایە          بارە شایی حەوایە
مەی دەچێژی بچێژە          سوپاسی من بوێژە
تۆ بەندە من خوواتم          بەزییک و دەسەلاتم
ئاگا بە کاروکرم          لە هەر جێگە حازرم
چیت پێدەڵێم بە گوێ بە          بێخەم بە، ڕوو بە ڕێبە
چی هەس لەنێو بەهەشتا          لە ڕێی گوزار و گەشتا
چی تورت و ئاڵوکاڵە          گشتی لە تۆ حەلاڵە
گەنم دارێکی چووکە          میوەی بۆگەن و پووکە
وە حەندەری نەکەوی          پێتان خۆشبێ نەتەوی
نەچی لە ئەو بچێژی          ببیە دەسخۆشی گێژی
شەیتان دوژمنی تۆیە          ڕوورەشە چل درۆیە
ڕێگری بیروڕایە          وریا نەبی وریایە
خاوەن فێڵ و فریوە          دەرکراوە، تەزیوە

بێبەشە، ڕەنجەڕۆیە — دوژمن بە هۆزی تۆیە
لە ڕێڕەوی ژیانا — کێ ڕێگرە شەیتانە
ئادەم بە گوفتی زاری — بەڵێنی دا بە باری
بەڵێنی دا بەڕێ بێ — ژینی بەڕێوەجێ بێ
تامی گەنم نەچێژێ — لاڕێ ڕەنگی نەڕێژێ
مۆر کرا ئەو بەڵێنە — قەزاوقەدەر، نەهێنە
قەزاوقەدەر بەکارن — بۆ ئێمە نادیارن
لە نێو بەهەشتی شادی — ئادەم گەییە مرادی
تەواوە، کێش و پێوان — دیاری کراوە نێوان
ئادەم لە سەجدە هەستا — ئاشقە حەقی بە دەستە
حەیف و مەیل بڕاون — دوو دڵ بە یەك بڕاون
دەستی یاری لە دەستە — بە تاموبۆنی مەستە
لەناو بەهەشتێ قاوە — ئادەم دەکرێ بە زاوا
نووسراوی بارەگایە — ویست و مەیلی خووایە
قەزا و قەستی بسازە — وەرزێکی پڕ لە ڕازە
زەوی دەبێ وەبەر بێ — پڕ لە سەرۆك و سەر بێ
بەهاری پڕ بە دڵ بێ — هەواری پێگە، گوڵ بێ
زستانی پڕسڕی بێ — یەخەی خۆشی دڕی بێ
ویستی زەوی بەکەش بێ — خاوەنی سوور و ڕەش بێ
ئەو جووتە لاوەی هێنا — خۆشبێژ و بەرزە وێنە
ویستی گۆشەی زەوینێ — داچێنێ بە ئەوینێ
چنۆك و دەسبزێوان — باوێتە بەندی مێوان
دروسکا، مەم و لاسان — بۆ بەیت و باو و باسان
حەتەمان بێنە گۆڕێ — بارام بڕۆنە گۆڕێ

مەمان بۆ مەم کەوی کا      سەرزلان سەرنەوی کا
بوونەوەر بێنە باسی      خۆ بە خەڵکی بناسی
ژیان چۆڵەچرا بی      پڕ لە قیژە و هەرا بی
دەمی گەش و بەگڕ بی      دوادەم چرووك و سڕ بی
هەوێنی ئەو گەرایە      بابەدەم و حەوایە
شێوەردی ئەو پەرێزە      «دایکە وایە» بەهێزە
خاوەنی ڕا خووایە      چۆنی شین کا ڕەوایە
لەسەر ئەو عەرزە گردە      کر شاشە یا بە گوردە
نەبارە یا لەبارە      بە ویستی کردگارە
لەوی ڕایە بەباون      خاسن و یا خراون
چی ناوی ماسیوایە      مەجبووری«من تشا» یە
بەشەر لە خاك و ئاوە      گڵمەتی خرکراوە
بە بارانێکی بەخوڕ      دەبنەوە گڵ خڕوپڕ
دەبنەوە گڵ دووبارە      دەچنەوە کۆشی سارا

«تێچێنێك»

سەنعەتی تۆ، خوایە      پڕ لە حیکمەت و ڕایە
سەردەرناکا، لە کارت      دۆست و دژ و نەیارت
ئادەم لە تۆزە قوڕی      تەڕدەستی گەرموگوڕی
هێناتەدەر لە کلان      گوڵباران بوو بە گوڵان
تا گوڵ بە دڵ ببینی      ناردت بۆ گوڵچنینی
مەیلت لێبی، بە تاوی      لە لیمی دەم دەراوی
دروستدەکەی سەرۆکان      بۆ زیت و سست و کۆکان

پاش دەمێ دەیپرووخێنی | دەچێتەوە پاشە شوێنی
دەیکەیە زبڵ و تۆزێ | بۆ خۆی لە خۆی ببێزێ
ئێمە کە خێوی، نێوین | نە زێڕین و نە زێوین
گلمەتێکی هەڵۆڵین | بە بارانێ کلۆڵین
ئێمە کە خۆ بناسین | ناشێ لە خۆ بماسین
کەسێ هەوێنی قوڕ بێ | نابێ بە پۆز و فڕ بێ
بژی، بمری بە پاکی | نەوی‌تر بێ، لە خاکی
بە ژینی خۆی نەنازێ | لەگەڵ خەڵکی بسازێ
گلێنێکی بەفەڕ بێ | دوورە پلان و گەڕ بێ
هاکە باران بباری | بوویەوە، قوڕ بەجاری
ئەو دەم و دەور و ژینە | چت پێناکرێ، قوڕینە

«بە یەکبڕانی دایکەوا و باوکەوای ئێمەی هەژار»

راپەرە بەربەیانە | هەوەڵ شایی جیهانە
بووک و زاوا بەباون | سەرگەرمی ڕاوەچاون
دوو دڵی دڵ دزاون | بۆ یەکتری بە تاون
شەم دەگەڕێ لە کۆڕێ | پەروانە لێی دەنۆڕێ
خەم خێوی خۆی بە قڕدا | پەروانە خۆی لە گڕ دا
دەرکی دلان کراوە | شەرم و شکۆ شکاوە
چێژەی ئەوین بە تامە | مەکە و لاچۆ حەرامە
دەم دەمی بابادەمە | چی کورتوکەمە خەمە
دوو دەم بە دەم گەیشتن | لە ژینی نوێ گەیشتن
باخەڵ و سینەبازن | کەیف، بەکەیف و سازن
دەس‌ودەم خوازەڵۆکن | لەسەر سینە گەڕۆکن

جەژنە، جەژنی دڵانە    گوڵچن، لەناو گوڵانە
بەختی نەوس و هەوایە    چێژە، بێ‌پرس‌وڕایە
دوو لەش لەیەك میوانن    بێ‌لەمپەر و نێوانن
پێش قەتاری ئەوینێ    گەیشتە شیوی ژینێ
شەرموشکۆ، ڕژاوە    زاوا وەرزی بەراوە
مەتەی دەستی ئەوینێ    گەیشتە دوڕسمینێ
چی دەم و لێو و دەستن    بە مەی ئەوینێ مەستن
نەهەنگی جێگە ڕاوان    ڕاوی خستە دەراوان
ڕاو کەوتە بن پشتێنێ    تکا قەترە هەوێنێ
نەڕۆی بێر و بەوێدا    هەوێن گیرسا لەوێدا
ئێمە لەوێوە هاتین    چ پسپۆڕ و چ لاتین
بابی مەی هەوەڵینێ    تێر بوو لە کر تەنینێ
ڕاساو و شاد و مەستە    دەستی بووکێ لە دەستە
هەوەڵ بووکی بەهەشتێ    دەڕوا بۆ دەرودەشتێ
دوو لاوی قۆز و خاون    هەوەڵیانە بەباون
وەڕەز نابێ لە باوان    لە جوانی دەم و چاوان
کەوتوونە سەر قولاتان    نابینن زەرد و تاتان
نەمام و خەڵفی ساڵن    لە یەکتری حەلاڵن
دایە و بابی بەشەرن    هاوباوەشن و هاوسەرن
نەیانزانی هەژارن    نەهاتوو نادیارن
بێ‌خەبەر لەو ژیانە    نیوەی بریسك و ژانە
نازانن پشتی پەردە    پڕپڕ لە خرکە بەردە
کێ سەرخۆشی ژیانە    وێی دەکەوێ لەوانە
ئەو جووتە لاوە جووتن    بڵیند و بەرزە لووتن

تێر و بەلا نەدیون — لەنێو گوڵان بەزیون

کامە میوە تەمیزە — تاڵە و یا لەزیزە

تام و چێژی مەباحە — چێژی گەنم گوناحە

گەنم حەرامە لێیان — جێگەی باسە لە جێیان

حەوا ژنە و ژن وایە — بادی هەوایە، لایە

لە خۆشیا بزۆزن — خاوەن دەمار و پۆزن

وریا نەبی غوورورن — بیانووگر و نەبوورن

ژن وا هۆشی لە کۆشە — ناتەواوە، نەخۆشە

خۆشباوەڕ و نەبینە — بێ‌کێش و پێو و تینە

ساویلکەیە و بەشەرمە — بە چاووڕاوێ نەرمە

ژن بەرهەمی ژیانە — پێگەی سوود و زیانە

وەك خەڵفی، باخەسێوە — جوانێکی دڵبزێوە

بە باوێ دێ بە لادا — دادێ بە هەر دوو لادا

خەمهێنە، خەمڕەوێنە — تەلاشی دەم خوڕێنە

دڵپاك و خۆشفریوە — وریا نەبێ بەزیوە

وریا نەبێ دەدۆڕێ — ڕێی باوەڕی دەگۆڕێ

دایکەوا سەربەخۆ بوو — بۆ خۆی بخۆ و بڕۆ بوو

بڕیاری دابوو جەمێ — گەنم بە فووکا کەمێ

بیخاتە سەر زمانێ — تام و بۆنی بزانێ

تا تێبگا، چ تامە — هۆی چییە بۆ حەرامە

بەو خەیاڵە خڕاوە — بەرەو ئادەم گەڕاوە

وتی بۆ تۆزە شیوێ — تاوێ دەچمە نەدیوێ

کەم دەخاییێنێ کاتم — هەروە بزانە لە لاتم

ئادەم وتی وریا بە — وریای خەتی خوا بە

بێدەغدغە و هەوا بە
گوێ‌لەمستی خوا بە

دایکەوا ڕۆییە شیوێ
بۆ نەدیو و پەسیوێ

دیتی کەسێ لەوێیە
دەڵێی خێوی شەوێیە

سەراپا، سپی پۆشە
لە سەجدە دایە، خۆشە

خووانا سێکی ماتە
زار بە حەمد و سەلاتە

خاوەن جبە و ڕدێنە
رووخۆش و خۆشبەڵێنە

بۆشناخ و شێوە باشە
لە تاعەتا هەراشە

خدری نەجاتی ڕێیە
وادیارە ڕاستەڕێیە

خۆ ڕەنگە، نەك دزێوە
خێروبێری بە پێوە

بێ ئەوە، لێی بترسێ
دایکەوا لێی دەپرسێ

دەڵێ یارۆ چکارەی
خۆماڵی یا غەوارەی

زووتر، بێژە، درەنگە
لێرە مەمێنە، نەنگە

شەیتان ڕووناکە بیری
لە بەردەستا، نەچیری

لە ڕۆژێ چاو دەگێڕێ
ئاشی گەڕێ بگێڕێ

وتی گیانە فریشتەم
ئاودێری ئەو بەهەشتەم

سەرداری، گشت فەلەکم
دەرسوێژی مەلەکم

بە بارەگا مەحرەمم
ئاگا بە زۆر و کەمم

حەکیم و میوەناسم
زانا و بەدەنگوباسم

هەچی ئێوە دەبینم
دڵ بەخەم و بە شینم

ئێوە دوو لاوی قۆزن
بێخەم و پێ پیرۆزن

ساکار و لێنەزانن
بێتەجروبەی ژیانن

چەندی پێناچێ ئێوە
دەڕۆن لەو نێوە، ئێوە

مەرگ لە ڕێیە بۆتان
لێو تێکدەدا مەکۆتان

گەنم یاساخە لێتان
تەڵە و داوە لە ڕێتان

تامی گەنم نەچێژن ‌ ‌ ‌ ‌ شەڕە و بۆ هەڵدەڕێژن

گەنم نەناسی، کاسی ‌ ‌ ‌ ‌ هەزاری ڕێنەناسی

گەنم، دانەی حەیاتە ‌ ‌ ‌ ‌ چێژەی بەرەو نەجاتە

نەخواردنی چەتوونە ‌ ‌ ‌ ‌ خواردنی زیندوو بوونە

گەنم، دەوای ژیانە ‌ ‌ ‌ ‌ گەشەی هەناو و گیانە

مزر و خۆش و بەتامە ‌ ‌ ‌ ‌ ریشەی هەموو تەعامە

گەنم بخۆی جحێڵی ‌ ‌ ‌ ‌ بۆ هەمیشە بەوێڵی

گەنم بخۆیی و بیجووی ‌ ‌ ‌ ‌ بۆ هەمیشە نەمردووی

تامی، گەنم نەزانی ‌ ‌ ‌ ‌ روونە بەرەو نەمانی

دەرکراوی بەهەشتی ‌ ‌ ‌ ‌ بەبێ پەسیو و گەشتی

سەد سوێندم، بە سەمایە ‌ ‌ ‌ ‌ چت پێدەوێژم ، وایە

لە ڕاستییا، تەیارم ‌ ‌ ‌ ‌ دڵسۆزییە، وتارم

گەنم بکەن بە چێژە ‌ ‌ ‌ ‌ عەمر و تەواو درێژە

بەهەشت دەبێتە ماڵو ‌ ‌ ‌ ‌ تەخت دەبێ خەیاڵو

گەنم، دەنک بچووکە ‌ ‌ ‌ ‌ خواردنی سایە سووکە

نەخوارنی، مەحاڵە ‌ ‌ ‌ ‌ مردنە، ئاشبەتاڵە

سوێند بە خۆم و بە دینم ‌ ‌ ‌ ‌ بۆ ئێوە چاو بەشینم

لە وەسیەتم کلا بن ‌ ‌ ‌ ‌ دەبێ تووشی بەلا بن

دەروو دەکەن، لە وێدا ‌ ‌ ‌ ‌ دەڕۆن بێرو بەوێدا

هەتا هەل وا لە دەستە ‌ ‌ ‌ ‌ لە چێژی ڕامەوەستە

من وا دەڕۆم لە لاتان ‌ ‌ ‌ ‌ ئێوەو تەگبیر و ڕاتان

پەندێ بوو وتم بۆتان ‌ ‌ ‌ ‌ ئۆباڵ وەباڵی خۆتان

دایکەوا، هەنگوواوە ‌ ‌ ‌ ‌ ڕەنگی لە ڕوو نەماوە

ڕەنگی پەڕیوە، سیسە ‌ ‌ ‌ ‌ تووشی تەڵەی ئیبلیسە

دارەدارەی بە حاڵە / قاڵی، خەیاڵی تاڵە

بە خۆی و کوڵە خەمێ / گەڕاوە لای ئادەمێ

چی زانیبوو لە کووچان / چاوێکی لێنەقووچان

پیاوەکە، هەستە زووکە / لوێچێ گەنم بە فوو کە

بیخەمە سەر زمانم / تاموبۆنی بزانم

تامی نەکەم، نەخۆشم / نە تۆم دەوێ، نە خۆشم

تامی نەکرێ گوژاوین / هێلانە تێکدراوین

گەنم، هەوێنی مانە / رازی بەقا و ژیانە

یا دەبێ من بنێژی / یا لە گەنم بچێژی

دایکەوا، کەوتە شینێ / ئەشکی ڕشتە زەوینێ

بابەدەم عەبەساوە / زانی، ئەو شینە داوە

گوتی بە دایکەوایە / ئەو داوایە خەتایە

چەوت و چەوێڵ و لارە / لارێیە، نالەبارە

لاڕێ، بڕۆی هەراڵی / تووشی تەڵەی خەیاڵی

خەتا هەڵتدەدێرێ / بە شەیتانت دەسپێرێ

دژایەتی خولایە / چی کاری نارەوایە

باری، برەنجێ لێمان / دەبەستێ، دەست و پێمان

تووڕمان دەداتە چۆڵێ / عەیبمان، دێتە کۆڵێ

بۆ نۆبەرە و بەرەمان / بۆ سەردار و سەرەمان

بۆ نەتیجە و نەوەمان / بۆ کۆمەڵ و ڕەوەمان

گوناح دەبێتە پیشە / زەلیل دەبین هەمیشە

تۆ ژنی لێنەزانی / سواری کەری شەیتانی

وادەمان دا بە باری / گەنم، نەخەینە زاری

پەیمانشکێن هەژارە / داماوە باری لارە

لە بەهەشتێ بێبەشن    بێچار و چارەرەشن

نەکەی، نەخۆی خەتایە    گەورەترین بەڵایە

شەیتان فریوی داوی    داوی لە ڕێگە داوی

چی دی لەسەر مەڕێسە    چەتیوە خواروخێسە

دەتهەوێ بەربەڵا بم    تووشی سزای خوڵا بم

گەر بمکوژی نەیارم    گەنم نانێمە زارم

بەسکە، مەیکە، بە کێشە    بۆ لێم بوویە درێشە

دایکەوا، ڕق هەستاوە    وەك شێرێ بە شالاوە

ڕوو بە ئادەم بەقینە    پێیدەڵێ هەی قوڕینە

چۆن ئیجازەت بە خۆ دا    بەردت لە سینەی خۆ دا

بە من بێژێ چەتیوە    نەزانی هیچ نەدیوە

پێمبێژی خێسوگێژی    نابار و هەڵەوێژی

سوێند بە وەرەی ژنانەم    بە زولفی هەژدە لانەم

تا گەنمت پێ نەهێنم    چاوت لێهەڵنەهێنم

دایکەوا، ڕق هەستاوە    ماری کلك پەڕاوە

لە قەفدایە بۆ شەڕێ    هەڵدەسووڕێ و دەگەڕێ

بۆ شەر کۆك و تەیارە    شالاوی پڕ لە ژارە

بەرۆکی خۆی دادڕی    وستەی لە ئادەم بڕی

قیژە گەییە، سەمایە    گەنم دەوێ، دەوایە

گەنم نەخەیتە زارم    نە شوو دەبی، نە یارم

ژنومێردی هەوەڵن    تووشی قڕە و گێچەڵن

هەوەڵ بناری ژینە    تازەیە کەس نەبینە

کێشە لەسەر خۆراکە    حیسابی پیس و پاکە

بەهانەیە و گوڕوویە    پیلانی ژن و شوویە

من و تۆتــۆ، لــە کــارە
شەڕە و مــاڵبەملانــە
پلانــی نێـــر و مێیــە
کــێ بنکەوێ بــچووکە
دەور دەوری گلانــــە
بــــەزم و هەراهەرایــە
بابــادەم دەم لــە پووشــە
بابــادەم سەری ســـوورە
خێزانـــی مۆرومۆچــــە
ژن ژنــە بـــێ مــەجازە
دەســتی، لێـدەی خــراوە
بابـــادەم دەمقووچـــاوە
دایکـــەوا، وا شــێواوە
داوا، گـــەنم ڕنینـــە
پۆزوهـــەوا، کــــڕینی
پــسا تـــەناق تۆبــە
شــکا دەســتووری بــاری
گــەنم، ڕۆییــە دەروونــێ
پێـــچوڕانی، ڕیخـــۆڵان
بۆگــەنی ســـووچ و تــاوان
بـــەو تاوانــە خــراوە
بۆگـــەن بەهەشــتی داگــرت
لــە زەوی لــە ســەمایە
بگـــر، بگـــر، ژیـــاوە

شەیتان تـەونی بـەدارە
ژن لــە مێــردی نەبانــە
کــێ ســەرکەوێ بەپێیــە
بـەزیوە سارد و ســووکە
نەهاتــە، نــانبڕانــە
نۆبــەی قــۆرت و بەڵایــە
ڕۆژی ژیـــانی تووشــە
تـا بێـژی بـەختی کــوورە
تــۆراوە لەســەر کۆچــە
بیـــانووگرە، نــەسازە
تــــوورە بـــێ دەمدڕاوە
ڕێچـــاری لــێشــێواوە
ریــسێکی هـــەڵوەشاوە
نۆبـــەی نانــدێن دڕینــە
تــێـــروپڕی دڕینـــی
ڕنــا گــەنم بــە نۆبــە
گـــەنم گەیــشتە زاری
زگ هاتــە هــاتوو چــوونێ
قــوورەی گەیــشتە دۆڵان
کەوتــە چــۆم و دەراوان
خێروخۆشـــی تــەواوە
دیلانـــی شــادی ڕاگــرت
لـە هــەر لایــێ هەرایــە
کۆنـــەبرین کــــولاوە

پچڕ، پچڕ، پەیا بوو ڕژا هەچی حەیا بوو
بەلا وەری بەجاریٚ نە ڕێگە ما نەچاریٚ
گەلا باوەگەورەمان ناخۆشکرا دەورەمان
باوەگەورە شکاوە تاوانی بەرەو چاوە
کرگەری لێرەنجاوە فرمێسکی بە لێشاوە
دایکەوا و باوکەوا بوون جووتیٚ فەرمانڕەوا بوون
گوناح شەقڵی شکاندن جلکی بەری دڕاندن
خوا تووڕەیە لێیان شکاوە دەست و پێیان
ڕووت و قووت و دیارن سەرشۆڕ و شەرمەسارن
هەڵدێن بێرەوبەوێدا خۆ وەشێرن لە جێدا
دوو ڕووتەڵیٚ بە ناون پەنا و جێگە بڕاون
ڕوو لە هەر شوێنیٚ دەکەن گاڵتە و گەپیان پێدەکەن
بێشەومێشەی نەدێوان هەژگەڵیٚ سویٚ پەسیوان
چەپڵەیان لیٚتەقاندن جلکی بەریان دڕاندن
زێڕ هەڵوەری لە قۆڵان کەوتە نێو خشتوخۆڵان
هەڵوەری تاجی شایی شا هاتە سەر گەدایی
حەوا و ئادەم نەماون دوو دزی دەرکراون
ڕووت و قووتی دزی بوون تووشی لەڕی و کزی بوون
ڕەنگ لە ڕووان پەڕیون بیٚپەنا و بیٚپەسیون
دایکەوا بیٚکەوایە بیٚباوە ڕوو لە بایە
بەر و بەرمووری زێڕی خرخاڵی خەت و دێڕی
لیباسی سەوز و سووری کەمەربەندی بلووری
شەدە و پێچ و کڵاوی سەرپۆشی بسکی خاوی
لەسەر لەشی خزیون ڕزیو و هەڵوەریون

خەم و دەردی بەبارن — عەیب و عاری دیارن

هەنگوواوی خەتایە — شیاوی هەر سزایە

بابەدەم بێدەماخە — چووکە پیاوێکی یاخە

هەڵدەچۆقێ هەژارە — چارەرەشە، بێچارە

لە هیوا بەشبڕاوە — داماوە، نیوە ماوە

لاڕێ چووە، چوواوە — بەهەشتی لێسناوە

قەهری خوا بەتینە — لە کێ دڕێ، نەبینە

لە سەر چووکە گوناحێ — تەجاوز و تەماحێ

سەرشۆڕ و سەربەرەوخوار — فڕێ دران سەرەوخوار

تووڕدرانە، زەمینێ — بۆ چۆڵی مەککەو چینێ

جێ لە جێگە خراوتر — بێ نان و بەرگ و ئاوتر

دوو جوانی لاو بە تەنێ — هەریەکەی لە بەندەنێ

تەرە و تەنبێ کراون — تەڵخەکی نیوە ماون

خوا نەبێتە یاریان — نەماوە ڕێگە چارەیان

هەتاهەتا شکاون — ئەسیری بۆگەناون

### «سووکە پاشکۆڵێک»

خوای سەما و زەمینێ ‏ ‏ پشت و بەران دەبینێ

بەر لە بەرەی مەمانان ‏ ‏ ئادەم هاتە زەمانان

بەهەشتی پێ کەرەم کرد ‏ ‏ تاجی شاهی لەسەر کرد

مێیەکی بۆ هەوڵ دا ‏ ‏ شلوشۆڕ و لە گوڵدا

هەوەڵ بووکی بەهەشتێ ‏ ‏ بۆ ئادەم هاتە گەشتێ

هەوەڵ بووکی جیهانە ‏ ‏ دیاری دەستی ڕەحمانە

ڕێکوپێک و جوانە ‏ ‏ کوفرە بێژی نەزانە

کە زانا بوو لەبەر چی ‏ ‏ کلا بوو بە گەڕ چی

بێپرسی تۆ لەپڕدا ‏ ‏ بۆ گەنم خۆی بە قڕدا

کە نەزان بوو بۆ هێنات ‏ ‏ بە ئاوی خەم بۆ شێلات

مەیلت لێنەبێ باری ‏ ‏ بێبارە ڕاست و لاری

ڕەداوکەوتوو لە تۆوەن ‏ ‏ کەی لە زانست و هۆوەن

هێن وردە ئەو وتارە ‏ ‏ بیر لەوێدا پەیارە

ئەوەی هۆزان و قۆزە ‏ ‏ ئەوەی بیری بزۆزە

لەو بیرەدا نەچیرە ‏ ‏ بێدەستوپێیە، پیرە

شەلوشەق و شکاوە ‏ ‏ تەلاشی سەر قوڕاوە

سەرەی بە دەستی تۆیە ‏ ‏ بۆ کوێ بچێ بە تۆیە

هاتونەهات چکارەن ‏ ‏ سیفرێکی بێژمارەن

هۆی تاریکی و تنۆکی ‏ ‏ ناباری یا نەکۆکی

هەوێنی ژانوبرکان ‏ ‏ هەڵەی بزۆز و کورکان

چ بێهۆ و چ بێهۆوەن ‏ ‏ پەڕوباڵی لە تۆوەن

کەتۆ نەبای نەبوو بوون ‏ ‏ بێدەمودەست و دوو بوون

شەیتان شەمی سەما بوو ‏ ‏ دەم بە حەمد و سەنا بوو

کۆرپەی باوەشی گڕ بوو  
لە شەرم و تەقیە پڕ بوو

پۆزت هێندە تێهاویست  
هەتا خۆی، خۆی دەراویست

ئادەم لە تۆزێ قوڕ بوو  
نەزان و پەست و کڕ بوو

سوالەتێکی کولۆر بوو  
ناحەز، دزێو و بۆر بوو

ویستت لەسەر بوو باری  
بێتە سەر باری یاری

حەوات بۆ کردە بووکێ  
نە بووک، بەڵکو گوڵوکێ

نە گوڵ، بەڵکو گوڵینێ  
جێگە سەجدەی ئەوینێ

گەنمت بۆ کردە پێچاڵ  
تا تێیکەوێ سەروماڵ

ئیتر چ بکا هەژارە  
پێشهاتنی پەیارە

لە ویستت لانادرێ  
هیچ داوێ بانادرێ

ئەوەی لای تۆ ڕەوایە  
لادانی ناڕەوایە

بۆ مەی هەژار چ ماوە  
چی بێژم چاو و ڕاوە

گلمەتی جێ قەلاتین  
بەرەو لێژی نەهاتین

بێگوڕ و هێز و باوین  
مەیلت لێبێ تەواوین

مەیلت لێبێ چرووکین  
سوالەتی سووک و پووکین

ئیتر چ ماوە بۆ مان  
بیکەینە فیزی خۆمان

بەشی ئێمەی کزۆکە  
هەر شین و دادو کۆکە

خوایە زار و زەلیلم  
بە دەس ژینەوە دیلم

کوردی هەژار و ڕووتم  
جێتەرت و هەڵەمووتم

خرتەوپرتەی ژیانم  
وردە وتەی زوانم

بەیت و باو شێعرۆکەم  
هۆرە و لۆرە و نارۆکەم

کلاشی پەڕۆ و هەمانەم  
کورتەک و جامەدانەم

قرتکراو و دزێوین  
بێڕەنگ‌ودەنگ و نێوین

خوایە کوردی کوڵۆڵم  
بێ‌جێ پەسیو و مۆڵم

بــژیوم خەپلــەی گاڵــە ئــــەویش بەحاڵــــە، حاڵــــە
چـەکمەم، کاڵـە و پێتـاون نیــــــوەی ســــــاڵێ دڕاون
وێــڕای ئـەو ژینـە تاڵـەم تووشــی ئـەو جێگـە چـاڵەم
بـــە تــاوانی کوردانــــەم دوچــاری ئـــەو زیندانـــەم
زینــدانی قەســری شــایە بـــۆ مـــە، مـــاڵی بەڵایـــە
خوایـــە لێــی وەربگێــڕی شــــا و شـــابانوو بهێـــڕی
وەرگــەڕێ تـەختی شـایی هـــــەژار بێنـــــەوە شــــایی
بـەر بـێ بـاخی مـەمانان بێتــــەوە خـــانی خانــــان
راوچـــی بێنــەوە گــۆڕێ تــۆڕان، بگــرن بـــە تــۆڕێ

١٣٣٩/١١/٢ . زیندانی قەسری قاجار

## روخسەتی ڕاو

خوای مەزن هەر لە ڕۆژی بەرێوە،بۆ بەرەی مرۆ، ڕاوی چۆم و گۆم و گەوە و چۆڵگە و چرگەن و هەموو بنە و بەیارێکی حەڵاڵ و زەلاڵ کردووە، تەنانەت بەرهەم و تایبەتمەندییەکانی شکاریشی بە ناز و نیعمەتی فرە بەکەڵك نیشانداوە. فەرمان و ڕوخسەتی خواوەندیش بێحیکمەت و سوود و بەرهەم نابێ و نییە بەلام چاوی دەوێ بۆی بڕوانێ و بڕوای دەوێ هەڕەی لە بڕەی وەکا و سوود و بەرهەمی فەرمانەکانی خواوەن، بە خۆی و خەڵك بناسێنێ.

«تایبەتمەندی ڕاو»

ڕاو، ڕاهێنانی دەست و قۆڵ و قاچ و شانومل و هەنگاوە. وەرزشە، ڕاسانە، پاشەکشێ و چنگەکڕێ و پڕتاوە، ڕوانینە، زانینە و جانەوەرناسینە. بەرداوبەردە، بازبازێنە، گەدەخشکە و نەویبوونە، ماندووبوونە، سانەوەیە، خۆشییە، بزە و قاقا و خۆرانان و ئافەرینە. ڕاو مەدرەسەیەکی ترسبڕە، ڕاوچی کوڕە خاوەن زیپك و بڕە، لە بڕەگان، لە لوورەی چەقەڵ و گورگ و سەگان، لە پشمەی ووشەك، بۆڵەی ورچ و خێوی بنەگان، لە جندو دێو و مۆتە و ئاڵەی چۆڵگە و هەڵەتان، ناترسێ. ڕاوچی چوختی دەبێ، پوختە دەبێ، بە کەلێن و کولێن و پەسیو و پەنایان ئاشنا دەبێ. چی هەبێ لە جوانی سروشت، ورد و درشت، خاو و گشت، شاش و بەپشت، هەمووی دیون، دەیان ناسێ. ڕاوچی بە زمانی هەموو جانەوەرەکانی کێوی، ڕەوەك، گەورە و چووکی، بەزەڕ و بێزەڕ و پووکی، باڵدار و بێباڵ و فسۆك و خزۆکی ئاشنایە، حاڵیە، ڕاوچی گیاناسە، دڕندەناسە، دوور نییە مەدرەسەی ڕاو بیکاتە قارەمان، بیکاتە سەرۆکی ڕاپەڕین و ڕاسانان. ڕاو سوننەتێکی لەمێژینەی کوردانە. لە هەموو خول و زەمانێکدا، بەپێی پێودانی ئەو سەردەمە، قارەمانی ڕاو و شکار، شاخەوان و مەڵەوان وردڕووان و هەنگێوە و سیرەڕاست و ڕاستاوێژ، زۆر بوون. ئێستاش، بەپێی چەرخ و خولی سەردەمی خۆمان، لە ڕاوچی لێزان و بزان و شوێنگێڕ و خوزەناس و دەسڕاست، بێبەش نین و بەڵکو تێروتەسەل و تەواویشین. لاوەکانمان زۆربەیان دەسبەچەك و سوار و ڕاستاوێژن. ڕاوی چەك و داو و تۆڕ و تەڵە و کۆختە و سەرە دێوە و دێوجامە و شەدا و شەوارە و ڕاوەچرا

و ... هەموو فەن و فووتێکی تری ڕاوێ. هەروەکوو لێرەدا بۆ بیرەوەری یادی پۆلێك لە کوڕانی کۆڕی ڕاوچییان دەکەم، کە لە ڕاوێکی بێڕاوێژدا، ڕاوبەتاڵم پێکردوون. بۆ ئەوە لە مێژوودا یادیان هەر زیندوو بێ، هەروا بەکۆمەڵ یادیان بەخێر بێ.

«گوندی گوێزێ و ڕاوەکەروێشك»

«کەروێشکە شین»

کەروێشکێ بوو لە بن کێوێ — نە کەروێشك بەڵکو دێوێ
هەڵکراو و چوست و قەڵەو — خۆشبەز، بەڕاپەڕ و پتەو
نەیگەزیبوو بەڵا، دەمێ — نەی دزیبوو قەزا جەمێ
دوورەگەڕی ترۆڕچی بوو — بێمنەتی ڕاپۆڕ چی بوو
لەناو تەرت و بەرد و شاخان — دەژیا، نەدەچووە نێو باخان
بێدەسگیران و ماڵ و ژن — نە هەرمێخۆر، نە هێشووڕن
دەژیا دەم و داوێن خاوێن — وەك خەڵیفەی شێخی لاوێن
نە بۆ ژوانێ دەچوو شەوێ — نە خەسووی هەبوو، نە هەوێ
نامەحرەمێ نەیدەبینی — بێگورگە بوو کۆما دینی
نە نوێژێکی دەچوو جەمێ — نە بۆ ژوانێ دەچوو دەمێ
خانووی لەنێو زەرد و بەردان — دوور لە ڕێبازی نامەردان،
دروسدەکرد، بە بیزایان — خۆشتر لە پێتەختی شایان
بەفیز و فەڕ، فرهاوێژ بوو — شەمی شەوی گەلاوێژ بوو
خۆشوخەنی لەناو گوڵان — ببووە دڵداری سوورگوڵان
هەڵدەبەزی دەخولایەوە — سەپان بوو، شا، بە لایەوە
باوەشێنی شووبای شەو بوو — بانگ و سەڵاوێژی، کەو بوو
تەپڵی تەقەی، زەنگی شەك بوو — جێهەڵوێستی، سەر کەنەك بوو
تەراز و کۆ، جووتەی کەوێ — بۆی دەرەخسین، زۆربەی شەوێ

لەناو شادی وەها قوم بوو
سەراپا خۆی، لە لا گوم بوو

تێروپڕی، پڕزەی بڕی
خۆی لێگۆڕا، دۆڕا، فڕی

تێروپڕی، ڕەندی دەوێ
دەوڵەمەندی، مەندی دەوێ

کەروێشکە شین خۆی لێگۆڕا
لە تێریدا، کوێر بوو، دۆڕا

تووری هەڵدا بەردەمۆرە
ڕۆییە دزی هەرمێ و قۆرە

تاشی، ڕیش و پرچ و سمێڵ
تۆبەی شکاند بوو بە جحێڵ

ڕۆییە سوێگەی کانی و ئاوان
کچان لەوێ دەشۆن چاوان

دەچووە بێشە و ئاو و زنان
جێگەی مەلەی بێوەژنان

خوواناسی چوو لە کیسی
کەوتە خەتی داوێنپیسی

ڕاستە دەڵێن تێروپڕی
هەڕاڵی پێوەیە و دڕی

تێری، ڕەنگە، بتکاتە پەند
بتخاتە نێو چاڵاو و بەند

بەلای چووکی ئابڕووچوونە
خۆدۆڕان و تێداچوونە

هەرکەسێکی خۆی لێگۆڕا
بۆ هەمیشە دۆڕا، دۆڕا

شینە کەروێشکی بێشعوور
خۆبەزلزان، وەك میری سوور

بێخەبەر لە گێرەوکێشە
مۆرس نەبا، نەیدەکێشا

نەیدەزانی هەتا سەرێ
خۆشی، ڕەنگە نەچێتە سەرێ

لای وانەبوو تەختی شایێ
مێژوو دەیدا بە گەدایێ

وەك نامەردێ زەردوبەردی
نیشتمان و خاك و هەردی

بەجێدەهێشت دەچووە ڕەزی
بۆ ملۆمۆ و چڵپە و دزی

تەرت و تەلانی جێهێشتن
لە ژاراوی، گونای چێشتن

هاتە نەورم[1] و گوێ ڕێیان
بۆ تماشای پووز و پێیان

لە بن سێبەری کۆڵانان
خۆی بادەدا بۆ جێژوانان

سەرەڕێی بێری دەگرتن
ئەوەی نەبا، پێی دەکردن

---

[1] «نێودەن»یش هاتووە.

بێ‌ئیجازەی شوانی مەڕی / لەگەڵ بێرییان هەڵدەپەڕی
شوانە چاوی لێبوو جەمێ / ماچی دەکرد کوڵم و دەمێ
شوانە هەر دوو لێوی گەستن / بۆ تۆڵە کاڵەی هەڵبەستن

«شوانە و ڕاپەڕینی تۆڵە»

شوانەی خەڵکی شێخ چۆپانێ / دەستی دا گورز و گۆچانێ
بەرەو گوێزێ بەزەمزەمە / بۆ لای قالەی حاجی حەمە
هاواری کرد لە ڕاوکەران / ڕاوی خۆیان بەرنە سەران
لێمان دیوە کەروێشکێ زل / شاقەل درێژ، بە شان و مل
نە کەروێشك بەڵکو زاڵێ / خەتخەتی داوێن بە خاڵێ
شەرمێ ناکا لە زەلامان / لێ خەم وەکەن«ڕاوچی» ئامان
بەروبێستانی نەهێشتوون / تۆێخی تەرزوبەری مژتوون

«هاتنی ڕاوچییان»

بە ناوی خوا و ڕەسوولان / ڕاوچی هاتن لە ماقوولان
رستەی مەرەز لە قوڵێدا / ڕاپسکووتن بە دۆڵێدا
حەمەمەلا و قالەی حاجی / خاوەن ئەسپ و چەك و تاجی
زانا بە بن بەرد و چۆڵان / گرتییان گەرووی شیو و دۆڵان
بۆی دەگەڕێن تا ئێوارێ / تێیبەردەدەن ڕۆژی جارێ
وەکوو بفڕێ بە شاباڵان / دەبڕێ گەوە و پۆپ و یالان
تێیناکەوێ ئەو بێ‌دینە / دەڵێی سەقری سەرباڵ شینە
حەمەسەوزە و مەلا بەکر / زەنا،زەنا هەراو بگر
بۆی دەڕوانن لە تەلانان / پێی لێدەنێن وەك نەزانان
وەکوو کوێران بەجێی دێڵن / دوایە فیکەی بۆ ڕادێڵن
هەر ئەوندە دەردەپەڕێ / ڕاوچی دەبوو هەر لێیگەڕێ

تێیبـــەردەدەن تێناکـــەوێ راوی وا چـــەپ هەڵناکـــەوێ

**«کۆبوونەوەی ڕاوچییان بۆ ڕەداوخستنی کەروێشکە شین»**

راوچـی هاتوونـە جـێمـۆڵێ خۆبـــەزلزان، یەکـــەی قـــۆڵێ
بـــە چـــاو و ڕاو، قۆڵـــەمیرن هـــەموو لـــە یـــەکتری زیـــرن
قالەی حاجی حەمەی گوێزێ راودۆســـتێکە قـــەت نـــابێزێ
حەمەمـــەلا و مـــەلا بـــەکر حەمەســـــەوزەی بیانوونـــــەگر
فـــەقێ ڕەحمـــانی گەوهـــەری گەوهـــەر دەڕێـــژێ جەوهـــەری
کـــۆ بوونـــەوە بـــۆ بڕیـــاران کـــە چـــۆن بگـــرن ســـەرەوخواران
ئـەو کەروێـشکە ڕەداو کـەوێ فریـــای کـــەبابی شـــەو کـــەوێ
مـــوجری بەرنامـــە، لێزانـــە وا دیـــارە فـــەقێ ڕەحمانـــە
هەچـــەن لـــە ڕاوێ نەزانـــە خەوخـــەوە و ئێـــسکگرانـــە
بـەلام هێنـد بـەتام و خوێیـە لـــە هـــەموو دیـــزان ئەســـکوێیە
گۆچـانی بـە بـەردی گەیانـد جەلەســـەی ڕەسمـــی ڕاگەیانـد
هەسـتایە سـەر میکرۆفـۆنێ پـــاش ســـلاو و چاکوچـــۆنێ
فـەرمووی جەلەسـە ڕەسمییـە نەتیجـــــەگیری حەتمییـــــە
وتـــی وتـــار چـــەن هـــەزارن یـــەکیان نـــەبێ هـــەمووی لارن
بڕیـــار بـــە دەس کـــا قـــادرە هـــەر چـــی بێـــژێ ئاقـــڵگـــرە
فـەرموو قـادر هەسـتە بێـژە چـــت پێیـــە بۆمـــان هەڵڕێـــژە
قـــادر هەســـتا شـــەرمێونە ســـەرمای بـــووە لـــووتی گنـــە
بەشـــەرمەوە دەســـتیپێکـــرد قـــسەی قەڵـــەو بڕیـــاری ورد
وتـــی دۆســـت و بـــرام زۆرن خـــاوەن تـــاژی شـــین و بـــۆرن
دەچـــمە لایـــان تـــاژی دێـــنم بـــــالی بـــــازی پێدەشـــــکێنم
دەڕۆمـــە لای ڕەشـــیدخانی مـــیری ڕاوێ دۆســـتی گیـــانی

دوو تاژی هەن نارێ و نازێ — بازن لە هەر تەرت و ڕازێ
شووش و باریك گۆڵ و دێڵن — دوور و نزیك چ ناهێڵن
دەستوور بدەن هەر ئێستاکە — زووتر بەڕێکەوم چاکە
قادر وتی دە نگی داوە — پەسنکرا، ڕەنگی داوە
قەبووڵ کرا بێسەرێشە — ڕاوچی هووڕەیان بۆ کێشا
هێشتا مابووی بۆ بەیانی — ماشێنیان بۆ قادر هانی
تویوتا بوو دەندە زەوی — هێشتا گەلێ مابوو شەوی
قادر ڕۆیی بۆ کن خانی — گەڕایەوە بۆ بەیانی
لە بەیانی خورێنیدا — لە سیگناڵی مزگێنی دا
مزگێنی بێ، تاژی هاتن — ئەوەك تاژی، بازی هاتن
پەنجە سوور و قەڵاتە زێون — شارستانی و دێ دزێون
فێری حەمام و ڕووشۆرین — دۆخین جیر و کراس مۆرین
کراس کورت و یەخە حەوتن — خۆشهەڵبەز و ڕەوتوکەوتن
بۆ بازبازێن خولخولە بوون — لە دیمەنا بێگلە بوون

حەمەمەلا[1]

حەمەمەلا ڕاوچی خاسە — لە زۆربەی کاران هەیاسە
بێژن بێتە سەر سۆیی بانێ — لە کەشمونەشمیان بڕوانێ
زانایە بۆ دیمەنناسی — ناکرێ بە دەم دەنگوباسی
حەمەمەلای سەرقۆڵی ڕاو — هاتە لایان بە چاو و ڕاو
بە جووتە تاژی ڕاگرتن — قەدوباڵای بەیەکگرتن
فەرمووی ناڵێم نارەسەنن — جسنە تاژی لالەسەنن
ئەو جسنە بێتانە و لۆمەن — لە گۆڵە مەرکوژی دۆمەن
دۆمەی ڕەحمەتی نەماوە — لاوخاسێ بوو ماڵی ئاوا

[1] – برای گەورەی مامۆستا ڕاوچی،لە دەنگخۆشی و بەیتبێژی و ڕاودا بەنێوبانگ بووە.

لە پاش چووان ڕەحمەت چاکە ئەمن هەر پێمدەگوت کاکە

من دۆمەی ڕەحمەتیم دیبوو ریشی وەك پەمۆ سپی بوو

جسنە تاژی ئەو بە نێون بەلاّم هەموو خۆهەنگێون

با پێت بڵێم قالەی حاجی سوێند بە چاکی قەبرە لاجی

ئەوانە تاژی ئێرە نین فێری چ کێشەوگێرە نین

شارستانی و چێ نەکراون پێنەکرا و تێنەکراون

سەرگوێشۆڕ و کلك قنجن فێری شۆرباوی برنجن

پاشوو نەوی مەچەك بۆشن فێری قاپقاپە و کالۆشن

نەشەمزا و لەسەرحاڵن فێری سێو و پرتەقاڵن

نەرم و شووش و تێبەرنەبوون روونە، بێکەڵك و بەروبوون

پاڵەوانی نانی دەرکێن فێری چڵە و چاوەبڕکێن

بووکە شووشەی، بن سینەمان بۆ تەلانیان نەبەی ئەمان

هەڵدەدێرن، لەسەر شاخان دەمرین لەبەر حەیف و داخان

بۆڵەی خانت دێتە سەرێ لەوانەیە حەیات بەرێ

قادر لووتی هەڵەنگاوت حەمەمەلا، نەتهەنگاوت

ئەگەر ببیە هەیاسی خاس نە ڕاوکەری و نە تاژیناس

بۆڵەی خانێ وەخۆ دەگرم سەر ڕاوەکەی، بە تۆ دەگرم

خۆم دەزانم ئەوانە چین هی دەرکی کێ و لە جینسی چین

نارێ و نازێ، بازی ڕاون هەر تێبەربن، نەدۆڕاون

دەبێ زووتر وەرێکەوین بگرین، هەچی بەرز و نەوین

بەبێ پشوو تا ئێوارێ پاشخۆنەدەین پچك ودارێ

راوچی پێنج وتاژی سێ بوون یەکلەیە کێ چاتر، چێبوون

حەمە سەوزە ومەلابەکر راوچی ژیروسێرە بزر

سەرکوڵکن و ددان زێرن شل ڕۆ، دەڵێی شەلوگێرن

حەمە مەلا و قالەی حەمە  بۆشەڕ، هەرخە نجەریان کەمە
فەقێ ڕەحمان چۆماخ وە دەس  ها تۆتە گەڵیان بێ مەبەس
بە فیشاڵ و بە تیتاڵان  هەرکەس لە خۆی دەنێ باڵان
زەردە هێشتا نەکەوتبوو  کەروێشکە شین نەخەوتبوو
ڕاوچی ڕۆیی بۆ جێی ڕاوان  بە فیشاڵ و چاو و ڕاوان
کۆ بوونەوە بۆ ڕاوێژان  کە چۆن بگرن تەرت و لێژان
بە ڕاوێژ و تڕ و تۆپان  گرتیان پۆپی یاڵ و پۆپان
ڕاو دامەزرا بە شابیران  ڕاوچی وەکوو قۆڵەمیران
یەك بە تاپڕ و یەك بە دار  یەك لەسەر و سەرێ لە خوار
حەمەمەلا و تاژی خانێ  چوونە لووتی پیر چووپانێ
حەمەسەوزە و دێڵەکوڵکن  چوونە سەر بەندەنی چڵکن
قالەی حاجی بە دۆڵێدا  گۆڵە نازێی لە قۆڵێدا
بەتاو تاپڕی دەسدایە  خۆی بادەدا دەڵێی شایە
بەکرەسوور و فەقێ ڕەحمان  بەبێ چەك و تاژی و گۆچان
ڕاو دابەش بوو بە ڕاوێژان  گیرا پۆپەی یاڵ و لێژان
ئەوڕۆ ڕاوە ڕۆژی پیاوە  شینە فڕی، پاشەڕاوە
هێواش بڕۆن، بڕوانن باش  قۆڵێ لە پێش دەستێ لە پاش
ڕاو دابەشبوو بە فیشاڵان  گیرا گەرووی بەرز و پاڵان
بەشبەش کرا خواروو و سەروو  گیرا ڕێگەی دەرەو دەروو
کەروێشکە شین چاوی لێبوو  دوژمن دیسان بۆی بەڕێبوو
نەیدەتوانی هەستێ ڕاکا  خۆببوێرێ، دەرچێ ڕاکا
بۆ کوێ هەڵێ ئەو هەژارە  دەوری بە ڕاوچی حەسارە
گرتوویانە چوار تەرەف  زۆر نزیکە چەق و تەف
کەوتە نەزر و پاڕانەوان  چاوقووچان و خۆدانەوان

بۆ تۆزیٚ ژین کردی بە شین    روو بە خوا و ئاسمانی شین
نزای گەیاندە سەمایە    نزای تەنگانان، ڕەوایە
روو لە مەرگە گیانلەبەرە    بەرەو خوا پەنابەرە
مەلا ئەبووبەکرە سوورە    چاوی لێیە هێشتا دوورە
ماتەی داوە لە کەلێنیٚ    بۆ تۆزیٚ ژین دەنالێنیٚ
بەکرە بزەی شادی هاتیٚ    تاژی نییە بەری داتیٚ
دەستی دەباتە بنگوێیان    راوچی هێنانەسەر سوێیان
دای لە سیٚ تەپلیٚ تەماڵی    راوچی هەموو کردن حاڵی
هەی تەماڵە تەماڵی خۆم    میری ڕاوی؟ غولامی تۆم
راوچی هەموو بۆی داوەڕین    سیٚجرتەکی بە هەڵپەڕین
حەمەمەلا هەڵدەداتیٚ    دەڵیٚ بە سوورەی بەراتیٚ
خواریٚ و سەرێی لێنەگرن    نەدەیکوژن، نەدەیگرن
تا من دەڕۆمە بەندەنیٚ    دەخیل نەچن دەستی دەنیٚ
هۆشو هەبیٚ دەرنەپەڕیٚ    هەر دەرپەڕیٚ تێدەپەڕیٚ
جندۆکەیە چارەی نایە    تیژپەڕێکە دەڵێی بایە
قادر دەڵیٚ حەمەمەلا    قسەت ڕەق و گێڕ و شەلە
دەڵێی لە گوێیان دا، کەڕی    هەر بە قسەی خۆت هەڵدەپەڕی
هەر ئێستاکە بەو تاپڕە    دەیکەم بە بێژنگی شڕە
نانا نەکەی قالەی حەمە    لێمتێکنەدەی جومعە و شەمە
نایهەنگێوی هێن چەپلەری    دەمانخەیتە دەردیسەری
قادر بە تووڕەیی ڕاسا    چیا لە ترسانی، تاسا
رۆ هاتە کۆنە تاپڕیٚ    نەوەك تاپڕ بەڵکو گڕیٚ
سێرەی مەرگی لێهەنگاوت    تاپڕ تەقی، نەیهەنگاوت
نەیهەنگاوت وەکوو جاران    سەدان تف و لۆمەی باران

رۆڵەی بەچەنگ بەکرەسوورە — تێپڕۆهێنا توند و تووڕە
بۆی نەگیرا کاکی دڵتەڕ — پێی حەرام بێ سیغاری زەڕ
کەروێشکە شین لەو لانەدا — لەنێو گەرووی تەنگانەدا
کەوتە هەستی دەستە و کەری — لەناو مێزی دەردیسەری
حەوا کەوت وەکوو بازێ — کەوتە دەمی تاژییە نازێ
تێپڕۆهێنا هەل و بردێ — لەسەر سوێگەی زەردوبەردێ
نەکردە بوو هێن تێشکا — بۆ هەمیشە شل بوو شکا
نارێ نۆبەی کەوتە دەستی — تێیڕۆهێنا دەمودەستی
لە ڕەوەزێ کەوتە خوارێ — قووڕەی نەبڕا تا ئێوارێ
تێڕۆهاتن تاژی و تووڵە — بۆر و کوڵکن شڵە و قوڵە
ئەو لێیدەدا دەیدا بەوی — بوو بە تۆز و خومار زەوی
دایڕژانێ نۆبە نۆبە — تەنگانە بوو خوا تۆبە
کەروێشکە شین جانانەیە — قارەمانی تەنگانەیە
کەوتە فیڵ و بادانەوان — پاشەکشێ و گەڕانەوان
کەوتە شیو و تەرت و پاڵان — تاژی و تووڵە بۆی داماڵان
ئەوەی دەمی تێژەنی بوو — ڕێگەچاری لێتەنیبوو
هەر نارێ بوو نارەی دەهات — تێیڕۆدێنا بۆی نەدەهات
کەروێشکە شین ویستی دەرچێ — خۆی باوێتە گێژ و پەرچێ
لە لای قالەی حاجی حەمە — ویستی دەرچێ لە هەمهەمە
ویستی خۆ باوێتە خوارێ — دەرچێ لە دەس تاژییە نارێ
نارێ وەهای دەم تێنابوو — شادەی مەرگی پێ هێنابوو
نەیزانی قادر دڵپڕە — دەستی بە ماشەی تاپڕە
ئەو فیشەکی گورچووبڕە — چوار گوللەیە پڕ لە گڕە
لە لانێدا نەیپێکاوە — لۆمە پوورەی لەسەر داوە

دەیهەوێ ئابرووی پێ وەکرێ — لە غارێدا جیگەی ببڕێ
سەری بردە سەر تفەنگێ — هەلوەرێنێ تانە و نەنگێ
دووکەڵ لە تاپڕ دەرکەوت — نێچیر ڕۆیی و تاژی کەوت
چەکی دەسی نەهەنگێوان — راوی لە ڕاوکەران شێوان
راوچی دەبێ هەنگێوە بێ — قارەمانی ئەو نێوە بێ
راوچی دەبێ تفەنگچی بێ — بۆ ڕاو، چەپلەر، کەڵکی چی بێ
چەپلەر بەلایە بۆ ڕاوێ — دەبێ چەك بێ، قسەی ناوێ
راوچی بێبڕ، هەموو دڵپڕ — بە تیتاڵ و قسەی دەمشڕ
کۆبوونەوە هەناسەتەنگ — بە نیوە ئاشتی و نیوە جەنگ
رێکی قسان، فەقێ ڕەحمان — وریا، زۆرزان، لێزان، بزان
زەردەی هاویشتە سەر لێوان — بۆ ناو بژی و قیرەی نێوان
هاتە گوفتار و قسەی قوت — لە دلان درا، بە دەم چی گوت
گوتی برام لێك مۆڕ مەبن — سواری پلوتکی قۆڕ مەبن
راو بە ڕۆژ و کات و هەلە — زیندەوەر زیندووی ئەجەلە
قادر لە مێژە ڕاوکەرە — هەنگێوەیە، کەی چەپلەرە
ناوداریکی ناوچەی ڕاوە — هەنگێوەیی قادر، قاوە
لەگەڵ ئەجەل هیچ ناکرێ — زیندوو بێ‌ئەجەل نامرێ
برام بۆ هەموو جانداری — ئەجەل هەیە، کاتی جارێ
ئەو کەروێشکە وەختی ماوە — دەنا قادر پیاوی ڕاوە
سێرە ڕاست و هەنگێوەیە — ناودارێکی ئەو نێوەیە
کەروێشکە شین نۆبەی نەهات — بە دەس خوان هاتوونەهات
مزگێنی بێ تاژییە ناری — لەگەڵ ڕووداوان دەچاری
برینەکەی کەپکە و حیزە — دوو سێ جاران پێی هەڵمیزە
حەکیم و لوقمانی ناوێ — دێتەوە ڕاو بۆ جێ‌ڕاوێ

## کەروێشکە شین و شینگێڕی

نەجاتی بوو کەروێشکە شین
هیوابڕاو، نەبوو لە ژین

نەجاتی بوو بە حاڵەحاڵ
لێیدەچۆڕا خوێنی زوڵاڵ

هەلا، هەلا، لەشی شلی
پڕ لە برین شانوملی

هەڵدەتووتا لەش بەبرین
هەنیسکی سەر چاوی بەشین

دەناڵێنێ بووە دڵڕێش
جەرگی سەمای بۆ دێتە ئێش

لەگەڵ خوا کەوتە وتار
گلەی هەبوو نەیەك، هەزار

دەیگوت ئەی خاوەنی زەوی
ئەتۆ بەرز و ئەمن نەوی

تۆ خالق و من مەخلووقم
پێدەزانی چەن شلووقم

من نەبوو بووم، تۆ هێناتم
پێمخۆش نەبوو، بۆ شێلاتم

بۆچی ئاوات هێنامەدەر
سەرلێشێواو، بێسەرەدەر

چی تێدەچوو بڕێ زل بام
خاوەن مەچەك و بەمل بام

یا نەبووبام، یا وا نەبام
ئەوەن چووك و ساوا نەبام

نەکەر بو بام، نەکەروێشك
نە مێشکخۆر نە بێمێشك

ئەی خاوەنی نەخش و کران
لە دڵ مەگرە وتەی گران

روونە هەژاری دەستی تۆم
قەڵتوبڕی، مقەستی تۆم

نەم گەرەکە، ژینی دیلی
کەمێ ژیان بەلام فیلی

ژینی کۆیلەتی، چرووکە
گەڕی و گەرۆڵییە، پووکە

کێ پێیخۆشە، هەموو هەلێ
بێتە حەلەلەی سەگەلێ

نەبێ باشە بەوجۆرە ژین
ژین کەوا بێ، خۆشە نەژین

چارم نییە دەڕۆم لێرە
دەم فەوتێنی، بەکرە شێرە

وا تێکدەخەم باروبنەم
کەس نەزانێ شوێنەونەم

لە ئاژاوە دەچمە دەرێ
دەچم بۆ لای پەنابەرێ

بە جێدێڵێم زێدو جێگام
با بەس بگرن، لە ڕێ، ڕێگام

کەروێشکە شین بە خەیالان
دەفڕێ بە هەر دوو شابالان

لە گەرووگای هەژاریدا   کوفری دەهات بە زاریدا
کفت و بریندار و جەدەو   کەوتە مێزی وەنەوز و خەو
چاوی چوونە بیرەخەوێ   تا هاتە ڕوو جووتەی کەوێ
لە خەو هەستا جولاّیەوە   سووڕێکی دا و گەڕایەوە
بیستی دەنگێ لە نزیکی   ناسکتر لە دەنگی پیکی
دیتی، سیسرێ، بۆی دەخوێنێ   هێواش هێواش دەیدوێنێ
بە زمانێکی شیرین دەڵێ   نامەردە ئەو کەسەی هەڵێ
زۆر ناخۆشە دەربەدەری   بێدەرمانە، ژانەسەری
نیشتمانت بەجێبێڵی   زۆڵی، نێرینە نی، دێڵی
لە هەر لا بەکرە کوێرە هەن   سەگ و تولەی بێخێرە هەن
خاوێن بژی و هەر لێرە بە   بێخەم لە کێشەوگێرە بە
نێر بە خاوەن بیروڕا بە   بۆ نیشتمانت، فیدا بە
شەهید بی زیندوو ژیاوی   لە مێژوودا، لاوی، ماوی

٦٨/١٠/٢

## بووکەسوورەی کۆشکی سوور

له گوندێکی ڕازاوەدا — گوندێ خانێ، لەو ناوەدا
سەردەمێکی ئاوارە بووم — دەربەدەر و غەوارە بووم
هیچکەس نەناس، بێکەس بێدەر — بێگیان بەژان بە دەردیسەر
ڕووتەڵ، بێشام، شایی بەخۆ — بەخەم، بێجەم، بێنان و دۆ
بێتووتن، بێقلیان و پەڕ — بەلەش پیر و بە دڵ دڵتەڕ
بەخەم، بێخەو، کاس و وڕ بووم — جەمێ پڕ و سەدان قڕ بووم
جێگەی شادیم پیاسە بوو — بەڵگەی مانم، هەناسە بوو
کۆشکێ هەبوو، لەبەردێدا — کێ دەیزانی کێ لەوێدا
باڵەخانەی خانی دێ بوو — وەکوو جلکی بووکان نوێ بوو
بەرز و بڵیند و بەڵەک بوو — تەلەسمی پۆز و کەڵەک بوو
خشتی لە ئاڵتوونی سوور بوو — ئاڵتوون چییە؟ مەکۆی نوور بوو
باخەگوڵ بوو، دەوروبەری — دڵان دەبوون بە مشتەری
کرێوە با، یا بارانە — دەچوومە وێ ئێوارانە
دەچوومە وێ، بە خۆبادان — بۆ تۆسقاڵێ خەم بە بادان
لەناو گوڵان دەخولامەوە — بە بیرۆکان دەکولامەوە
هەرگا گوڵێ خۆی دەبزاوت — گیانی منی هەڵدەتاوت
هەچی مەلێ دەیجریوان — ئێسکی لەشم دەیزریوان
ئەوەی زیاتر دایدەبێژام — ژاری تاڵی[1] پێ دەچێژام،
ئەو کۆشکە بوو لە بەردەما — بن لە زەوی، سەر لە سەما
کۆشکێ لەنێو باخی گەشا — حاکم بەسەر ڕووت و ڕەشا
بەشی زیاتر بەوی دێشام — ڕیشەی دڵی ڕادەکێشام

[1] "ژاری مار"یش هاتووە.

ئەو تەقسیمە کێ کردوویە؟
بە خوێنی گەل ، خان زیندوویە

لەو کۆشکەدا، پەنجەرەیێك
روو بە چەم و مەنزەرەیێك

کرایەوە بە هێواشی
سەدان دەردی تری تاشی

دیتم چاوێ لێمدەگەڕێ
ڕەنگە لێرەش لێمنەگەڕێ

چاوێکی گەش بۆم دەڕوانی
جوانە وەکوو چاوی گیانێ

چاوی بووکێکی بەدیمەن
جوانتر لە بەهار و چیمەن

پەردەی بە هێواشی لادا
ویستی، خەمێ وەبەر بادا

هەرکە پەردەی هەڵدایەوە
سەدان دەردم دەکولایەوە

جاروبارێ دەیدواندم
لەناو خەما دەینوواندم

بووکێکی سوور، لەناو بەندێ
شیرین وەکوو شیلەی قەندێ

بە ئیشارە، بە زمانی حاڵ
حاڵی کردم، ڕووداوی تاڵ

حاڵی کردم، نەوەك بەزار
دەردەدڵێ، پێی بوو هەزار

کوتی، لێرە بەندم، بەندم
پۆڕی ناو تۆڕ و کەمەندم

بەندی خانی خاوەن پارەم
ئەژنۆ شکاو، پارەپارەم

گەردنی کێل، ڕوومەتی سوور
لالەشی ڕووت، بەلەکی توور

شلکەڕانی تورت و نەرم
بنکەی کەمەر، جێگەی شەرم

کەوتوونە دەس کەمەرشکێن
خانی خاوەن پۆز و ڕدێن

گوتی بووکی ناو زێڕانم
بۆ تۆ نییە چاوگێڕانم

بۆ ئاواتم چاو دەگێڕم
نەوەك بۆ تۆ، برای گێڕم

چاوەڕوانی هەلێکی وام
بێتە دەرێ ڕۆژی هیوام

چاوەڕوانم بۆ کاوەیەك
هەڵگرێنی ئاژاوەیەك

تێکڕووخێنێ لە بن، کۆشکان
تێکشکێنێ، سەر و مێشکان

---

١ "تاشلۆرە"ش هاتووە

٢ "لەشی"ش هاتووە

مێـــشکە ســـەری هـــەژارکوژان، بەســـەر یـــەکا بێتـــە پـــژان
بووکەســـوورەی کۆشـــك ســـووران بێنـــەوە ڕیـــزی ڕووســـووران
بـــە بـــای نـــەرمی ئازادییـــەك هـــەمووو دەردی بێدادییـــەك
بـــە بـادادەن لـــە گـــۆێ چـــەمان بکـــوتن لێـــو و دەمـــی خـــەمان
گـــوێ ڕادێـــرن بـــۆ بـــالۆران بـــۆ حـــەیران و لـــۆرە لـــۆران
بلـــــوێری شـــــوان، لاوە لاوە قـــارەی مـــەڕ و بـــەرخی ســـاوا
شـــوان و بێـــر و هۆهـــۆی مـــەڕان تاشـــەللۆرە[1]، وێـــڕا گـــەڕان
قاقـــا، جەفـــەنگ و هەڵبـــەزین چـــنگەپۆپە، یـــەکتر گـــەزین
چـــاوەبڕکێ، ئـــاو پرژێنـــــە خـــــۆلارۆکێ، مەشـــــکەژێنە
هـــــەقرێمـــــەقۆ بادانـــــەوە بـــــە ئـــازادی ســـــووڕانەوە
ســـەدان کۆشـــکی بـــە پانـــەوە دەبـــەر مـــرێ ، بـــە خانـــەوە
دەســـتی کێـــشا پـــەردەی دڕی نیـــشانیدا، گیـــانی[2] ســـڕی
گـــوتی خـــانی خـــاوەن پـــلان چـــەقڵی چـــاوی، چـــاوبەکلان
خـــانی خـــاوەن پـــارە و قۆشـــە بـــۆ خـــۆی دەوێ پارووە خۆشـــە
تـــا نـــەڕووخێ کۆشکەســـــوورە بەنـــدی دەبـــێ، بووکەســـــوورە

١٣٤٤ . گوندی پشتئاشان . کوردستانی باشوور

## ماری شێخ ئۆمەری

وەک بیستوومە لە هاودەمان
لە شوعەرا و گوڵ بە دەمان[1]

لە ناو ماڵی گەورەماڵان
لە داستانی کۆنەساڵان

ڕۆژێ هەبوو شێخ ئۆمەرێ
لە کوردستانی پشدەرێ

خوواناس و نوور لەسەر بوو
بەتام و بۆن بەسێبەر بوو

خێری خوا بوو لەسەر زەوی
پەنا بوو بۆ سرک و کەوی

شێخ بوو، بەهێز بوو، بێبێز بوو
فریشتێکی بەپارێز بوو

چی گفتولفتی زاری بوو
بەهەشت لەوێڕا دیاری بوو

جند و دێوی دەدواندن
خاشەی دەبڕین، دەینواندن

دەچووە ئاسمانی ئەستێران
ژێر پێی دەنا سەری شێران

ڕازاوە بوو کەپر و کۆزی
زۆری هەبوو ڕزق و ڕۆزی

نەدەوەستا لە زرێیان
گریگوشا، لە گرێیان

ڕووگە بوو، بۆ دەروێشۆکان
ڕووبەڕووی بوون لەسەر چۆکان

باوەشێخی، چاو بەشینان
مەڵحەم بوو، بۆ سەر برینان

بۆ زۆربەی دەردان دەوا بوو
بەرنووا بوو، خێری خوا بوو

ساڵی هەوەڵی بەهار بوو
باران لەسەر زەوی سوار بوو

زەوی لە ئاو تێروپڕ بوو
کوێ قاقڕ بوو، لە گوڵ پڕ بوو

دەشت و زوورکان، لێر و کڕاڵ
تەرت و تەلان، پەسیو و پاڵ

بەگوڵ، بەچڵ، بە خونچەی ئاڵ
ببوونە بەهەشتی خەیاڵ

شێخی جوانی، خەیاڵاوی
ڕۆژێ خەیاڵ هاتە ڕاوی

خەیاڵ داوی بۆ نایەوە
گرتی و بردی و پێچایەوە

[1] «لە خۆشدەمان»یش هاتووە

بــەرەو چــیا پێـــی‌هـــەڵگێڕا
سـەدان خـەیاڵی وێگێـڕا

دیمــەن، دیــدار، گەشـت و گـوزار
قاسـپەی کـەوان، ڕەنگـی بـەهار

تکـەی ڕنـدوو، فیکـەی مـەلان
زیقـەی شـالوور، لـوورەی تـەلان

سـەدان هـەزار دیمـەنی تـر
هـۆرە و لـۆرە و سـەربەندی تـر

لـە دڵـی شـێخا بوونـە خـۆرە
هانیـان دەدا، نـۆرە نـۆرە

ئاقیبـەت شـێخیان بەپێخـست
بـەرەو کوێـستانیان وەڕێخـست

شـێخی جحێـڵ، بەربـەیانێ
بـۆ تـۆزە خـەم بـە بـادانێ

بـۆ تماشـا لـە دیمـەنان
لـە زەردوبـەرد و چـیمەنان

بـەرەو چـیا پێهەڵگـەڕا
بـۆنی گـوڵانی سـەرگەڕا

گەیـشتە باوەشـی شـاخان
جـوانتر، لـە لاچـاوی باخـان

نـە شـاخ، بـەڵکو بەهەشـتی چاو
پـەرژینی گـوڵ، بـەگوڵ کـراو

بـۆنی بیـزا و گیابەنـد و خـاو
هـەڵز و کـەما، بێـژانی لاو

بڕکەهەڵاڵـە و چـەورۆکە
گوڵاڵـە، کاشمـە، مەندۆکـە

چـاوەکوتکە، خـۆش‌هەڵکەنـە
بەڵگەنەسـیر گیـا بەڵگەنـە

نـۆکنۆکیلـە و جاوەڵووکـە
گیاچـۆلەکە، سـێوەڵووکە

گەزنـەخۆرە، گیـا بنێـشتە
گیاپڵاوە،لووشـە چێـشتە

پێـچکەکوڕادە، گێلاخـە
قەیتەرانـە، گـوڵقەباخـە

چـەقە، چـەورین، بۆڕەسـوورە
لۆشـین، چـەقەلۆ، چـنوورە

سوێـسن، وەنەوشـە، هـەلاوە
قاتەڕەشـین، بنکـولاوە

شنگەشـاخە، گیابەرخۆڵـە
گۆبەڕۆکـە، گەلاسـۆڵە

هێـرۆ، تـەڕەزەن، مێلاقـە
شـیرین‌شـۆکە، تەنیالاقـە

پنگـە، گـەزیزە، گەزگـەزە
مژمژۆکـە، گیاترشـۆکە، تاڵەگـەزە

سەدان گوڵی تری بەڕوو
هەموو نەخشی خوا لە ڕوو

لە ڕەنگ و ڕوو هەموو تەیار
بوونە نەخشی، بووره و بەیار

لە ڕووی چیاخاڵ و کەزین
بوونە جادوو بۆ دڵ دزین

بوونە ڕاوچی بۆ ڕاوەچاو
وریا نەبی دەکەویە داو

گوڵان، کۆکۆ، خۆدەنوێنن
دەیانەوێ شێخ بدوێنن

دەیانەوێ شێخ بدۆشن
تەپڵ و دەف پێ بفرۆشن

جبە و عەبای لەبەر بدڕن
هەرزان شەرم و حەیای بکڕن

گوڵێ بەچاو یەك بە داوێن
تیران، بەرەو شێخی داوێن

پۆلەگوڵی مێخەك لە کڵ
چاوڕەش، بەبێ کلدان و مل

شلونازا ودەمبە بزەن
فێری فێڵ و فووت و گزەن

لەگەڵ شەوبۆی لەچکە تۆڕی
ڕێگەیان لە شێخی گۆڕی

وێرا هوجومی بۆ دەبەن
بەندی دڵی لە بەند دەبەن

گوڵێ چاوی لێدادەگرێ
یەك، گوڵاوی بۆ ڕادەگرێ

یەکێ شێعری پێهەڵدەڵێ
یەك داستانی لەگەڵ دەڵێ

یەك لاتاوی پێدا دەدا
یەك پێداوی، بۆ بادەدا

یەکێ دەستی پێ هەستری
یەك بە مستێ جەرگی بڕی

یەکێ یەخەی بۆ کردەوە
یەکێ شەرمی لێ شردەوە

یەك نەقورچی لێبادەدا
یەك کراسی بۆ لادەدا

یەك ڕوومەتی دەخاتە دەم
یەك هەناوی دەخاتە خەم

یەك دەبێتە حەیا دۆشی
یەك بۆ ئۆيين دێتە کۆشی

یەکێ بسکی بۆ بادەدا
یەکێ عەمری بە بادا دەدا

یەکێ سەمای لەبەر دەکا
یەك ئەوینی دەبەر دەکا

یەك ئەوینی تێدەڕێژێ
یەك بە نیگایێ دەینێژێ

گوڵی پەسیو و پاڵ و شان    دەسیان لە شێخی وا وەشان

خۆی لێ ونبوو هاتە دۆڕان    بیر و بەراوردی گۆڕان

لەو لاشەوە شووبای گەوان    دەنگی مەل و قاقای کەوان

شمشاڵی شوان، قنەی بێری    مرقەی بەران، نکەی نێری

گوڵچن، کوێستانچی، کچ و کوڕ    چاوڕەش، هەنگێوە، بەلەك پڕ

قریوە، بالۆرە، ڕاپەڕین    نزا، نیاز، تێکڕا خوڕین

بێنە و بەرە و نابێ لاچۆ    زۆران، قولات و قەلاچۆ

قاقا و لیقە، لێكڕاكێشان    چنگەپۆپە و چۆپیکێشان

لەچکی تەنك، خامەکی شین    بەرۆکی ڕووت، کراسی چین

لەمپەری شەرمی، هەڵبڕی    ئابڕووی شێخی بەلاش کڕی

شەیتان فرسەتی لێهێنا    شێخەتییەکەی وەژێر پێ نا

جوانی بسك و کەزێ شۆڕان    شێخیان هێنا باری دڕان

بڕکەزێڕی گوێبەگواران    شێخیان هێنا ناو قوماران

ڕەشبەڵەکی کیژ و کوڕان    دەف و تەپڵی بە شێخ دڕان

بەندی بەرۆك جەرگی بڕی    عەبای شەرمی شێخی کڕی

گەڕی شەیتان هاتە قۆپی    شێخی گەیاندە سەرچۆپی

کەوتە داوی خەج و زینان    ڕۆیە، ڕیزی دەسگوشینان

بوو بە بەیتی فڕیفڕی    لە ڕووی ڕووان حەیا فڕی

بۆ شێخ بەحەشتە سەرزەوی    ئەوەی هەبێ چش بێ، لەوی

شێخم پۆنگە لە مەستیدا    جووتەی دۆیان لە دەستیدا

هەڵدەپەڕێ، سێجرتەکی    چەپی، سێپێیی، گردەکی

شێخە و دەستی نەرمونۆڵە    دۆگێرە، ژیرە، پیتۆڵە

شێخۆمەرم، دوو لە ڕووتان    بوو بە شێخی بەلەكڕووتان

سینەی سپی، پشتێنی شل    لێوی گۆشتن، چاوی بەكل

بۆنی سمڵ و مێخەكبەندان    تاموبۆنی قام و بەندان

دەسرەی دەسی چۆپیگێڕان    سیلەی چاوی، چاوبگێڕان

ڕێگەیان لە شێخی شێوان    كەوتە بیری دەم و لێوان

لەگەڵ بسك و كەزی شۆڕان    تا ئێوارێ نسێ شۆڕان

چی نەدەبوو بیكا، كردی    لە دین چی پێمابوو شردی

تۆبەی بەسەر یەكا شكا    حەیا هەچی مابوو تكا

ئێوارێیە و نسێ بۆرن    كەزی شۆڕ و كراس مۆرن

شێخیان لە شایە هەڵبڕی    حەیا چی بوو لێیان كڕی

بردیانە سای پێچك و داران    بوو بە پاررووی دەم و زاران

ڕۆژ گەیشتە ڕۆژاوایە    شێخم هەر گەرمە سەودایە

سێبەر گەیشتە كەڵەكان    بەر بوو دەستی ڕەشبەڵەكان

بەر بوو دەستی گەرمە گەڕان    سووتا هەناوی دڵتەڕان

شێخم لەگەڵ ڕووبەخاڵێ    گەڕایەوە بەرەو ماڵێ

لە ڕەوەزان هاتە خوارێ    دیتی دیارە كەڕەمارێ

هەڵدەلەرزێ بە سەرمایە    دەربەدەر و بێئەنوایە

سەرمایەتی، ڕووت وقووتە    شێخۆمەر دڵی پێی سووتا

وتی مارە و گیانلەبەرە    تووشی بەڵا و دەردیسەرە

نەخۆشی دەستی سەرمایە    دەیبەمەوە خێری خوایە

دەیبەمەوە گوێ تەندوورێ    دەیكەمە مۆجزەی ژوورێ

نەوەك بڵێن شێخ دۆڕاوە    ودم و فەڕی لە دەسداوە

تا مارم بێ هەر شێخ دەبم    خاوەن دەروێش و مێخ دەبم

ماری بردەوە بۆ ماڵێ
جێگەی بردە بن هەرزاڵێ

تا وەبووژێ بە گەرمایە
گیانلەبەرە و بێئەنوایە

زۆر پێنەچوو مارەکەرە
بووژایەوە خێوی شەرە

چاوی زیت و گەش و هاری
خەیانەتیان لێدەباری

هێندی دایە شێخی نەمر
جەرگەقەل و شێوی کزر

یەك موورە بوو، سەروبەری
بوو بە ماری شێخۆمەری

لێرە و لەوێ باسیان دەکرد
سۆڤ ریشن، دەروێشی ورد

دەیانگوت هیممەتی پیرە
ئەو مارە وا ڕام و گیرە

پێوەنادا تۆبەکارە
لەغاوی شێخی لە زارە

مار مایەوە تا بەهارێ
کەوی ببوو، ببووە یارێ

بۆنی بەهاری پێگەیی
مار وریایە زوو تێگەیی

مار هەر مارە نابێتە یار
چاکەی لەگەڵ بکەی هەزار

مەگەر ڕۆژێکی نەمێنێ
زەبری خۆی هەر دەوەشێنێ

مارە و ماتی خەیانەتە
چاوەڕوانی یەك فرسەتە

ویستی زەبرێ بووەشێنێ
شێخی نەزان تێگەیێنێ

بێژێ دوژمن بۆ دۆس نابێ
بۆ نێوماڵ و جێکۆز نابێ

ئاواڵە بوو، دەرگا شەوێ
دوژمن ئیتر چیدی دەوێ؟

دەبێ هەڵێ لە زیندانێ
بڕواتەوە بۆ کوێستانێ

هاتە سەرخۆ مارەکەرە
وتی هەڵە و هەلی شەرە

تەمای کردە کوڕی شێخی
پڕ کا لە ژار، پێستی، تووێخی

بۆ لای کوڕی شێخی خزی
نەرمایی ڕوومەتی گەزی

ئەوکی گەزی ژاری تێخست
خۆی دزیەوە، بێهەستوخوست

کوڕی شێخی تازەلاوێ / جوانتر لە تیشکی هەتاوێ
تاقانە بوو، چواردە ساڵێ / جوانتر لە جوانی خەیاڵێ
جوانتر لە دیمەنی زێڕان / ڕەوان وەکوو پیت و دێران
کوڕ کەوتە ناو ئێشوژانێ / چاری نەکرد چ لوقمانێ
زوو بۆ مەرگ، هاتە سەری / بۆ شێخ ماوە قوڕبەسەری
شێخ ئۆمەرم مەرگە مانی / پەشیمانە لە تاوانی
ڕەشبەڵەکی ڕۆژی بەرێ / ئەو بەڵایەی هێنا سەرێ
لەوە گەڕێ ئەوی ڕۆیی / لە دووی مەڕۆ، ڕۆیی، ڕۆیی
پەند وەرگرە لە ژیانان / لە پسپۆڕ و لە لێزانان
دوژمن نابێ هەلی دەیەی / جەرگەقەل و مەلی دەیەی
گورگ گورگە، کەوی نابێ / بەرزی وەکەی، نەوی نابێ
زاڵم هەرچەند بێپەرستی / زەلیل دەکەویە بەردەستی
بابی هەموو قسەی تەیار / نەزانیە وەرزی بەیار
شێخۆمەرم نەگۆڕابا / وەکوو بیستت نەدۆڕابا
مار نەدەبوو بە مێملی / نەدەوەری، بەری دڵی
تاکوو تۆ دوژمنپەرستی / هەر شکاوی هەر شکستی
دوژمن قەڵەو بێ تۆ لەڕی / پاروەخۆشەی دەمی تەڕی

١٣٦٨/١٠/٦

## نەخۆشی بەرەو گۆڕ

نەخۆش و دڵپڕ لە خەمم
لەشم گەرمە دەڵێی شەمم

جیهان لەبەر چاوم تەمە
ئەوەی تێمئاڵاوە خەمە

هاوباوەشی دەردوخەمم
ئەوەن وشکە لێو و دەمم

دەستی هیوای بەتاڵ کردووم
بەرەو مردنی قاڵ کردووم

شەختەی مەرگم لێباریوە
بەرگ و گەڵام هەڵوەریوە

لەرزوتاوم هێن لەسەرن
ڕەنگە بەرەو گۆڕم بەرن

غڵدەی زمان و زاراوەم
دیارە دوو چاری ئاژاوەم

مەرگە میوانی ئەو جارەم
ئەژنۆ شکاو پارەپارەم

مەرگە، گەرم بۆ دەگێڕێ
بەرداشە، لاشەم دەهێڕێ

لێم وەکۆبن خزم و برام
لە ژین کوژاوەیە، چرام

کە دەتوانن زوو بمگەنێ
دەوای نەمردنم دەنێ

ئەگەر گەل و ئەگەر هۆزن
ئەگەر شێخ و پێ پیرۆزن

ئەگەر خاوەن زێو و زێڕن
لە دەس ئەو مەرگە، وەمگێڕن

ئیزرائیلە، میوانی نوێم
جارجارە، سەر دێنێتە سوێم

پێمدەڵێ کوا زێڕ و زێوت
کوا حاکم و میر و خێوت

کوا حەکیم و نوشتە و دێرێ
لە دەس ئەو مەرگە وەتگێڕێ

زۆر توونیمە، تەنگەتاوم
ئاو دانادا، گەرووی خاوم

بەلۆکە ئاوم، بۆ بێنن
تکتک لە گەرووم تکێنن

چاوم لە چاوان تۆراون
زەق وەستاون، ڕاوەستاون

با بێنە لام، چووک و گەورەم
وێرا دانیشن لە دەورەم

تێیانفکرم کەمێکی تر
ڕەنگە نەیانبینم چیتر

چ نەزان و چ پسپۆڕم
نۆبەی خۆمە، بەرەو گۆڕم

لای ئێوە کەمێکم ماوە
ئازادم کەن، ماڵتان ئاوا

کـــوڕی گـــەورەم وەرە پێـــشێ
زەحمـــــەتم گـــەلێ کێـــشاوە
کـــوڕم دەنگـــت گـــەلێ شـــیکە
دەبـــــۆم هەڵـــدێرە قـــامێکی
ســـەبر، ســـەبر لـــەبن ســـەرم
بـــۆم بێـــژەوە، ڕۆڵـــەی نـــەجیب
لاتوانـــەبێ، بابـــت دەمـــرێ
لـــە مـــەرگی بابـــت، مەترســـێ
بۆم هەڵـدێرە، بـە دەنگـی خـۆش
هـــەوای ئـــازادی گـــەل بێـــژە
بـــۆ ئـــازادی، بێـــژی، کـــوردی
ئـــازادی، پێخـــۆرە، بەرگـــە
بـــۆ ئـــازادی بەخـــەم نـــەبی
بـــۆم هەڵـــدێرە، کـــوڕی پیـــاوان
بـــۆمهـــەڵبڵێ بـــە شۆڕشـــان
بێـــژە بـــۆم بـــەیتی دونیایـــە
دونیـــا لـــە کـــێ نـــەبووە دەلاڵ؟
خـــانی، جزیـــری، بـــارزانی
ســـەدان هـــەزار لێزانـــی تـــر
بـــەرگی مـــەرگی دەبـــەر کـــردن
کـــوڕم بـــە ژیـــن بـــایی مەبـــە
بـــۆ هـــەژاری خـــەڵك بگـــری
بـــۆ ئـــازادی ڕابـــی ـــــ لاوی
بەژێردەســـــتی ڕازی مەبـــــە

بڕوانـــە بابـــت کـــوێی دێـــشێ
هـــەمووی بـــۆ تـــۆ بـــەجێماوە
لـــە گـــوێم دەڵێـــی ســـازوپیکە
قـــامی، شـــینگێڕی بـــابێکی
بـــە ســـۆزێکی، ســـۆز و نـــەرم
ســـرودی بـــەرزی ئـــەی ڕەقیـــب
لـــە گـــۆڕا ســـەنگەرێ دەگـــرێ
دوژمـــن لـــە کێلـــی دەترســـێ
نـە شـین، بـەڵکو شـادی، تـۆ خـۆش
بـــا گـــوێم لـــێبێ، جـــا بمنێـــژە
خـــۆت ناســـیوە، ژیـــری، وردی
ژیـــنی بـــێئـــازادی مەرگـــە
باشـــتر وایـــە نـــەبی، نـــەبی
بـــــەیتی ڕۆژی ڕوونـــــی لاوان
دژی مـــــەغوول و کۆرشـــــان
چـــەن بـــێبـــەزە و بـــێوەفایـــە
کێـــی نـــەهێنا، نـــەینا لـــە چـــاڵ؟
هـــەژار، هـــێمن، موکریـــانی
خـــاوەن چـــەك و زمـــانی تـــر
دەگـــــۆڕێ، ڕەشـــــی ڕاکـــــردن
کـــوڕی قۆشـــە و شـــایی مەبـــە
لـــە کـــەڵکی خـــەڵکیا بمـــری
پاشـــی مـــەرگ هێـــشتا مـــاوی
مـــەیموونی دەسبـــازی مەبـــە

شەیتان داوت لە ڕێ نەدا — شەڕافەتت ژێر پێ نەدا

ترس ڕێگات، پێنەگۆڕێ — بێ‌نێو، نەڕۆیە نێو گۆڕێ

بۆ من بەخەم دامەمێنە — رابە، خوشکەکانت بێنە

بێنە لام و مێزم لێدەن — مەڵحەمی شیوەنم لێدەن

بۆ بابی ئازادی نەدیو — بۆ کۆمەڵی شادی نەدیو

بۆ هەڵوەدا و تەرەکەمان — بۆ ڕووتەڵ و دڵ بەخەمان

بۆ هەژار و ڕەشوورووتان — بۆ شەهیدی هەڵەمووتان

بۆ دیلی ناو کۆتوبەندان — هەڵبەستن، هەڵبەست و بەندان

بۆ ئازادی بژین، بمرن — تا دەستی ئازادی دەگرن

ژینی بەئازادی، تاوێ — بەحەشتە، هیچ گلەی ناوێ

بێژن بە دۆستی بلاوم — لێموەکۆبن هەتا ماوم

پێش ئەوەی لە خاکم ڕاکەن — گەردنم بەدڵ ئازا کەن

دوا مردنم وەکوو شێران — بگرن ڕێگە و ڕچەی مێران

تەماح لەتوپەتوو نەکا — تووشی دار و پەتوو نەکا

لەگەڵ یەکا وەکوو یەک بن — بەکۆمەڵ بن، نەیەک یەک بن

بەکۆمەڵ بن، سەردەکەون — یەکیەک بژین، بن دەکەون

خۆگەز نەبن، بەکەس دەبن — یانیگر بن، بێکەس دەبن

چڵپەوتڵتە، نەتان گۆڕێ — باوی لاویتان نەدۆڕێ

بە ڕووسووری بژین، لاون — پاش مردنتان هێشتا ماون

رۆڵە، کوڕی خۆشەویستم — هەچی شیوەنت دەبیستم

سەدان دەردم دێنەوە ژان — چی دی بۆ من مەگری، عەیان

چی‌دی بۆ من مەناڵێنە — هەستە یاسینخوێنێ بێنە

زووتر مەلا بێنە سەرم — یاسین خوێنێکی دەنگنەرم

نەرم بخوێنێ یاسینم — یاسین شفایە بۆ دینم

شادە و یاسینم لەگەڵ بێ
گڵ ناتوانێ بۆم دەغەڵ بێ

شادە و یاسین بمگرنەوە
شانازیمە بە مردنەوە

شادە و یاسین هاوکارم بێ
قەبر دەبێ گوڵزارم بێ

باکم لە تەنیایی نابێ
عەبدی خوا بایی نابێ

دەمم هەڵدە، چاوم لێکنێ
باڵم لە کراسی وەدەرنێ

روو بە قیبلە وەرمگێڕە
ماڵاوا بە خوام بسپێرە

کە چوومە سەر تاتەشۆرێ
کورم لە لاشەم مەتۆرێ

بۆ خۆت بمشۆ خاوێن و گەش
کەس نەزانێ بە عەیبی لەش

لەشی مردووو هێن بێڕەنگە
بێگانە ببینێ، نەنگە

پاشی شووشتن کفنم دەکەی
حەواڵەی مزگەوتم دەکەی

بەرەو ڕووگە درێژم کەن
دەم بە دۆعاوە نوێژم کەن

لە دەوروبەرم دانیشن
فەقێ و مەلا، سۆفی ڕیشن

هەتا گۆڕم دادەڕێژن
دۆعای بەخێرم بۆ بێژن

کاتێ لاشەم لە جاو دەگرن
تۆزێ سەبرم لەسەر بگرن

تا کەمێ تر بە چاوانم
لە چاوی جوان و بڕوانم

لەمەولا بەرەو سەفەرم
لەو سەفەرەم، بێخەبەرم

سەفەرم دوور و درێژە
نابەڵەدم، سەرمگێژە

ئەو خەمەشم لەسەر بارە
ناتانبینمەوە دووبارە

چم هەیە لێمبەجێماوە
ئەوەی پێمبڕاوە جاوە

جاولەبەر و چاولەبەرم
بێئازووقەی ڕێی سەفەرم

دەچمە شاری جاو لەبەران
بێسەر دەبم لەناو سەران

ماڵئاوایە لە زیندووان
دەبمە میوانی مردووان

چی زووترە ڕامەوەستن
لە دارەمەیتم، هەڵبەستن

هەڵمگرن، ڕامەمێنن
مردووی گۆڕان، چاوەڕێمن

ژێرخاکم کەن، زوو وەمشێرن    بە خوای گۆڕانم بسپێرن
کۆچی من دەرس بێ بۆتان    بێخەبەر مەبن لە خۆتان
دەس بە دۆعاوە ڕاوەستن    تەسلیمم کەن ڕامەوەستن
ناوی خوام لەسەر بێنن    دەزووی سەرم هەڵپسێنن
بە جێگەی سەرینی نەرم    بەردێ بنێنە ژێر سەرم
مەلا بێنە بۆ تەڵقینم    وەبیرم خاتەوە ژینم
بە کوردی تەڵقینم دادا    کەمێ ترسم لێ وەلادا
تەڵقینم با بە کوردی بێ    نە ترکی نە عارەبی بێ
لە هەرەڵی و مەڕنەمووکە    حاڵی نابم ئەوەندووکە
بە زمانی کوردی خۆماڵی    لە گۆڕیشا حاڵیم، حاڵی
مەلا بێژێ کوردی هەژار    خۆشی نەدیو بێداروبار
ئێستا ڕاسپێرت دێنە سەر    چاوزەق، دڵڕەق و بێزەرەر
لێت دەپرسن تۆ کوێندەری    جندی، دێوی، یا نە پەری
بێژە کوردێکی هەژارم    خەڵکی شاخ و لێڕەوارم
ئەو قووڵکەیە گۆڕی منە    گیان زیندووە، لاشەم ونە
خوای مەرگ خانەخوێمە    ئەو دەزانێ هەرچی پێمە
ئەوەی پێمە دەرد و کوڵە    سووتمانی ناو ماڵی دڵە
شین و کوڵی بێدادییە    هاوارم بۆ ئازادییە
ئێرە گۆڕە لێی ناترسم    تۆ، نی، خوایە بەرپرسم
خوا بۆخۆی باخەبەرە    کوردی بێکەس دەربەدەرە
بێجێگە و پێگە و هەتەرین    بێسەردار و بێڕێبەرین
پێمان ئێژن کورد و کورتن    لەسەر ماف و بەشان قرتن
هەقمان نییە لێک وەکۆبین    ئاغا و کوێخای ژینی خۆ بین
ئەو دەردە بوو پیری کردم    تووشی بیراوبیری کردم

هێندە جێگای پێ گوڕ کردم
هەتا تووشی گۆڕی کردم

لە گۆڕیشا هەدا نادەم
داوێنی خوا بەرنادەم

تاکوو هەقمان بۆ دەستێنێ
ناهەق خۆران دەفەوتێنێ

یاران! درەنگە وەمشێرن
بە خوای شێرانم بسپێرن

کێلی (ڕاوچی)و لێ نەگۆڕێ
داوای بردۆتە نێو گۆڕێ

کێلم، ڕۆژێ هەڵدەتەقێ
لە چاوی دوژمن دەچەقێ

دوژمن بێچاو و سەر دەبێ
سەرشۆڕ و چاولەبەر دەبێ

چینی هەژار دێنە سەر پێ
بێپێ، دەناڵێ بێدەرپێ

نۆبەی تۆڵەمان دێتەوە
فرمێسکی گەل دەسڕێتەوە

دەبێتە پیاو، تالان کراو
دەپسێنێ کۆتوبەند و داو

تۆڵەی تەڵەی وا دەستێنێ
زاڵم چی دی موو نەپسێنێ

خوایە ڕاوچی چیای کوردم
لە تاوی ئازادی مردم

کاتی ژیان، لە ژین کرام
دڵپڕ، لە گۆڕی شین خرام

کوردی تالان و هەڵەتم
ئاتاجی ڕوحم و بەزەتم

کوردی عارەبی نەزانم
لە تۆ و لە بەزەت میوانم

نەزانام و نە پسپۆڕم
بۆ لێپرسینی ناو گۆڕم

ترك و عارەبان مەنێرە
دیسان هەڵمبڕن لێرە

چیم لێدەکەی،بیکە گەورەم
لێرەش عەرەب نەبنە گەورەم

دەیان ساڵە من بێخەوم
مۆڵەتم دە با وەرکەوم

هەڵمەستێنە لە گۆڕێ
تا ئازادی دێتە گۆڕێ

کە هێزی باڕووتی، ڕووتان
تەختی ملهوڕانی سووتان

گیانێکی نوێم بێنە بەرێ
بە کراسی جاو بێمە دەرێ

بێژم، حەشرە، حەشری گەلە
کوردینە خڕ وەبن، هەلە

هەلی تۆڵەی تەڵە و فێڵە
ملهوڕ، بێشانومل، دێڵە

رۆژی شـــادی و هەڵپەڕکێیـــە خولێکـــــدان و کێبەرکێیـــــە

وێـــڕا دەژیـــن بـــەرز و نـــەوی خـــۆش دەبـــێ ژیـــنی ســـەرزەوی

ڕەش و ســـپی دەبنـــە بـــرا ناکرێتـــەوە، ئـــەوەی کـــرا

٣/٥/١٣٥٤ . شارۆکەی ڕەبەت

## وڵاتی خۆم

«گوندی گوێزێ»

ڕێکەوتی٧٤/٨/٢٥ لە گوندی گوێزێ، سەربە شاری سەقز کوڕەکوڕەکانی شایی بە خۆی ئەو گوندە، لە نوێ، نوێژگەیەکی نوێ داڕێژیان، بۆ خەڵکی گوندەکە داڕشت. و بە سەدان نەخش و دەس کری دڵ گرۆ و گرێچن کراو، خستیانە بەرچاو، نان و چێشت و چەشنەکەبابی تازەباب و سەدان بابۆڵەی مرۆشکێن و شەکراویان بۆ کردە چێژگەی شوکرانە و ڕۆییە ناو زار و گووپی میوانەکانەوە. دەبێ بڵێم میوان و غەوارە لە هەر لاوە بانگکرابوون، ئاپۆرەبوون بە لێشاوبوون، بەتایبەت قەتارەی مەلای ڕیشن و شاعیری نیخن، گا کلاشەی لێنەدەکرد. منیش لەگەڵ مەلاژن بەرەو گوێزێ وەرێ کەوتین، مامە کاوەشم لەبەرماڵەکە بەجێ هێشتبوو. ئەویش زۆر بزۆزە و تەقڵەکوت ماڵ و حاڵی بە مامبرایمی بانگبێژی ترکاشە ئەسپاردبوو. سەبارەت بە گێرە و کێشەی دین و عیلم پەخشانێکی جوانی نووسیبوو مەلا ڕیشەی لێ گریاندم و دەسی بە سەریدا هێنا و وتی: "ئافەرین بەچکە کوردی هەژار" و لە سەرڕا پێی خوێندەوە. فیلمبەرداری کراوە لایان وا بوو خۆم یاریدەم داوە. خودا هەڵناگرێ نەشمبیستبوو. بەڵام هیوام پێیەتی و لاشم وایە جوان دەنووسێ. خۆم و بەختم لە ڕیزی گێرەی شاعیران بوومە سەرەی شێعرۆکان. بۆ ئافەرین لە خەڵکی زیندووی ئەو گوندە، ئەو ڕستە هەڵبەستەم لە ژێر دروشمی«وڵاتی خۆم» ڕاگەیاندن.

گوندی گوێزێ

## ولاتی خۆم

بزەی دێتیٚ دەم و لێوی بەتاسەم     لە دڵ دەدویٚ گڕوگاڵی حەماسەم

لە خۆشیدا پشووی داوە هەناسەم     بەرەو گوێزیٚ لە ڕێدایە پیاسەم

ولاتی خۆم دەبینم دێتە بیرم

چەکی چەشنی شکێنی لاوی ژیرم

ولاتی خۆم ببینم خەم دەنێژم     لە چاوم ئەشکی شادی هەڵدەڕێژم

گڵوخوڵی تەلان و تەرت و لێژم     بە بێژنگی بژانگی دادەبێژم

«جەبەلحەمرینی»[١] خۆمە شیوو پاڵی

لە بیرم چیٚ لە ئەستۆمە وەباڵی

بە پیرچۆپانە[٢] دەوری دڵنەواییم     لە ئەوڕایە شنەی شێعری بەباییم

هەتا مردن مەحاڵە لەو، جیاییم     لە دووری ئەو دەزانم هەڵوەداییم

خوا گۆڕم لە ئەوجیٚ بێنە کۆڵین

کراسی قیامەتم بیٚ، پەلکە«سۆڵین»[٣]

نشێو و پاڵ و لاپاڵی بە دڵمن     لەبەر چاوم چەن و لاچاو کوڵمن

هەڕێن و دەستەچیلەی جۆشوکوڵمن     ئەوینە و تێکەڵاوی ئاو و گڵمن

دەمیٚ مردم لە ئەو کێوەم بنێژن

گوڵاوی لەشبە «بێژان»[٤]ی بڕێژن

هەتا پرمەی لەگوێبیٚ ئەسپی یاخی     هەتا هەتوانی دڵ بیٚ، بوغدەداخی

هەتا بالۆرە بێژم، بچنە شاخی     هەتا ئاودێری گوڵ، گوڵ بیٚ لە باخی

نە دڵ پیرە و نە پیرێکی دەبینم

دڵم تێرە و بە دڵ ڕازی لە ژینم

من و شاخ و فڕەی باڵی شەهێنان     شەووشوانوتەقەی زەنگی شەوێنان

بەهار و بن دەوار و گویٚ کولێنان     کەرە و شیرێژ و وێرەی مەشکەژێنان

دەسا چی دی دەویٚ شاعیر لە ژینیٚ

---

[١]. جەبەل حەمرین: کێوێکە لە ڕۆژاوای کەرکوک، سنووری کورد و عەرەبە.

[٢]. پیرچۆپان: کێوێکی بەرز و چڕە، لە ڕۆژاوای گوندی گوێزیٚ.

[٣]. سۆڵین: گیایەکی گەڵاپانی بۆنخۆشی کوێستانە.

[٤]. بێژان: گیایەکی بۆنخۆشە.

بــەتینتــر کــا، کــولّ و نالّــە و ئــەوینیّ

گــەشوبەرچــاووبەرزە نــاوی گــویّزیّ وەکــوو ڕووگــەی دلاّنــە، ڕاوی گــویّزیّ

گــەشو قۆچــاخ و ڕەنــدە لاوی گــویّزیّ شــیفای دەردی دلاّنــە، ئــاوی گــویّزیّ

هەچــی جوانیپەرســتە بێتــە گــویّزیّ

لــەوەی زووتــر پەرســتوویە، دەبێــزیّ

چ ڕێبــواریّ بــە گــویّزیّدا گــوزەر کــا بــە چــاوی دلّ کــە بڕوانــیّ هەتــەر کــا

لەمــەولاوە دەبــیّ تــەرکی ســەفەر کــا دلّــی دەدزن دەبــیّ هــەر ســەربەدەر کــا

وەکــوو ســێحرێکی نــویّ وایــە ولاّتــی

دلّێکــی تێکــەویّ، ســەختە نــەجاتی

لــە جێگــەم کــیّ لــەویّ لاوە، لــە ڕاویّ دلّــم لــەو جێگــە دزراوە، بــە چــاویّ

بــە هێواشــی بلّــێن هــەنگاویّ بــاویّ نــەکا گیــانی مــنی بــەر بــیّ نــەکاویّ

وەبــــالّی دلّ دزاو و تێــــشکاویّ

بــەفیڕۆ بێتــە سەرشــانی نــەکاویّ

مەلاڕیــشە[1]م لەبیرناچــیّ لــەویّ بــوو وەکــوو شــەمعێکی ڕوونــاکی شــەویّ بــوو

دلّــی وریــا بــوو دەریــا بــوو بــەپیّ بــوو وتــەی پڕپیــت و پــڕتین و بــەجیّ بــوو

لــە ئــەو ڕا نێــوی گــویّزیّ هاتــە نێــوان

نــەوی نــەکراوە تــا ئێــستا بــە دیّــوان

فەقێلــەی مێــزەری ڕەشــیان لەســەر بــوو ســەدان پیــت و وتــەی گەشــیان لەبــەربوو

هــەموو ورتــە و وشــەی دەمیــان هونــەر بــوو لــە هەندەریان هونــەر دەســتی پەکــەر[2] بــوو

مــــەلاییێك وا وەڕازێــــنیّ فــــەقێیان

دەبــیّ واژەی لــە زێــڕ گــیریّ لــە دێیــان

لــە گوێزێــدا لــە لاموچــەی تــەڕوزەل گــەلیّ بــاوە، کــەبابی کــاوڕ و قــەل

فــەقیّڕەشــکە و مــەلاوشــك و تــەوەزەل بــەبیّ بــالّی وەخــڕ بــن، ببنــە خەرتــەل

یــەکیّ بخــوا و یــەکیّ بــدزیّ دلّ و ســی

یــەکیّ بێــژیّ بەشــم دە هــەی گەڕووســی

بویّــژێکی پــواو[1] و خــاو و گێــژم لەمــەڕ خــەلّکی لــە گــویّزیدا چ بێــژم

---

[1] . مەبەست حاجی مەلا مستەفای مەحموودیە. کوڕی خوالێخۆشبوو مەحموود گۆلێیە.

[2] . پەکەر: فەلەج

هەچـــی بیلـــێم و بیجـــووم و ببێـــژم لەســـەر دەریـــاوە خـــشتی گـــڵ دەپێـــژم
مەگــەر بێــژم هونــەر چــی دێتــە بــەردەم
لــە گــوێزێ دا هــەوێنی دێتــە بەرهــەم

لــە گــوێزێ دا، لــە مــاڵی خــوام ڕوانــی وتم بــۆ هێنــدە بــەرزی خــۆ خــوا نــی
مەگــەر کابــەی دڵ و ڕووگــەی ڕوانــی چ مێعمــارێ بــە تــۆی بەخــشی جــوانی
بەحەشــتی بــێ، بــە خــۆی و دایــی و بــابی
نەفــەوتێ تــا ئەبــەد خێــر و ســەوا بــی
خـــوا گـــوێزێ بپـــارێزێ لـــە چـــاوان لـــە باوەشـــیان نـــەتۆرێ، نـــووری چـــاوان
پتـــەوتر بـــێ، خـــوا هـــەنگاوی لاوان بـــە پـــاکی بـــچنە گـــۆڕێ نـــە ك بـــە تـــاوان
موبـــارەك بـــێ دەقـــی مزگـــەوت و پیـــاوان
لـــە دایـــی و بـــاب و کیـــژ و پـــیر و لاوان
خـــوا وا مـــاڵی تۆیـــە لێـــی بـــەزیوین لـــە دەس شـــەیتان و نەوســـی دژ ڕەویـــوین
بـــەرەو قـــاپی بـــەزەی تـــۆ، لێنـــەویوین پەســـیوێکمان نـــەدەی تـــۆ بـــێپەســـیوین
پـــــەناهێنین و بەخـــــشینە ڕەجامـــــان
پـــەناییکمان نـــەدەیتێ، کـــوا پـــەنامان
بەســـە شـــاعیر دە مەیرێـــسە، چ دێـــژی لەســـەر خۆبـــە، هونـــەر چـــیدی نەڕێـــژی
هونـــەر فـــەوتا، گوڵۆڵـــەی کەوتـــە لێـــژی بـــە کەشـــکێکە هونـــەر، مـــیتری درێـــژی
کەشـــك زۆرە ، لـــە گـــوێزێدا هەڕاجـــە
بـــەبێ پـــووڵ و کـــڕین و خـــەرج و باجـــە
ئـــەوەی مـــاڵی هەیـــە و دایـــیم خورێنـــە ئـــــەوەی دێـــــز و دزێـــــو و دڵـــــشکێنە
ئـــەوەی خۆخـــۆر و خـــوار و خۆبەزێنـــە ﴿دەبـەر کوتکی حەمـەی سـەوزەی[2] مرێنـە﴾
هـــەموو دیـــاری دەس‌ومـــستم دۆعایـــە
دەمودەســـــتێ، قبـــوولی کـــەی خوایـــە

١٣٧٤/٨/٢٥ گوندی ترکاشە

---

[1] . پواو: پزیو، پسپس، هەڵوەریو

[2] . حەمەسەوزە: ڕدێن‌سپییەکی گوندی گوێزێیە.

## سەفەری خەیاڵی بەرەو گوندەکەی «ڕاوچی»

«ساردەکۆسان» (گەورکی موکری)

دەی خەیاڵ، باڵێ وەرازێنەوە دەی
هەڵفڕە، ڕوو بە فڕی مەڵبەندم
بمبە جێڕاوی چل و چەن ساڵەم
تاکو پێنووسێ وەدەستم دەم زوو
ڕاگەیێنم بە کوڕ و کیژی قۆز
ڕیزەهەڵبەستێ وەسەر ڕێ خەم با
با، بە دڵ دەردی دڵم درکێنێ
دڵی "ئاوارە" لە من ڕازی کا

سووکەسەر دانێ، بسازێنەوە دەی
جێگەپ و جێفەڕی لاوی ڕەندم
هەڵوەدە لاپەڕەیی هەر ناڵەم
چەقەساوێکی لە هەستم دەم زوو
مەرحەبای تێکەڵی فرمێسك و سۆز
لەرز و تاوێکی وەهای وێخەم، با
تەكوتوو دۆست و کەسم بدوێنێ
زێڕەوشانی دەمی شانازی کا

«ساردەکۆسان»

گیانە وریا بە لە ڕووگەی مالان
پۆلە چاوبازێ کەوا لەو نێوەن
پۆلە ڕێبوارێ لەوێ تێپەڕ بێ
یانە هەنگێوە وەهای دەنگێون
سیلە چاو، چاوی وەهای تێدەبڕن
لێمگەڕێ لالە! بە کورتی بێژم
کوڕی ئامێزی بەباوی ئەو بووم
هەر لەوێ، پێگر و پێگرتوو بووم
هەر لەوێ، دڵ دڵی پێناساندم

نەبیە ڕووگێری پەرەنگ و خالان
بێچەكوچۆڵە، هەموو هەنگێوەن
یا دەبێ کوێر و نەوێر و کەڕ بێ
شوورەپۆلا بێ، لە جێی دەبزێون
بە بەلاش شەرم و حەیای لێدەکڕن
دوورە ئەو جێگە، بەبێ جێ گێژم[1]
دوورە ئەو، تووشی خەیاڵوخەو بووم
هەر لەوێ ئۆگری ڕەنگ و ڕوو بووم
هەر لەوێ، کوڵ دڵی پێتاساندم

---

[1] (دوورە ئەو دێیە بە بێ دێ گێژم) ئاواش هاتووە.

هەر لەوێ، کیژێ بە نازی چاوان — جێبەجێ، گیان و لەشی هەڵتاوان[1]

هەر لەوێ، دەستوچەکی خۆم ناسی — هەر لەوێ بوومە دژی ناخاسی

هەر لەوێ، چینی بوێرم دیتن — هەر لەوێ میر و دلێرم دیتن

هەر لەوێم پێگەیی ورتەی کوردی — هەر لەوێ بوومە ڕەفیقی «وێردی»

هەر لەوێ، هاتە دەسم چلدانەم — هەر لەوێ هەڵبوو شەمی کوردانەم

هەر لەوێ، هاتە خەوم بابایێ — هەر لەوێ، کۆنە چەکم دەس دایێ

هەر لەوێ، دەستی بە دەسبەندم دی — هەر لەوێ بوو، سەرەتای پەندم دی

هەرلەوێ، چوومە چنەی هەڵبەستان — بوومە ئاودێری دەرووی بێ‌دەستان

شەرت و پەیمان و بەڵێنی ئەو دەم — هەر لە بیر ناچێ هەتا هەم، هەرهەم

یادی ئەو ناوە بەخێر و بێر بێ — جێگە هەڵوێستی کوڕانی شێر بێ

لێرە بەو لاوە تەرە و ئاوارە — بێنەوە باوەشی ئەو دووبارە

## بەردەهەڵۆ[2]

بەردەهەڵۆ قاق لە دوژمن یاخی — رووی خوات لێیە، کە هێن قۆچاخی

زۆر لە مێژینە مەکۆی داماوی — سەنگەری کۆنی کوڕانی لاوی

ئەمەکت زۆرە لەسەر شانی گەل — گەل بە تۆ زیندووە، ڕۆژانی هەل

وا بە دڵ دێمە سلاو و ڕێزت — ماچ دەکەم دوو مەچەکی پڕهێزت

مەرحەبا! شاخی بڵیند و رووگەش — پێشکەشی وەرگرە لێم، پێنج و شەش

شێعری فرمێسك و هەناسانی سڕ — وردە ئاواتی لە بریا، پڕپڕ

دڵ مەڕەنجێنە لەوەی هاتوچوو — ترسی ڕێ، نیشتووە وا ڕاوچی چوو

کوڕی تۆ دوورە ڕەوین و ترسن — لە خەمت تاکوو هەبن، بەرپرسن

---

[1] (جێبەجێ جەرگ و دڵی هەڵتاوان) ئاواش هاتووە.

[2] کێوێکی بەشی ڕۆژهەڵاتی ساردەکۆسانە بەرەو کێوی قەڵات دەڕوانێ. ئێستاش ئەو دوو کێوە دروشمی شێرە کوڕانی پێوەن.

کوڕی تۆ دوور و نزیك و لە سوێن
هاکە تازەی کەنەوە کۆنەشوێن

چەکی باڕووتی دەسوپێ ڕووتان
هاکە داگیرکەری تۆی پێ سووتان

ئەو دەمی لاشەزڕان دەژمێری
تۆ بە زڕ کوشتنێ، فێری، نێری

لاوی تۆ ڕۆژێ بە کەیفی خۆیان
دەچنە «بۆتان» و «جزیر» و «کۆیان»

دەرکە زیندانی «مەمان» دەشکێنن
«زین» و ئازادی، بە سازی دێنن

ئەو دەمی دێمەوە بۆ سەردانت
دەبمە میوانی بەهاری جوانت

وێ دەمێ تێکدەشکێ، شا، بەختی
خۆشدەبێ، گەرمەگەڕی خۆشبەختی

دەستی دۆ دێتەوە دەستی یاران
هەی نەما، هەی نەما، پاشای تاران

دەیکەمە بەستە مەبەستێکی خۆش
ئەو دەمی بێژە بە ڕاوچی: دەسخۆش

بەرەو گۆڕستانە پیرۆزەکەی سێ چاکی ساردەکۆسانی:

بۆ سلاوێکی لە خێلی چاکان
دڵە سەر ڕێکەوە بۆ سێ چاکان

چاکە هەر چاکە، بە چاکی بدوێ
خاوەنی چاکە، بەبێ خەم دەنوێ

ئای چ دڵتەنگە، لەشی نێو گۆڕان
گیانە بێگیانە لە ترسی دۆڕان

چاو بباریێنە لەسەر گڵکۆیان
وردە فرمێسکی هەنیسك و ڕۆیان

ئەو هەموو گۆڕە لە هۆزی کوردن
ژیان بە کوردی و بە کوردی مردن

لالە دەی بێژە بە بیری وردت
چی بەسەر هاتووە هۆزی کوردت

سەردەمێ، دەم بەبزە و بریا بوون
نەبەز و دەسبەچەك و وریا بوون

چەکمەزێڕ و بەفەڕ و ڕووگەش بوون
خاوەنی ماف و تەلار و بەش بوون

ئێستە ژێر خاك و وەژێر پێ کەوتوون
نابەدڵ، بێدڵ و دڵسڵ خەوتوون

تاجەسەر بێسەر و سەر بێتاجن
بۆ دۆعای زار و دەمێ، ئاتاجن

کاسەسەر، بێسەر و بێبەرگ و نوێن
بوونە سەرکاری، گڵ و خۆڵ و خوێن

خاڵی سایگەردن و سەرسنگی ڕووت
بوونە جێمالی ملەی تاقوجووت

ئەو هەموو گۆڕە کەسوکاری مەن
بەڵگە ڕووناکە، کە پێش باری مەن

گۆڕکەنیّ، هاکە لە مە بەولاوە     کۆگڵی گۆڕی مەشی هەڵداوە

یەکی تر دیّت و لەسەر گڵکۆمان     دانە فرمێسکیّ دەڕێژیّ بۆمان

گیان و لەش هاکە، لەمەش بڕبڕ بوو     پەڕی ئاوات و هیوا دڕدڕ بوو

بەشی لەش دیارە لەژێر گڵکۆدا     ریشەسووتاوە لە بۆگە و بۆدا

زۆری پێناچیّ لەشی هەر مردوو     خۆڵەمێشێکە بەرەو بابردوو

گیان بەرەو کامە سنووریّ دەفڕیّ     روون نییە کێهە بڕەی پیّدەبڕیّ

تا کەیە دەربەدەری بۆ گیانان     کامە دەم دێتەوە بۆ نێو ژیانان

ئای چ بیّچاو و سەرە بیری ڕوون     روون نییە بۆ مە، ئەوانی وا چوون

پاشی وەی بوونە گڵ و بەربابوون     روو بە کام تازە هەواریّ ڕابوون؟

گیان و لەش لێکدەبڕێن یەکجاری؟     گیانی بیّلەش دەخەویّ بیّیاری؟

یا نە جێژوانی هەیە بۆ گیانان؟     گیان و لەش دەبنەوە خانی خانان؟

گیان و لەش پێکەوە چەسپ و بەندن     بە تەڵەی بیّخەبەری پێوەندن

داخم ئەو ڕێگە ئەوەن باریکە     تەرت و هەڵدێرە، ڕچەی تاریکە

هەر لە پێشینەوە تا کو ئێستاش     زۆر بە پیتۆڵی، کوڕ و کۆڕی باش

روو بە ئەو ڕازە بەدڵ ڕاساون     شەڕەبا گێژی بە مێشکی داون

نیوەریّ چوون و لە ڕێدا وەستان     تێگەیین کاس‌و وڕ و ناوەستان

چی کە درکاوە بە یار و درکن     رووبەڕووی بیری، بە بیریّ سرکن

هەرچی وتراوە لە بۆ ئێمەی بۆر     مستە هیواییێکە زۆر کۆن و مۆر

دڵ بە هیوایە کە ڕۆژیّ دادیّ     لاگریّ دیّت و دەپرسیّ دادیّ

خۆڵەمێشی لەشی چوو، ئاو دەدریّ     لەش لە گڵ دێتە دەریّ، گاو دەکریّ

ریش و پەشمێکی تری ویّ دەخریّ     مەرگو خەم دەرکی لەسەر، دادەخریّ

بە شەقی تۆڵە زەوی شەق دەکریّ     بیّکریّ، ماقی شەل‌وشەق دەدریّ

بە فەڕوفیت و جەماڵی غەوسی     دێتە جانتایەوە، ماقی نەوسی

نەرموشل، کیژی شل و بیّپشتێن     وەکوو ئەستێرە لە دەوری هەڵدێن

کولّم و دەم، بەردەمە بۆ ڕامووسان مفت و مەرجانییە، پێدانووسان

باخ و باخاتە لەوێ، ژینی نوێ هەر دڵە و بۆ دڵ و بۆ گوڵ دەدوێ

تێهەڵێنجانە لە هەر داوایان پڕ بە دونیایە، بەشی ئازایان

ڕاوی هەنگوین و کەرە و شیری ساف تاس کەبابی کەوی سەر کێوی قاف

کووپەمەی بێغەش و مەیگێڕی ڕووت ئارەزوو بۆی دەخزێ ڕووتوقووت

پشتوبەر باوەش و جێخەو، حۆرین دێتەدی خەون و خەیاڵی گۆرین

هەی لەوەی پۆلێ وەبەر خۆ ببڕێ نەوسنی مان و بەهانەی ببڕێ

ئای چ شیرینە هیوا بەو لەونە کۆنەفرمێسکی خەیاڵ و خەونە

لالە ڕاڕا مەبە بۆ ڕێگایان نەکە لاڕێ بێ، بە بیروڕایان

هەر هیوا وەرگرە بۆ سەرمایە عەقڵ و سەرمایە دەرۆستی نایە

زۆری پێناچێ کە تۆش بێنازی تێدەگەی چۆنە مەرگ ڕێبازی

ئەو دەمەش کەس نییە تا پێی بێژی چەت و قرتیلی و یا بن گێژی

گیانە بەس وڕ بە، بە گێژی بیران تا هیوات پێیە بژی وەک ژیران

مەبە شینگێڕی شەباکی گۆڕان فاتیحایێکە بەشی ژین دۆڕان

بەسە، کۆتا کە، کوتەی ئەو تەونە هەرچی بیڕێسێ، فرێتی کەونە

**دەچمە سەرگۆڕی پیرۆزی باوکم، مامۆستا مەلا حەسەنی سەییادی**

**«شینگێڕی»**

دڵە دووبارە لە خەم دڵپڕ بە    چاو بە فرمێسکەوە، گێژ و وڕ بە

ڕەنجەڕۆ، ڕێکەوە بۆ ڕۆڕۆیان    بە خەمان خولبە، لەسەر گڵکۆیان

با لەسەر گۆڕی گەشی پسپۆڕێ    ببیە فرمێسکی شەمی سەر گۆڕێ

با لە سای وارشی گۆڕی بابم    شەمی بێپیوی، کوژاوی بابم

دەمەوێ تاوێ لەگەڵیا بدوێم    ببمە ئاونگ و بە تاوێ وەتوێم

دڵە دەی فرسەتە، بۆ سازوسۆز    چاو ببارێنە لە گڵکۆی پیرۆز

ئەشك و گڵ پێکەوە با تێکەڵ بن    ژیلەمۆی کۆنەبرینان هەڵبن

ئێرە گۆڕێکە، لە گۆڕی چاکان    پاك و خاوێنە، لە ڕێزی پاکان

لێرە بن گڵ بووە، «سەییادی» پیر    لێرە بێدڵ بووە، دڵداری ژیر

پیری مەڵبەند و گەلێ وریا بوو    چی بڵێم، ڕوحم و بەزەی دەریا بوو

سفرەپان و بەدڵ و ڕووگوڵ بوو    خاوەنی جۆش و خرۆش و کوڵ بوو

بنەمای عیشق و ئەوین و کوڵ بوو    دژ بە ئاکار و کری باتڵ بوو

با لەسەر گۆڕی «خەلیفەی سانی»    (سانی ئیسنەینی) خەتی سوبحانی

بارەگای پیری«قەلەندەر» شێوە    رووگە، بۆ نازونزای ئەو نێوە

هەڵوەرم، بووکی دڵم ڕاژێنم    تەڕ بکا ئەشکی ڕەجا داوێنم

با بدرکێنێ قەڵەم بۆ باوەم    دوورە ئەو تووشی بەشی ئاژاوەم

دوورە تۆ، ڕاوچی نەماون هێڕن    چەقەڵە ڕێبەر و ڕێوی شێرن

چۆڵوهۆڵ ماوە هەچی ناوەندە    ڕەنگ و ڕوو کاڵە، بەموو کەڵ بەندە

ڕەندەکوڕ بێگۆڕ و سازوبەرگن    دەس بە دەسبەندەوە، بەندی مەرگن

دەستەیێ دیل و گەلێ ئاوارەن    هێندێ سووتاوی گڕی خۆمپارەن

زۆربەیان کوتکوت و لێکتر نامۆن    یەکێ «چەرچیل» و ئەویتر «ساسۆن»

هێندێ دالاش و بەدیمەن باشن    هێندێ بارکێش و لە دووکەر جاشن

هێندێ زۆرخۆر و کوڕی گۆشتاون
هەرچی بۆی بخورێ، دەخۆن بێچاون

ڕاست و چەپ پێکەوە وا تێکەڵ بوون
لێکدەدەن، لێکدەکوژن، فیشەڵ بوون

کورد و ناموس و شەرەف، بێوازن
بێدەوا و دوکتور و خێو و نازن

کۆمەڵێ زەرد و ئەویدی سەوزن
تاقمێ شۆڕ و شل و کەر گەوزن

ڕەنگ پەرس، ڕەنگی هەموو دامالێن
ڕۆڵەکوژ، زۆڵە کوڕی خۆمالێن

وتەبێژی بەبڕی مانۆڕان
خۆ دەدۆڕێنێ وەکوو خۆدۆڕان

هەرچی بیوێژێ کەناو و گەندن
کوڕی تریاك و کەبابی ڕەندن

چی بڵێ دێڵییە، پووچی مانان
چی بەدەم بگرێ نچیری ئاغان

بێگرێوگۆڵە، کەمابن قرتن
قەڕنە، تەڕنێکە، بەگەز ڕم کورتن

«باوە لامداوە»

باوە لامداوە، دەبێ بمبووری
زۆر کەموکورتە، دنەی ڕووسووری

بۆ پەنا دێمە سەلاوی گۆڕان
گیانە ترساوە، لە ترسی دۆڕان

دەورە تەنراوە بە داوی خاوگ
تاتە نوێژ، بوونە، بەشی جێڕاوگ

بێدڵ و دڵ بەخەمە دڵدارم
چوونە سەر تاقی سەرێ، نایارم

بزە تۆراوە لە زار و لێوان
کوندەبوو، بوونە قەشەی بێشێوان

دوور لە تۆ، باوە بە خەم پۆنگاوم
نیوە ماوێکی، خەیاڵی خاوم

مەرجە بەستوومە کە لێی لانادەم
بۆ ژیان، جەوهەری گەوهەر نادەم

سوێندە خواردوومە لەسەر دەستی تۆ
خە ت نەدەم خاڵوخەت و نەخشی تۆ

پێمسپێراوە، لە لایەن تۆڕا
ماڵ پەرس، هاکە لە خۆڕا دۆڕا

ڕاسپێر چی بوو لە بیرم ماون
بۆ منی پێ کز و بێپێ باون

باوە بێخەم بە، بەخەم ناگۆڕێم
هەر کوڕی تۆم و بە کەس نادۆڕێم

نوور بباری لە وتەی زێڕینت
تا کوو هەم حەستەمە، ڕێ گۆڕینت

شەوێك، کاك سەعید نەججاری «ئاسۆ» لە گوندی ترکاشە سەریهەڵدا و بڕیاری دا، بۆ هێندێ وتووێژ و دەمەتەقێ، بەیانی ئەو شەوە وەمێنێ، بەیانی وادیاربوو ڕۆیشت و بڕیاری شەوی هەڵبڕی، منیش ئەو هەڵبەستەم، بۆ هەڵبەست و خۆم بە خەمەکەوە بەستەوە.
وەڵامی نووسراوەی پڕ لە هەناسەی ئاسۆی شاعیر:

**فردا بیا**

وا خەمم دیسا لە ئاسۆ کەوتە سەر
دوێ لە مەیخانە گوڵێکی مەیفرۆش
چۆن نەپۆشێ کوێنی ڕەش شێعری تەڕم
بۆ سەری سەودا وتی: فردا بیا
بێسەر و سەودا، هەتا سەر چۆن بژی
بۆ لە مەیخانەی خەمی تۆدا، گوڵم!
بێرەوە تا بۆت وەگێرم ژوانی شەو
بێرەوە ناو باوەشی وێژەی تەڕم
بیکە شاباشی بزەی لێوو دەمێ
پیرە «ڕاوچی» دڵتەڕ و وێژەم تەڕن

دوورە «ئاسۆ» کەوتەوە شێعر و هونەر
مەی نەدامێ، ئەو بە قەڵسی ڕۆیە دەر
گیانی خۆی دایە بە ماچێ، سەربەسەر
گەر بەیانی دا، نە سەوداما، نەسەر
پیرەپیاوی بێبڕژیوی، دەربەدەر
خەم بپێوێ شاعیرێکی، شێوە دەر
بەزمی پرچ و پەرچەم و داوێن و بەر
وێژەری فێر بە، لە پیری بەختەوەر
مەکتەبی دەرس و وتەی ڕۆم و تەتەر
بێ لە من فێر بە برا زەین و هەتەر

٧٥/١٠/٧ ترکاشە

پاش بەجێهێشتنی شاری بۆکان، ئەو چەن شێعرەم، بۆ شاعیری بەهێز کاك سەعیدی نەجاڕی (ئاسۆ) نارد:

**دوورە ئاسۆ**

دوورە ئاسۆ کەوتەوە باروبنەم
گوڵشەنی شارم بەجێهێشت و لە دێم
سەرپەڕی تەبعی تەڕی ئەو شارە بووم
بێدەسی نەرمی کچی کوڵانی شار
قرقرەی بەختی ڕەشم، هاڵۆزە لێم
وەك هەڵۆ شاخم بەجێهێشت بۆ نشێو
یادی تەبعی تۆیە،«ئاسۆ» ڕۆژۆشەو
دوێکە «ڕاوچی» پۆڕی شار و کووچە بووم

ئەو لە شار و من لە دێدا، بێشنەم
دێمەکارە چڕگەنی هەست و دنەم
ئێستە بۆ سۆق کەر و کوڵکن بنەم
لێرە کوشتەی مەشکەژێنی خرپنەم
سیس و هاڵۆزی قرەی دێو و جنەم
لاپەڕ و بێشەوپەڕ و ڕەوت و قنەم
وردە باوی ئەو هەموو لێرستنەم
لێرە ناوچیری تەقەی کەوڵ و پنەم

١٣٧٣/٨/٣ ترکاشە

## دووباره بۆ کاك ئاسۆ

لــە ئاســۆ تێگەیــشتم بەربــەیانم بــێبــزە و تــاوە
پەپوولــەی تــەبعی تــەڕ تــەنیا لــە ئــاواتی بــەجێماوە
لەژێر چارشێوی ڕەش بەندە هــەوێنی شێعر و هەڵبەستم
مەبەستم لــێ ونــە، هەستم نەخۆشە، خــۆی لــە جێنــاوە
دڵــم تــووڕەی ڕەشــی چارشێوە، وا شــارم بەجێهێشتن
بــەرەو دێــم و لــە دێــدا، ڕووتەڵۆکــە شــێعری ڕازاوە
لــە شــارا بــەر چــرا، جێگــە شــەوارە و ڕاوە چــاوم بــوو
لــە دێــدا شــوێنی تاریــك و تــەریکم، جێگــە بــۆ ڕاوە
لەشــی نــەرمی کــچی شــاری، ئەسیر و دیلــی چارشێون
کــچی بەیدەســتی دێهــاتی، دەســی چارشــێوی، بــاداوە
دەزانم کــوڕی تــۆ ئاســۆ، لــە شــارا بــۆ ئــەدەب دەدوێ
لــە دێــدا بــێئــەدەب کــوڕێ، لەگــەڵ ئــاواتی ســازاوە
ئــەتۆ کــوڕی عــەرووز و قافیــەی قــاقڕ، قــڕی کــردی
لــە دێــدا قافیــەی شــەرمم، بــەبێ شــەرمی بــە قــڕ داوە
وەرە جێــژوانی هەڵبەســتم، هــەتا شــەختەی شــەوم دوورە
بلــێ خۆزگــەم بــە «ڕاوچــی»، کــا بــە پیری هێشتە هــەر لاوە

٧٣//٧/١٤

## شێتۆکە

مــن کــە «ڕاوچــی» کێــو و مێــو و بــەربنم
خەم بە لاما بێ، بە خەنجەر دەیچنم
تــا کڵاشــی تــیر و چــەرمی خــۆم هــەبێ
شــەق لــە شــادی شــا دەدا شــادی ونم
قەسری شــا دێــنێ بــە تــاج و تەختــەوە
سێبەری شــاخ و شــنەی داری شــنم
خــەڵکی دێــم و دێبــەدێ دێــم و دەڵــێم
شــاعیری کەشــك و پــەنیر و بــەرگنم
پــیرەداری خۆشــبەر و بــەرگ و گــوڵم
سێبەری سەد مەشکەژێن و گوڵچنم

خەم دەڵێ چی، چۆن بە لاما دێ دەمێ — گوێ دە سرتەی گەورەکیژی شەرمنم

تاکوو وێرەی مەشکەژێنێ دێ هەبێ — چۆن دەبێ بێژی کە پیر و چڵکنم

باوە جێژنانە، کچانی سینەڕووت — هەر بە سینەی ڕووتەوە بێنە کنم

ودمی شێلانی هەیە، جیرانی دێم — بۆیە هەر لاو و لە خەم شورت و ونم

دویکە شێلامی کچێکی شێوەشل — هەڵوەری دەرد و کوڵی پێ مردنم

دەتهەوێ ئاسۆ، گەشی ئاسۆگە بی — وەرگرە شێعر و وتەی لەیلی چنم

ژێری بەس کە، بێرە دێ شێتۆکە بە — بێژە: شێتۆکەی کەژ و بەژنی ژنم

سۆکەسۆکی چیتە «ئاسۆ»، تا بە کەی — بۆم دەنووسی، بێبەشی درز و کونم؟

شاعیری بێدرز و کون جەرگی کونە — چۆن بەبێ جەرگی دەبێژێ هەر منم؟

## وەڵامی ئاسۆ بۆ «ڕاوچی»

شێعرەکەی «ڕاوچی» بووە هەست و دنەم — بوو بە ئاوی شێعری وشك و بێشنەم

من جەلان پەروانە بووم بۆ شەمعی ڕووت — ئێستە بێباڵ و پەرم، کوا ئەو منەم؟

ڕێنومابوو «ڕاوچی»، وەك هێمن و هەژار — ئێستە دوورە مەحزەری ئەو هێمنەم

دوورە تۆ، کاکە! خەیاڵم قاقڕە — نادەڵێنێ ئاوی شێعری ڕوون، زنەم

خۆت دەزانی چۆن دەسووتێم بۆ ئەوین — گەرچی ئاسۆی شێعری دەس ئەو سووتنەم

تۆ کە مەجبووری بەرەو ڕوونی بڕۆی — چاو لە من ناکەی کە چەن بێڕۆچنەم؟

ئاردی ئاشی ترکی قەت نابێ بە نان — گەرچی بشلێی خاوەنی کەوڵ و پنەم

١٣٧٢/٤/٢٥ ئاسۆ

## «شاری گوڵ»[1]

گوڵەکەم شاری دڵم، بۆ تۆ لە گوڵداوە، مەڕۆ
خونچە گوڵ، گوڵچنەکەی، شێعری بەرەو باوە، مەڕۆ
شاری دڵ، بێ‌گوڵە بێ‌تۆ، کە بڕۆی، وێرانە
چۆمی فرمێسکی خەمت، پێڵی بە شالاوە، مەڕۆ
سەد بەلا دێتە سەرت، کاتێ بەجێبێڵی دڵم
بەژن و بالا، بە بەلا، تاکو نەهالاوە، مەڕۆ
گوڵم ئەو شارە ئەوەن هێمنە، هەر شێعری دەوێ
میر و داروغە سەری، سواری پەت و داوە، مەڕۆ
تۆ هەڵۆی بەرزەفڕ و، فڕگەیە لاپاڵی دڵم
تا شەقەی باڵی فڕ و، هێزی فڕین، ماوە مەڕۆ
جوانی تۆ شێعری منی کردە، کلەی چاوی بەکل
تا کل و تەبعی تەڕ و چاوی بەکل، ماوە مەڕۆ
بەژن و بالا بە بەلای تەبعی تەڕم ژاکاون
جووتە لیمۆت بە دەمی شێعروە، مژراوە مەڕۆ
دوێکە بولبول بە چپەی ماچی من و تۆی زانی
تازە چی ماوە نەگوتراوە، هەموو قاوە مەڕۆ
بۆچی دڵمەندی لەوە ئاسۆ دەڵێ هەستە بڕۆ
شاعیرە و مەست و وڕە، شێتی بەرەو چاوە مەڕۆ
ئەوە «راوچی» لە شەوارەی شەوی جێژوانی تۆ
شەوە گەزتوویەتی، ژاکاو و بڕووسکاوە مەڕۆ

١٣٧٢/٥/٥

---

[1] مامۆستا ئاسۆ شیعری «شاری دڵ»ی بۆ دەنێرێ کە بە «بڕۆ» کۆتایی دێت. مامۆستا «ڕاوچی»ش بە شیعری «شاری گوڵ» وەلامی دەداتەوە کە بە «مەڕۆ» تەواو دەبێت.

## پێنجخشتەکی «راوچی» لەسەر غەزەلی «شاری دڵ»ی ئاسۆ

نازەنین! وەرزی دڵم بێکەش و بێئاوە بڕۆ      شاهەڵۆی بەرزی چیا، پێ کز و بێڕاوە بڕۆ
بادەوەی بەختی ڕەشم، بەختی بە باداوە بڕۆ      (گوڵەکەم! شاری دڵم پاییزە، لێیداوە، بڕۆ
تۆ گەشی هەڵدەوەرێی، لامەدە ئەو ناوە، بڕۆ)

پاییزە بەستەڵەکە، وردەچرۆ هەڵدەوەرێ      بێدرۆ، چاو و برۆ، لێرە هەمووی چوونە دەرێ
ئێستە لەو ناوە نە گوڵ ماوە و نە دڵ دێتەدەرێ      (چۆڵگەیە و کاکیبەکاکی نییە تێیدا نەفەرێ
خاکی ئەم شارە، بە داوی خەمە تەنراوە بڕۆ)

وەرە نۆرەی سەفەری تۆیە گوڵم گیان ودڵم      هەستە تاوێ وەرە سەیرانی، شەوی شین و کوڵم
هەر دوو پێ دانێ لەسەر بیلبیلەکەی چاوی دڵم      (نامەوێ پێت لە قەفی داوە خەمی گیر بێ گوڵم
زولفی تۆ بۆ دڵی سەد ها وەکوو من داوە، بڕۆ)

شنەبا! نۆبەتە، ڕازێنە پەلوپۆپ و چڵێ      وەرە جۆڵانێ وەرازێنە لەسای پەلکە گوڵێ
تۆ کە تەڕدەستی، بەلەز ڕابە، بەرەو بنکە دڵێ      (بولبولی بێکەس و دەم پڕ لە هەرا، جوابکە، بلێ
تۆ دەبێ هەر قەفەسی بی، بەشە، وابڕاوە بڕۆ)

تاوی شادی لە چیا بێبەش و بێباوە هەلات      تەمە گرتوویە هەموو قاقڕ و بژوێنی ولات
بێتە ئەستۆمەوە، ئازاری هەموو دەرد و بەلات      (گوڵەکەم! شاری دڵم، بۆمبی جەفای بوو بە خەلات
تا لەشت بەم گڕە مەشقاڵە، نەسووتاوە بڕۆ)

عەرعەڕ و داری تووبایە، قەدی تۆ، دێمە بنی      دێمە ناو باخی مەم وسینەوە، بۆ میوە ڕنی
بۆیە بێسوودە گوڵم، بۆ من و تۆ شورت و ونی      (هەموو کەس لێرە دەزانێ، کە دنەی شێعری منی
لە هەموو بەزمێ، ئەوینی من و تۆ قاوە، بڕۆ)

تازە وا پێدەکەنێ خونچە گوڵی ڕیزە چرۆت      کێ لە تۆ جوانتر و بەرچاوە گوڵم، بێجگە لە خۆت
لە شەوی بەختی ڕەشم، ڕەشترە، برژانگ و برۆت      (تۆ هەڵۆی بەرزەفڕی، شاری دڵم، نزمە لە بۆت
بێبەلا بی گوڵەکەم، کوا ئەوە جێڕاوە، بڕۆ)

گوڵەکەم! بێئەدەبی چاوڕوان مەگرە لە دڵ      ڕووبەڕووی ڕوومەتی تۆ، بێڕووە، کوڵمەی سوورگوڵ
گیانی راوچی بە فیدای ڕاوی دەم و دوو مەمی سڵ      (گەر دەترسی لەوە ئاسۆ خەمی تۆی دەرچێ لە دڵ
تا ئەبەد تۆقی وەفای تۆی لە دڵا ماوە، بڕۆ)

١٣٧١/١٠/٨ ترکاشه

### تێمیسکە

گوڵم! تەیری تەلانی بێبژیوی؟
لە دەس داڵی خەیاڵی دژ، ڕەویوی؟

لە پارێزی گزەی شێعرم، دەترسی؟
کەوا تێمیسکە سەر لێوی گەزیوی؟

کچی کوردی هەرێمی، یا فریشتەی
لە نێو عەرشی خودایێدا، فڕیوی؟

تکەی ئیلهامی ئاونگی ئەوینی
لەسەر پەلکی گوڵی شێعرم وەریوی؟

بە ڕەش گیراوە ڕۆژی ڕوونی بەختم[1]
کەوا چارشێوی ڕەش دەوری تەنیوی[2]

بە هەڵوێستی شل و شەرمن دیاری
پەپوولەی باخە کوردێکی هەتیوی

لە مێژە دڵ بە دووتا دێ دەزانم
لەنێو هەستێکی ناسک دابەزیوی

هەلە و دەستم لە ئەستۆ کە، هەتا کەی
لەنێو تەبعی تەڕی «ڕاوچی» خزیوی؟

١٣٧٢/٢/٢٢

### وەڵامی نووسراوەی لاوێک[3]

بە پیری بوومە نێو چیری خەیاڵان
خەیاڵی ڕاوەچاوی، چاو کەژاڵان

فڕەی باڵی بریوم، بازی پیری
پەروپۆم چوونە لاپاڵ و کڕاڵان

وەکوو سازێکی ناساز و شکاوم
لەگوێ تەندووری کوێری کوێرەماڵان

دڵ و گیانم لەسەر سوێگەی تەماشان
لە بۆ دیداری کاک و مام و خاڵان

وەرە بمبینە، بۆم بگری بە چاوان
تەمەن لاوی هەموو بردم بە تاڵان

تفی لێبێ فەساڵی ژینی دونیا
کە «ڕاوچی» بردە ڕیزی بێفەساڵان

١٣٧٤/١٢/١٣ . ترکاشە

---

[1] – بە ڕەش گیراوە ڕۆژی ڕوونی کوردان

[2] – ئەم شێعرە بەم جۆرەش هاتووە:

کە چارشێوی جەفا دەوری تەنیوی

[3] ئەو لاوە عوسمانی محەمەدزادەیە، خزمی خۆمن. قەدیم گرشیلانین. سێ برا و خوشکێکن. دەڵێن هەموویان بۆ دەبیری (مامۆستایەتی) دەخوێنن.

کیژێکی ئەدیبی دەبیرستانی بە ناوی زارا نادری «گوڵزار»، شاعیری لاوی هەستناسک، داوای شێعرێکی سێحراوی لێ کردبووم، منیش ئەو هەڵبەستەم بۆ پاکەت کرد و بۆم نارد:

**بەرۆکی داخراو**

گوڵم شێعرێکی لێویستم، نەبیسراو و نەگوترا بێ

وەکوو لێو و دەمی کیژێ، نەمژراو و نەگەزرا بێ[1]

وەکوو سرتەی خەیاڵی، کیژە کوردێکی خەیاڵی بێ[2]

مەمی چیرۆکی بۆتانی، لەسەر دوو مەم نەکوژرابێ

بڵێسە و ئاگر و گڕ بێ، کە وشک و تەڕ بسووتێنێ

بە نووکی چەرخی دڵداری، سەروبەر، تازە چنرابێ

لە پێچاڵی تەنینمدا، گوڵم نیمە وشێکی وا

بە ئاورگی ئەوینی کۆنەوە، جارێ نەبرژابێ

لە جێژوانی خەیاڵاتا، وەها دزراوە شێعری من

هەمیشە هەر دەبێ لار و لەڕ و لاواز و چرژابێ

بەرۆکی داخراوی گوڵ، دە می شێعری تەڕی بەستووم

دەمێ شێعری تەڕم بۆ دێ، بەرۆکی گوڵ نەبەسرابێ

لە هەندەر تا گزەی هەستم، نەهەندرابێ، گلەی ناوێ

سروشتی شاعیری وایە، دەبێ هەستی نەهەندرابێ

هەچەن ڕاوچی بەشی شێعری تەڕم، ئەمما بە گیانی تۆ

نییە وەك من کەسێکی تر، کوڵوڵ و کۆڵە کوترا بێ

١٣٧٥/١/٨ . ترکاشە

---

[1] ئاواش هاتووە: «وەکوو لێوی کچی شەرمن ......»

[2] ئاواش هاتووە: وەکوو سرتەی خەیاڵی کیژە کوردێکی حەماسی بێ

ئەم شێعرە لە ڕێکەوتی ١٣٥٥/٨/٧ لە ڕێوڕەسمی ئیجازەوەرگرتنی فەقێیەکی هەورامیدا لە مزگەوتی گوندی (شوێ) سەربە شاری بانە، خوێندراوەتەوە.[1]

**ئامۆژگاری**

خوێنەوارێکم دەوێ پارێزەری ئەو دینە بێ
هەڵگری باری خەمی ئەو خەڵکە بێپەرژینە بێ
نوێنەری پێغەمبەر و سایەی سەری ئەو دینە بێ
نەك ئەویندار دراو و درهەم و پەڵپینە بێ

❀❀❀

ئایەتی( هل یستوی) تاجی سەری ئەو یارەیە
دەستی هەتوان و دەمی ودم و وتەی بۆ چارەیە
خاوەنی سێحری بەیان و بەربەیانی چارەیە
چەقڵی چاوی دوژمن و مستی دەمی پەتیارەیە

❀❀❀

ئەی برای تازەمەلای، خەڵکی کز و نەخوێندەوار
بولبولی کوێستانی کوردی، بێبەش و بێکاروبار
گەر کەمێ نەخشت هەبێ، بۆ پێکز و چینی هەژار
تۆ دەناسێنێ بە کۆمەڵ پاشی مردن، پاشەوار

❀❀❀

شامرۆبە، بۆم تماشای شارەگی ئەم دینە کە
هەروەکوو خاسانی دینی، سەد شرەم بۆ پینە کە
تف لە چاوی چاوەچاوی نەوسنی ئەو ژینە کە
تا دەمێنی خزمەتی ڕۆژی ڕەشی ئەو چینە کە

❀❀❀

---

[1] مامۆستا راوچی لە بەشی گەورکی موکری و ناوچەی بانە و هەورامانی باشووردا خوێندوویەتی و لە خزمەت «مەلا مستەفا»ی گوندی شۆی بانەدا ئیزنی مەلایەتی وەرگرتووە. خوێندنی سەرەتایی و قوتابخانەیی هێناوەتە کۆتایی. لە ئەزموونی دیانسازیدا بەشداری کردووە و مەدرەکی تیکنیسیەنی ریازی وەرگرتووە. ئێستاش دوو کوڕ و زاوایەکی ماوەی ٢٠ ساڵە بەم ئیشەوە خەریکن.

یــا مەبەســتە مێــزەری پــۆز و عــەبا، بــۆ نوێنــەری
یـــا نەخۆشـــی خۆفرۆشـــی، بێبەریکـــە، بێبـــەری
زیــت و وریــا بــە کــە شووشــەی حیکمــەتی ســەر داوەری
نەیـــشکێنێ تاشـــەبەردی، چاوەچـــاوی نۆکـــەری

❀❀❀

تێبگـــەی باشـــە بـــە نـــانی خـــەڵکی لاواز و نـــەدار
بـــووی بـــە لاوێکـــی بـــزان و چوســـت و چـــالاك و تـــەیار
گـــوێ لـــە مـــن بگـــرە، وەقـــۆزە قـــاڕی مەیـــدانی وتـــار
لات نـــەدا لادەر، لـــە بـــاری خزمـــەتی خـــەڵکی هـــەژار

❀❀❀

دەتهـــەوێ چـــاوی لـــە تـــۆ بـــێ، ڕانـــەری چـــاو و ســـەرت
پاشـــی مـــردن پـــڕ بـــە دڵ بـــێ، دێبـــەری بـــەرگ و بـــەرت
چـــا بڵـــێ، بـــۆ گـــەل بڵـــێ، بـــۆ گـــەل لـــە ئاراخـــە، ســـەرت
وا نـــەژی، پیـــسە ژیـــانی، بـــێ‌ســـەری هـــەر دوو ســـەرت

❀❀❀

لـــێم لـــە دڵ مـــەگرە گـــوڵم، ورتـــەی حـــەق و لێکدانـــەوەم
بـــازی ڕاوم، فێـــرە گـــیر و ڕاپـــەڕ و هەســـتانەوەم
پـــیرە «ڕاوچـــی»م و چـــیایە ســـێبەری بووژانـــەوەم
ڕووت و قـــووتی باینـــەداوم، دوژمـــنی بادانـــەوەم

ڕەبەت. ٥٥/٨/٧

له سالّی ١٣٣٩ هەتاوی له زیندانی قەسری قاجار له تاران، دۆستێك بۆ ملاقاتم، تەشریفی هێنا بۆ زیندان، بۆ کزی و لەڕ و لاوازیم، فرمێسکێکی بێتنۆکی نیشاندا، به جێگەی هیوا تێڕشتن و دلّدانەوەم، گەلێ ساردوسووکیشی له پارسەنگ نام، و زۆر بێئاقلّی و نەزانی وەپالّ نام، خۆشی به زانین و لێزانییەوە، گەلێ ڕانا، منیش ئەو چەن هۆنراوەم بۆ ناردنه دەرێ، له گیرفانی چەپم چەپۆکێکم بۆ هاویشت.

### هێشتا هەر هەم

مــەده تانــه لــه وێنــەی ڕووتــەڵۆك و بــێگــوڕ و بــاوم

لــه زینــدانی خەماویــدا، لــه مێــژه بــێبەشــی تــاوم[١]

بــژیوم ئەشــك[٢] و پێخــۆرم هەنیــسکه و هــاودەمم شــینه

له گێــرەی بــێکراســی دا، ســەرەی خــەونی گــەز و جــاوم

هــەقم پێنــادرێ جــارێ، لــه دەردی دڵ ســکاڵا کــەم[٣]

هــەتا دوکتــور بزانــێ، هــۆی چــییه لــەرزی لــه ناکــاوم[٤]

بــه تــاوانی کلێتــه و کورتــەك، و شــێعری پــەتی کــوردی

دوچــاری پــەتپــەتی داروپــەتی ئەســتوور و نەپــساوم

چ تاوانــه کــەمن کــوردم، بــه کــوردی «کورتــه باسێکی»

بنووســـم بــۆ گــوڵی ســوور و وڵاتــی قــەت نــەدێراوم

مــەزەم مـــست و جنێــو و تانەیــه، بێــژم ئەوینــدارم

وەلــی دێوانــەم و بــووکی وەتــەن، دەســتی لــه دڵ داوم[٥]

---

[١] یان: له زیندانی تەڕ و بڕدا

[٢] یان: بژیوم کەشك

[٣] هەقم پێ نادرێ جارێ، له لای لوقمان و لێزانی.

[٤] یان: بلێم زانا چییه دەردی دەروونی پڕ له زووخاوم

[٥] له نوسخەیەکدا ئاوا هاتووه: خەلاتم مست و پێلاقه و جنێوه هەر دەمێ بێژم    کەوا دێوانەم و بووکی وەتەن دەستی له دڵ داوم

ئەگـەر بێـژم بـرا کـوردم، کڵاشـم تیرەکـەی چـەرمە

چ پێناچـێ، چـەرم دەکـرێ، لەشـی لاواز و بـێبـاوم[1]

بـەرەو سـێدارە تـا ترسـم وەبـەرنێ دوژمـنی هـۆزم

دڵـم ڕووناکـە[2]، پـێم وایـە کـە هێشتا هـەر هـەم و مـاوم

١٣٣٩/٧/٦ بەندیخانەی قەسری قاجار(تاران)

## کورتە یادێك لەناڵەی جودایی، شاعیری ناودار، مام هێمن

سـاقی کوشـتووتم، دەڵێـی شـێعری تـەڕی مـام هـێمنی

هەسـتە بـۆم تێکـە، بـە یـادی سـەردەمی مـام هـێمنی

مەی وەمن دە،مەی وە من دە، نەچیە سەر، هێمن دەڵێ

تـاکوو ملهـوڕ تێبگـا تـۆ هـی ئـەوی یـا هـیمنی

کیـژە دێهاتیـت و بـەرماڵت، بەرەڵبێنـە، گـوڵم

ئـەی لەبـەر چـی هێنـدە بەیدەسـت و سـڵ و نـاهێمنی

زۆر لـە مێـژە مـن سـەرم سەوداسـەری ژوانێکتـە

تـۆ هـەتا کـەنگێ بـزۆز و دڵـڕەق و سـەوداونی

نـا گەرەکمـە هـێمنی پـاش مـردنم، گـەر دەس کـەوێ

شـەو لـە مێـزی گـەرمی تـۆدا، بـۆ مـنی سـڵ هـێمنی

دڵ کـە شـێواوە لـە شـێوەی پەرچـەمی شـێواوی تـۆ

شـێوە شـیرین وا وەرە، تێپـەڕ بـووە، شـەرمێونی

ڕاپـەڕینی ڕیـشی بـۆزە و شۆڕشـی شـێعری تـەڕە

شێخی ڕیشن، شەو بە ڕیش و پەشم و تۆبەی پێکەنی

---

[1] یان: چ پێ ناچێ وەکوو دێوی لەسەر کێوی دەکەن ڕاوم

[2] یان: پێ خۆشە

دانـەری شـێعری تـەڕ و فـەرهادی کێـوی عیـشقی تـۆم

بیخـە بەردەسـتم قـولێنگ و پـاچ و بێڵـی کۆکـەنی

تـا بکـوڵێ شـێعری مـن، بێـستوونی کوێـستانی وەفـات

شـوێنی دیـاری بـێ، بـە یـادی کیـژە کـوردی ئەرمـەنی

ناڵـەناڵی«راوچـییە» یـا شـینی بلـوێری خەمـە

بـۆ پـەریی ناڵـەی جـودایی، دولبـەری مـام هـێمنی

١٣٧٧/٩/٢١ . دەروێشان

## گۆچانی پیرۆز[1]

ماموەستای لە زانین وەستا و لە عیرفان عارف و لە خوڵق و خۆشیدا، سەرۆك و لە ڕاستیدا، ڕاستاوێژ، و لە جوانیدا، بێوێنە و لە بالادا، شووش و بەرز و بێگرێوگۆڵ و گەلا، مودەریسی لـە مێژینـەی گونـدی گـۆڵێ، سەردەشـت، لـە زسـتانی ١٣٦٧ی هەتاویـدا بـە ڕەحمـەتی خـوا گەیـشت. ڕەفێقی زۆر لـە مێژینـەی گۆچانێکی سازکراوی کوردانـە بـوو بـە دەستەوەی بـوو، دەساودەس زیارەتیـان دەکـرد، ئێـستاش ئـەو گۆچانـە، بـە یـادی مامۆسـتا مـەلا حەسـەنی سـەعدی زادە هـەر مـاوە، وەك یادگارێکی هـەرە مـاقوولْ هـەڵگیراوە، لەگـەڵ ناسیاوان دەدوێ. فەرموو گوێگرە، بزانە دەڵێ چی:

«گۆچان»

نـە گۆچـانێکی کـرچوکـاڵ و سـادەم چـەکی جادووبـەزێنی سـەعدیزادەم

بـە کـەم مـەگرە کـەموکـورتی قـەوارەم لـە هـەر قـۆرت و قـولاتێ، ڕێگەچـارەم

ئـەوەن پرپیـت و بـاوە دەسـتەگیرەم لـە مێـژوودا نـەمر دەدوێ، نـەزیرەم

خـەڵاتی دەسـتی مووسـا یـا شـوعەیبم ڕەفیقـی یـاری غـارم، دوورە عـەیبم

---

[1] - پێویستە بوترێ ڕاوچی (بابم) ئەم شێعرەی بە خەتێکی نەستەعلیقی جوان پێنووسیمەوە و لە قەتعەی گرت بۆ مامۆستا و بۆ بنەماڵەی مامۆستای کردە دیاری.

تەلایین با دە بۆ سەر بەرگی لاشەم
لە دەورم شینی پڕ گڕ با، چرا شەم

لە من فێربایە هێمن، هەڵوەدایی
بەتینتر با، گڕی ناڵەی جودایی

دەبوو «راوچی» پەلاسی ڕەش لەبەر کا
بەرەی شێعری سەراپا، هەش بەسەرکا

کە دیتی من هەلاواسراوی سادەم
بەبێ پیری موغان و بەزمی بادەم

**مامۆستای ناوەستا**

ڕۆژێکی ڕوون لە ڕێکەوتێ
بۆ پرسە چوومە مزگەوتێ

مامۆستایێ وەعزی دەدا
زانستی خۆی نیشان دەدا

بە زانستی نوێوە دەدوا
هەچی دەیگوت پەنا بەخوا

کوردی نژاد، عارەبیوێژ
لە زۆر شتان دەدوا بێچێژ

بە زمانی بۆڵ و ڕیشی پان
بۆ سۆفیلکەی بۆر و نەزان

خوای بە زاڵم دەناسان
جەبری کردە، ڕچەی ناسان

وتی ڕۆژێ بەر لە خۆتان
ئێستا چۆنی، نووسرا بۆتان

لادان نییە لەو نووسراوە
چی نووسراوە، پێت براوە

بۆڵەوفرتە و فڕەی ناوێ
نەچیری، کەوتوویە، داوێ

گوتی: مرۆ ڕۆژی بەرێ
هەناوێ بوون لەسەر سەرێ

گیانێکی گەش لە هەوادا
جێگیر نەبوو لە مەوادا

نەکر، نە ڕایەڵ و پۆ بوو
جەوهەرێکی سەربەخۆ بوو

هەستێکی ڕوون بێکێش و پێو
گەشتر لە زێڕ، لە چاوی زێو

نە قۆشچی بوو، نە بازەوان
نە خاوەن ئاش، نە ئاشەوان

بێباڵوپەڕ، کۆش و داوێن
تەنیا ڕۆحێ پاك و خاوێن

ڕۆشن وەکوو ئاوی شووشان
بێخەم لە هەڵدێر و تووشان

ویستی خوا، دەستی لێدان
رەنگی بنیادەمی لێدان

دایبەزاندن لەسەر زەوی
بەرزەباڵا و کورت و نەوی

میری بۆتانن یا مەمن | ڕاساوی دەوری ئەو دەمن
ئێستا برسی یان خۆ خەنین | هەر لە بەریٚ کریان تەنین
بە خۆت نییە خۆ بادانت | پێواویانە ئاو و دانت
شوانەوێڵە یان سەرداری | بارهەڵگری یان سەرباری
دەستی بەریٚ، بیٚبەلا بیٚ | چی نووسیوە دەبیٚ وابیٚ
وتەی مامۆستا درێژ بوو | ئەوەی مێشکی هەبا، گێژ بوو
گردە پیاویٚ خۆی لێبادا | ریشی مەلا ریشەی بادا
مەلا فەرمووی کابرای جەردە | کافر دەبی ریشم بەردە
کابرا وتی نا، مامۆستا | لەسەر قسەی خۆت ڕاوەستە
چت لێبکریٚ بۆت نووسراوە | لەو نووسراوە، لانەدراوە
بۆت نووسراوە ڕۆژی پێشیٚ | ئەو ریشە ریشەت بکێشیٚ
مامۆستا زانی شکستە | ریشی لەناو دەست و مستە
زانی نەزانی بەڵایە | هەوێنی کێشە و هەڵایە
زانی هەڵەی گفتودەمی | بۆتە، تەڵەی مام ڕۆستەمی
ڕەگ و ریشەی وەبەرداوە | تۆزیٚ ڕێزیٚ بۆ نەماوە
هەتا ئاوا مام وەستا بیٚ | دەبیٚ ریشی لە دەستا بیٚ

ڕەبەت ١٣٥٧/٣/٧

## جێژنە پیرۆزە

*بۆ کاك فەتاحی ئەمیری*

وەرگرە لێم نەورۆزانەم | دیاری ساکاری شوانانەم
مستیٚ دۆغای بە بیٚبژار | یا جانتایەك هۆنراوەی لار

بەهار و بیٚبژار و ژانە سەر بیٚ | نەیار و نالەبار و دەربەدەر بیٚ
سەبا بۆتان سەما بێنیٚ هەمیشە | لە ساڵی نویٚ گوڵی نوێتان وەبەر بیٚ

لــــە چـــاڵیٚ دا بنـــاڵیٚ زاڵ و زاڵـــم
بەرەی جرجاڵ و زاڵـم هـەر پەکـەر بیٚ

بـــەهاری نـــویٚ وەڕازیٚـــنیٚ هومیٚـــدو
وەچـی وردی گـوڵی هیـواو وەبـەر بـیٚ

کلیٚتە و کورتەك و چەکمە و چەکی ڕاو
هـــەناویٚکی تـــەڕوتازەی وەبـــەر بـــیٚ

کـــچی بالۆرەبیٚـــژ و بـــچنە شـــاخی
گـــەڕی دیلانـــی ئـــازادی وەگـــەڕ بـــیٚ

دەســـی دۆ بیٚتـــە دەســـتی دۆنـــەدیوان
دەبا «راوچـی» جـەمیٚکی دۆ لەبـەر بیٚ

١٣٧٥/١٢/١٥ ترکاشە

## وردە تیٚچیٚن

وەرە هــەر پیٚکــەوە بـین خـۆم و خـۆت
وردەدرکـــــاویٚ بـــــدرکیٚنم بـــــۆت

دەتهـــەویٚ پاشـــی مـــەرگ زینـــدوو بـــی
بیٚمنـەت، بـیٚپـەت و سـیٚدارە و کـۆت

ئەو ڕۆژە بەرەو باری گـەڕی مەحکەم بە
تەنگانـە، گـەلیٚ کـەمبەرە، خـاترجەم بە

ئـەو ڕۆژە نەلـەرزیٚ بیروبـڕوات، شـیٚری
میرانـە ژیـاوی، نـەمری، بـیٚخـەم بـە

هـەر کووپەمەیەك، خۆڵ و قوڕی کۆلانن
سـازاوی دەسـی گۆزەکـەری، لیٚـزانن

هەر دەسگرە و هەنگڵی جوانی بەس نین
کە جوان لە کلّیٚ بیٚتـەدەریٚ ئەو جوانن

## وەڵامی نووسراوەی دۆستیٚك

لـیٚم دەپرســی چـۆنە حـاڵم، خاڵـە خـاو و چرچـەڵم
پیرەداریٚکـــم بـــە دەم بـــاوە، چـــەماو و گەنـــدەڵم

یـــا بـــەدارە، دارەدارەم، یـــا بـــە شـــەق دیٚـــم و دەچـــم
وردوخاشـــی ئاشـــی تانـــە و بـــەیت و بـــاو و گیٚـــچەڵم

تا بلیٚی بیٚڕەنگ و ڕوویە شانوپیل و داوەڵم

ڕۆژپەرست و حەز لە تاوم، تۆزە تاوێکم نییە
وەرزی هەستم وشکەڕۆیە، چۆڕە ئاوێکم نییە
چاوەبڕکێ، چارەدەردێکی دڵ و چاوی کزە
ئەی منی کۆسکەوتە چبکەم، تاقە چاوێکم نییە
بوومە زیوانی زەمانە، هەڵڕژاوە کۆتەڵم
خەڵکی مەستی چاوی مەست و ئاشقی لێو و دەمن
یانە سەرخۆشی قووروش و درهەمی زۆر و کەمن
یا لە نێو ڕیش و عەبادا، پڕ لە پۆز و بێخەمن
یانە داڵی سەر کەلاك و هاوەڵی کات و دەمن
من کە بێپارە و قووروشم، تاڵی نۆشم، هەژگەڵم
دوێکە «ڕاوچی» سەر سنوور و خاوەنی کێوپارە بووم
دوژمنی دێو و درنج وملهوڕ و پەتیارە بووم
سەنگەر و سێرەم، کە چاوی دوژمنی پێ کوێر دەبوو
ئێستە تووشی بەیت و باوی سەر دەمی ئەم شارە بووم
خۆی لە خم ناوە لە داخا (تاروپودی) داوەڵم
من کە «ڕاوچی» تەرتوتووشم حەز لە بەزمی تەڕ دەکەم
ڕاوە کوند و قشقەڕەی بێخێروبێر و گەڕ دەکەم
تا هەناسەم بێ، لەگەڵ دێز و درۆزن شەڕ دەکەم
هێن دەڕاسێنم گەلی چەوساوە تا دژ قڕ دەکەم
دوژمنم وا تێنەگا من بێکەس و بێهاوەڵم

١٣٤٤/٧/٢٢ قەڵادزێ

## شوانە

شوانە! برای هونەرمەندم ‌ ‌ گیانی شێعر و هەست و بەندم

زۆر لە مێژە عەودالی تۆم ‌ ‌ تێکەڵ کوڵی شمشاڵی تۆم

لەگەڵ بلوێرت تێکەڵم ‌ ‌ سووتاوێکی بێدووکەڵم

سۆزی بلوێری تۆ شوانە ‌ ‌ سووتمانێکی بێئەمانە

منیش سووتاوی ئەو سۆزەم ‌ ‌ ئاشق بە ئەو چیا قۆزەم

پەپوولێکی دەوری گڕم ‌ ‌ ئەویندداری چۆڵ و چڕم

فرمێسکی گیانێکی ڕوونم ‌ ‌ میراتگرێکی مەجنوونم

منیش وەك تۆ پەرەوازەم ‌ ‌ دەس بە داوێنی ئەو ڕازەم

هەچەن پیری حەفتا ساڵەم ‌ ‌ مەستی دەنگی ئەو شمشاڵەم

خزمێکی زۆر نزیکی تۆم ‌ ‌ کوڕی کەشك و پەنیر و دۆم

کڵاشەکەم وەك تۆ شڕن ‌ ‌ شڕەم لە هەژاری پڕن

پشتێنەکەم وەك تۆ پەتن ‌ ‌ دڵم وەك پێڵاوت لەتن

ڕانكوچۆغەی بەرم، شڕن ‌ ‌ لە بەختی تۆ بێبڕترن

ماندوو مردوو بێ داهاتم ‌ ‌ لەوێوەیە، بەسەرهاتم

بوورە و بەیارم لێ زەوتن ‌ ‌ بۆیە جێگام دەم ئەشکەوتن

خۆت ئاسایی ماندوو و مردووم ‌ ‌ هێشتا بێنان و ئاوردووم

بەو ژانەوە، دەخولێمەوە ‌ ‌ تۆ دەبینم بەو شوێنەوە

هێندەی تریش دەکولێمەوە ‌ ‌ وەك بەفری پار دەتوێمەوە

شوانە تاوێ وەرە ئێرە ‌ ‌ با دووبەدوو ئەورۆ لێرە

دەردی دڵت بۆ هەڵڕێژم ‌ ‌ چیم لە دڵدایە، پێت بێژم

لێمگەڕێ تاوێ هاودەم بم ‌ ‌ پەپوولێکی دەوری شەم بم

بچمە ناو ناخی هەناسەت ‌ ‌ ببمە باوەشێنی تاسەت

هاودەنگێکی ڕەشەشەو بم ‌ ‌ خەیاڵێکی بەبێ خەو بم

شیعری من و بلویری تۆ
هاواری من هەی بیری تۆ

ئەو کێوانە وەلەرزێنێ
پشتی شەوەزەنگ بشکێنێ

شەل و کوڵان بێنێتە سوێ
لە چاوەڕێی چاران بدوێ

شوانە کوڕی کوردی وریام
هەرۆ سەر لووتەکی بریام

چاتر لە زوو، لەو بژوێنە
بەو بلویرە تێی‌تووڕێنە

بەرەو پاڵ و نشێو و چۆم
بەرەو پاڵەی جێژیوی خۆم

بە مزگێنی بێژە پێیان
چاوەڕێ بن لەسەر سوێیان

هاکە سەر ڕاو گیرایەوە
راوەچەقەڵ، بووژایەوە

تێگەیێنە ڕووت و ڕەبەن
سەگی هار و چل شەو، تەمەن

بێژە زستان، هەچی سڕ بێ
لە خوێنی گوڵ کۆشی پڕ بێ

خۆ بەرێتە ڕیزی دیوان
داگیر بکا پۆپەی کێوان

ئاخری بەهاری ئازادی
لێی‌تێکدەدا، تەختی شادی

ئەو دەم جلکی دیلی دەدڕێ
پەری بەختەوەری دەفڕێ

دەبێتە چێژنی نەورۆزان
چێژنی ڕەش و ڕووتی هۆزان

پیرۆز دەبێ ئەو جێژنەمان
جێژنی دەمی ملهوڕ نەمان

شوانە دەسا، لە منت کەوێ
بەربەیانی هەموو شەوێ

بەو شمشاڵە خۆش هەنگێوە
بەردی خەیاڵم ببزێوە

وەگەشێنە بیرەوەریم
تاق لاوی و دەربەدەریم

پیرە «راوچی» حەفتا ساڵەم
ئۆگرێکی ئەو شمشاڵەم

دامنەناوە چەکی ڕاوم
بە هیوای هەلێکی ماوم

١٣٤٢/٤/٤

ئەسرین کیژێکی ناوەندی خوێنی بۆکانییە، برێ لە هەڵبەستە ساواکانی خۆی، بۆ ناردبووم، تا لەبارەی کێش و پێویان، بڕوای خۆم دەربڕم، منیش ئەو چەن شێعرەم بۆ ناردن و سەری خۆم لە پرێسکەی قانوونی شێعر پاراست.

**ئەسرین**

ئەتۆ ئەسرینی روونی، چاوی کاڵی
تکەی بیر و خەیاڵێکی زوڵاڵی
پەلەی ناوێ کە تۆ هێشتاکە، باری
وەکوو کۆترێکی نەخشین و بەخاڵی
بە هیوا بە، وەبەر دێ باخی هیوات
هونەر دەتباتە پێتەختی کەماڵی
بە مزگێنی دەڵێم رووناکە، بیرت
وەکوو خاڵێکی سەرخێڵی خەیاڵی
ئەوین دەتباتە پێگەی پێگەیشتن
ئەوەن دڵگەرم و سەرخۆش و بە حاڵی
دە چاوێکت لە «راوچی» بێ، کچی کورد
نزیکە راگەیێنێ، راوبەتاڵی

وەڵامی نووسراوەیەك

**کەڵەکباری خەم**

هەواڵی من دەپرسی دەربەدەر نیم
لە کونجی خۆم خزیوم، بێتەشەر نیم
دەسی پیری شکاندوویە گەڵاڵەم
گوڵی جوانیم وەریوە، بێکەسەر نیم
شەقی عەینەك دەچێژێ، چاوی روونم
لەمەولا رۆستەمی زەین و هەتەر نیم
کوڵی دڵ بۆ سەفەر دەرژێ هەمیشە
لەشی وشکم دەڵێ پیاوی سەفەر نیم
لە سەر کانی مرادە،جێ هەوارم
بە پیری لەو مرادەش بەختەوەر نیم
لە جێڕاوم پەری دێن و دەنیشن
کە پیرم خاوەنی مست و زەفەر نیم
ئەوینداری کچێکی گۆشتنۆکەم
ئەویش بەیدەستە لای وایە بەشەر نیم
نەبوو جارێ کە مێزم، تێومرێنێ
دەزانێ پیرەدارێکی بە بەر نیم
کوژاوی راوبەتاڵی، راو و رووتم
دەمی نۆبەی بەلامە، بێخەبەر نیم

١٣٧٠/١٠/٨

ڕۆژی ڕەشی ئێمە و شالاوی ڕەشەکوژەکانی، حەمەرەزاشای دیکتاتۆر، کە زۆربەی لاوان، تەرە و هالۆز و دەربەدەر بوون، و هێندێکیش لە شێخ و مێخ و زل و زۆرخۆرەکانی، خوانەناس و گیرفانناس، دەیانویست بە ویستی شا، لاوەکان ڕەداو بخەن و بن ئەشکەوت و تەلانیان پێ بەجێبێڵن، و دیلانە خۆیان بکەنە خۆشەویستی بارەگای تاغووت و ساواکییەکان. منیش ئەو دوو هەڵبەستەم بۆ یەکێ لە کوڕە شێخەکان نارد و لە دوارۆژم ترساند.

### من وام

ئەزانی کاکە چۆن ئەڕوا شەو و ڕۆم؟ ژیانی بەیچەڵ و بێڕایەڵ و پۆم؟

وەکوو دارێکی سەر چاکی بەرەو بام شەق و شەمزاو و هالۆز و قەلاچۆم

لە ژێر سەردایە دەستی ناهومێدی بەرەو بایە گوڵ و بەرگ و پەلوپۆم

لە بن قرتاوە شابالی فڕینم فڕێم داوە چەکی ڕاوی کەژ و کۆم

کوڕی کوردم بە کوردی وا بە ڕووتی لە بن دارێکی بێ پڕژ و پەل و پۆم

هومێدم بەرنەداوە ماوە ماوە بە کوێرایی دڕ و دڕ ڕوونە ئاسۆم

### ئەتۆ چۆنی؟

ئەتۆ چۆنی برای شێخی بە شاقەل؟ لە سەرخۆ، وەك هەڵۆ دەفڕی وەیا قەل؟

بە سەربەرزی لە سەربەرزی دەنیشی وەیا نزم و نەوی نیشتوویە سەر زەل

لە بەرزایی چیا، هیچێ دەزانی چ قەوماوە لە هۆزی بێکەسی مەل

لە بەر پۆزی ڕدێن و شاقەلی شۆڕ دەبیسی نیوەنووزەی پێ کز و شەل

برا شێخ بە، نەوەك شێخی ورگ دار زل و زۆرخۆر و سەربار و تەوەززەل

لە بیرو بێ، وتەی لاوی خوواناس خووناسی بە مانا، خزمەتی گەل

لە «ڕاوچی» وەرگرە دەرسێ براگیان مەبە شێخی زگ و داڵی دەم و هەل

١٣٥٣/٥/٨. شارۆچکەی ڕەبەت

## سەری بێتاج[١]

| | |
|---|---|
| قــۆرت و بـــەلام وەســـەرگەڕێ | ئاســـۆی ڕوونم، ڕەش هەڵگـــەڕێ |
| ژیــنم تفــتوتــاڵ و تـــوون کـــەن | خۆشـیم لەسـەر تـەفروتوون کـەن |
| هـــەڵمبـــڕن چەوســـێنەران | لێـــرە و لـــەوێ، لـــە هەنـــدەران |
| چـــۆنیان دەوێ بمـــچەوسێنن | ڕۆڵـــەم لـــە خـــوێن بگـــەوزێنن |
| دوو پەنجـــەی نۆبـــەرەم بـــبڕن | نـــانم بخـــۆن ســـفرەم بـــدڕن |
| لـــە خـــەو بـــبڕێم ڕۆژێ، شـــەوێ | برســـی، تـــوونی، لێـــرە و لـــەوێ |
| بمکەنـــە ســـرکی ســـەر کێـــوان | گیـان بێتـە سـوێ لەسـەر لێـوان |
| شـارم بـە بۆمبـا خـاپوور بـێ | گونـدم لـە خوێنـا، ڕووسـوور بـێ |
| لـە ئەشـکەوتا، نـوێنم قـوڕ بـێ | تـــەپروبڕ و ساردوســـڕ بـــێ |
| بـــا بـــرژێنن بـــڕوخێنن | خـــوێنم، ژیـــنم لـــە بـــن بێـــنن |
| لـە سـەر داوا لـە سـەر مـافم | ســـوورم هـــەتا پێـــی تـــەنافم |
| نالـــەرزێنێ مـــووی ئیمـــانم | ســـەبرم هەیـــە، موســـوڵمانم |
| تەنگانـــە بـــەری کەمبـــەرە | زاڵـــم ڕۆژێ بـــێهاوســـەرە |
| خـــوێنخـــۆر ئـــاخر دەتوێتـــەوە | نۆبـــەی هـــەژاریش دێتـــەوە |
| جلکـــی ســـیخوڕ وێڵداشـــی دڕ | دڕدڕ دەبـــن بـــە کلاشـــی شـــڕ |
| تاجەســـەری، بـــێســـەر دەبـــێ | ســـەر بـــێتـــاج و بـــێبـــەر دەبـــێ |
| ئـەودەم ڕاوچـی بـە چـەك دەبـن | خـاوەن هێـــز و مەچـــەك دەبـــن |
| ئـــالای ئـــازادی دەچـــەقێ | دوژمـــن چـــەپڵەی لێدەتـــەقێ |
| ڕێ دەکـــەون دەیـــبەرەتێنن | قـــەرزی کۆنـــەی لێدەســـتێنن |
| «ڕاوچـی» تـەلان و تـەرت و سـوێ | زۆر پێناچـــێ لێـــیدێنـــە ســـوێ |

ڕەبەت . ١٣٥٤/١/٨

---

[١] – ئەم شێعرە لە چەن نوسخەدا بە نێوی «سەبرت هەبێ» و «سەری بێتاج» و «تاجی بێسەر» هاتووە و لە سروەشدا بڵاو بۆتەوە.

## دووبەیتییەکانی ڕاوچی

دەمـــی شـــێعرم، دەمـــی تـــۆی دی لـــە خـــەودا
دڵ و دیـــــن و ژیـــــانی خـــــۆی، بـــــە ئـــــەو دا
لـــە گـــەرمی لێـــوی تـــۆوەن، لێـــوی شـــێعرم
کـــە بەرچـــاوە، بڵێـــسەی گـــڕ لـــە ئـــەودا

❀❀❀

لـــە جێـــژوانێ شـــەوێ دی، تـــا بـــەیانی
چ دەردێکـــــی بـــــە مـــــن دا، چـــاوەڕوانی
چ نەنگـــــە بـــــۆ کـــــچێکی کـــــوردەواری
دەمـــــێ وادە و دەمێکـــــی دی، ژیـــــوانی

❀❀❀

بـــە نـــازی تـــۆ لەبـــەر بـــادا بـــەروبووم
لەســـەر تـــۆ بـــوو لـــە دەستم دا هەچـــی بـــووم
لـــە مەیخانـــەی خـــەمی تـــۆ دا گـــوڵی مـــن
دوچـاری سـەد گـوڕ و شـین و تـەزوو بـووم

❀❀❀

ســـەر و ئەســـتۆ لەبـــەر پێتـــا نـــەوی بـــوون
دوو چـاوم تووشـی تانـەی بـێخـەوی بـوون
بـــە خـــوێنی دڵ لـــە نافـــەی باخـــەڵی تـــۆ
هـــەتا جـــووتێ هـــەوێردەم بـــۆ کـــەوی بـــوون

❀❀❀

شـــەوە، دەســـت و دەم و داوێـــن ســـرەوتوون
دز و ڕێگـــــر، دڕ و دارۆغـــــە خـــــەوتوون
کەچـــی دەســـتی بـــزۆزی تـــۆ لـــە بـــەختم
لـــە نـــابێ و وامەکـــە و لاچـــۆ نەکـــەوتوون

❀❀❀

دە بەس بشکێنە ئاوێنەی دڵی لاو
بەشی بۆ هەر تماشا بێ لە بالاو
گوڕووی ماچێکە تامـاوم لە گۆڕێ
لە گۆڕا هەر کراسێکە و گەزێ جاو

❀❀❀

دڵم، هەر وەك گوڵ و لەرزانە، لە گوێت
نەحەجماوە، سڵ و لەرزانە، لە سوێت
لەسەر بەرماڵ و تاتی نوێژی فەڕزم
لەگەڵ جووتێ مەم و پاوانە دەدوێت

❀❀❀

هەتا عیشقت لە دڵ دابێ گەشاوەم
لە شادیدا گەش و ڕوون و حەساوەم
هەتا دەستم مەمێ بگرێ، شەوانە
دەرك ناکەم کە من پیر و گەڕاوەم

❀❀❀

هەناسەم بەرد ئەتاوێنێ لە دووریت
دەسم ناگاتە داوێنی سەبووریت
کز و کوڵ و کڵۆڵی هێڵی پیریم
کە نەخشاوم بەرەو تۆ، تۆ دەبووریت

❀❀❀

لە ڕووما دامەپۆشە گەردنی زەرد
لەمە زیاتر مەچێژە پێم کوڵ و دەرد
قەرارم چووکە ماچێ بوو لە کوڵمەت
بە قەولی خۆت وەفا کە ئەی کچی مەرد

❀❀❀

مەدە تانە لە دوو چاوی بە تانەم

بەرەو تیری مژۆڵی تۆ نیشانەم

دە گوێ بێنە، پەنا کورکەی دڵی تەنگ

بەزێکت بێ بە ناڵینی شەوانەم

❀❀❀

دەبا ئەمجارە ناڵینم بە نەی بێ

وەرێخەم ناڵەناڵێ نەی کە نەی بێ

بوێژم هەڵبڕاوی بسکی خاوم

دەبێ ئەو هەڵبڕانە تاکوو کەی بێ

❀❀❀

بەهار و تاوەباران و کەژوکۆ

لە ئەشکەوتی تەڕوبڕ دا من و تۆ

چ خۆشە دووبەدوو، تۆبەشکێن بین

وەباڵی لەشبەلەش، بگرینە ئەستۆ

❀❀❀

گوڵی من! وا سەرم دانا لەبەر پێت

لەمە زیاتر مەبووژێنە دڵی شێت

دەسی تاسەم بە داوێنی بەزەت بێ

هەڵە ئەوشۆ ئیجازەم دە لەسەر جێت

❀❀❀

بە دڵ ڕووت بێنەوە هەر دوو لە فێڵان

گرێ دەین پێکەوە بسک و سمێڵان

دەمێ دەستەوملان و دەم لە دەم بین

ببینە مشتەریی کوڵم و تەوێڵان

## بەهار و جیٚهەواری کۆن[١]

بەختی ڕەشی زستانیٚ، ڕەشی کەوتە بناران — ئەشکی هەوری هەریٚمان، ڕژایە نێو نزاران
زستانی خستە شیوەن، هەتاو و تاوەباران — چاوەچاوی گوڵانە، لە لاپاڵ و نساران
بزەی دا بە دەماوان، گاڵتە و گەپی چناران — چەنەی زستانی شکان، چیمەنی نێو بەیاران

مزگێنی بیٚ لە یارم، سەوزە بووره و بەیارم
شیرین تەشی دەڕێسیٚ، لە جیٚهەواری پارم

بەهارە هاتەکایە، هاتە و هاتی چیایە — پێتەڵووکەی زستانیٚ، بە باوە هەڵوەدایە
سەهۆڵی دەرکوبانان، کوژاوی دەستی بایە — مامەخەمەی خەماوی، خەمی نەماوە شایە
بولبول، گوڵی هێناوە، بۆ گوڵ دەچێتە شایە — (مەنیج بارگەکەی تێکنا، گەیشتە هەمزاوایە)

مزگێنی بیٚ لە یارم، سەوزە بووره و بەیارم
شیرین تەشی دەڕێسیٚ لە جیٚهەواری پارم

سوێروو لە سیٚتەپڵی دا، لەسەر سیلەوەتاخان — پووستە بەستەی لە دەما، مزگێنی دا بە باخان
بای وادە وا بە وادە گەیشتە کێو و شاخان — ڕوومەتی ڕنووی ڕنی بە تینی شووشە داخان
شادی هات و دابەزی، کەسەر بەزی لە داخان — گوڵان دەڕۆنە شیویٚ، شیوان بوونە چراخان

مزگێنی بیٚ لە یارم، سەوزە بووره و بەیارم
شیرین تەشی دەڕێسیٚ لە جیٚهەواری پارم

خەرەکڕێسەی هەواری، دای لە سەنتوور و تاری — لەسەر ترۆپکی داری، گاکۆترە و قەناری
دەڵێن موژدە بیٚ بەهار، بە خۆی و خاروباری — لە ڕیٚدایە، بەڕێوەن قەتار و کۆچ و باری
ئاوی گوڵان دەدێریٚ لە گاکێڵ و بەیاری — بیزا و مەندۆک و سۆڵین دێنەوە باری یاری

مزگێنی بیٚ لە یارم، سەوزە بووره‌و بەیارم
شیرین تەشی دەڕێسیٚ لە جیٚهەواری پارم

بەفری تەلان و دۆڵان، بوونە پێشێلی تۆڵان — وەك شەلوگێڕ و کۆڵان، بەربوونەوە زەندۆڵان

---

[١] – لە نوسخەیەکدا بە نێوی «بەهار و جیٚهەواری کۆن» نووسراوەتەوە. لاوێك بە ناوی ئەبووبەکری زیرەك دەیهەویست بەهاری شاعیران کۆ کاتەوە، شەوێك هاتە ترکاشە، ئەمنیش لە دواییدا ئەو شیعرەم بۆ نووسی. هیوادارم ئەو کارە بکات.

له خوێنی پیسی زۆڵان، شۆراوە دەرك‌وكۆڵان — قەنەوزی سەوزی پۆشی، چیا، بەختی كچۆڵان
بێری چوونەوە بێری، بۆ سەر دەراو و مۆڵان — رێواس و شەنگەبێژا، چوونەوە مێز و كۆڵان

مزگێنی بێ لە یارم، سەوزە بووره و بەیارم
شیرین تەشی دەرێسێ،لە جێ‌هەواری پارم

خاڵخاڵۆكەی مەحالان، دەفرن بە تیژە بالان — دەچنە لای رووبەخالان، پێی دەڵێ ماڵەخالان
دەڵێ خۆشی لە خۆتان، زیاتر لە ساڵی سالان — كیژان دەچن بە بووكی، دەڕۆنە گەورە مالان
كیژان دێنە دیلانێ، هەڵدەپەڕن لە پالان[1] — چاوی ڕۆژێ هەڵنایە، لەبەر پەرەنگ و خالان

مزگێنی بێ لە یارم، سەوزە بووره‌و بەیارم
شیرین تەشی دەرێسێ لە جێ‌هەواری پارم

شوانە لە هەرد و بەردان، دەنێژێ خەم و دەردان — بە شمشاڵی دەنازێ، نازی هەرێم و هەردان
نەرم تێی‌دەتووڕێنێ، هەوای قەر و گوڵ زەردان — ئەسپی هەستی بەزینە، هەوای«زینی» لە سەردان
باخەوانی ئەوینە، باخە گوڵی لەبەر دان — جوانە هەر لەوی جوانە، دابونەریتی كوردان

مزگێنی بێ لە یارم، سەوزە بووره‌و بەیارم
شیرین تەشی دەرێسێ لە جێ‌هەواری پارم

راوچی! كە چوویە ڕاوێ، مەچۆ ترۆپك و لێژان — خاوی، دەكەویە داوی، لۆرەی بالۆرەبێژان
بزۆز و چاوچنۆكی، مەڕوانە پەرچ و گێژان — كچان لەوێ لە شیون، رووتن شلێر و بێژان
نەكا بشكێنی تۆبە، بە تام و بۆن و چێژان — لە لات وابێ ڕەوایە، چێژەیەك بو بوێژان

مزگێنی بێ لە یارم، سەوزە بووره‌و بەیارم
شیرین تەشی دەرێسێ لە جێ‌هەواری پارم

١٣٧٥/٨/٢٥

---

[1] لە نووسخەیەكدا «یالان» هاتووە.

بۆ شکاندنی تازیە و ماتەمی شاعیری خوواناسی کورد، مەلەوانی بەحری عیرفان، مامۆستا «حەقیقی» گوتراوە.

## من و بولبول

دە بۆمبێنە سەبا بۆنی بەهار و بەرهەم و کاری
دەرم بێنە لە ناو چین و چرووکی، شیوەن و زاری
سەبا! دەستم بە داوێنی بزەی نەرمی بەیانت بێ
بە بولبول بێژە بم گاتێ بە خۆی و مەڵحەم و چاری
بە خەم وشکەگەرووی شێعر و دەمی هەڵبەستی مەیگێرم
لە هەستم ڕۆچووە چمکی خەم و خە مبار و بێزاری
بەهار و بەربەیان و شەونم و گوڵ ماتڵی بەزمن
دەبا دەستێ بەرێ، بۆ دووزەل و تەپڵ و دەف و تاری
لەسەر سوێگەی هیوا بەزمێ وەڕازێنێ کە ڕازی بێ
دڵی دڵپڕ لە ژانی شاعیری شێعری تەڕ و کاری
وەلاوێنێ بە لاوک، لانکی شێعری تەڕ و تازەم
سەری خەم با بە خەم داچێ، وەلاچێ خێوەت و باری
لە دوو کۆچی ئەدیبی کۆچەری کووچەی ئەدەب مەگری
مەحاڵە گوڵشەنی هەستی، بەبێ بولبول کەوێ باری
مەڵێ پیری موغان ڕۆیی ومەی و مەیخانە، بێپیرن
یەکێ دێت و یەکێ دەڕوا تەبیعەت وایە بڕیاری
شەوی شێعر و شکانی ماتەم و جەژنی ئەدیبانە
دەبا ماتەم تەمابڕ بێ، وەلاچێ سێپەك و داری
دەبۆم بێنە سەبا! بۆنی«حەقیقی» شاعیری کوردم
هەتا شێعری تەڕوتۆڵم، لە گوڵدا بێ دەم و زاری
لە ڕیزی مام هەژار و ئەفخەم و ئاوات و هێمنمە
لە نەخشی وانە نەخشینە، ئەدەب نەخش و کروکاری
هەموو شاگردی دەرس و مەکتەبی ئەو کۆرە پسپۆڕن
کوڕ و کیژی بوێژ و دژبەزێن و دەمتەڕی شاری

لەسەر گۆڕی«حەقیقی» بەس کە بولبول، شیوەن و نالە
نەکا شین بێ لەسەر گۆڕی من و تۆ، شینە یەکجاری
ئەگەر فامت هەبێ، بولبول، بە مەی مەستی نییە ڕێزی
بە بێ مەیگێڕ و مەی شەرتە، کە مەستت کا ئەویندار
من و تۆ دووبەدوو بولبول، وەکوو یەك تووشی تووشێکین[١]
ئەمن دوورە هەرێم و تۆ لەگەڵ گوڵ، دوورە دیداری
ئەمن «ڕاوچی» چیای کوردم، بە کەم مەگرە کەموکورتیم
قوتابی مەکتەبی کوردە، سیامەندی پەلی داری

کاك ڕەسوولی چووپانی جانبلاغ ناسراوە بە «شوانە»، شاعیری ورد و وتەجوان، دەستەیە شێعری بە قەدوبالای منا هەڵوتبوو و بۆی ناردم، و ماریفەتێکی زل و زەبەلاحیشی بە هەست و شاعیری دابووم. هەر چەند کاك شوانم زۆر خۆشدەوێ، بەڵام خوا لێمهەڵناگرێ تاریفەکەی هەموو درۆ بوو. بەڵام خۆشی تێدا ڕانابوو، وا دیاربوو داوای شەڕەغەزەل، کێبەرکێی شاعیری تێدا ژێرمەڵۆ کردبوو. منیش بەو شێعرە داوای ئەماننامەم لێکرد و بە خوڵای شێعری لەڕم سپارد.

***ئەمان‌نامە[٢]***

شێعری تۆ شوانە! شەوانە، لایەلایەی لێ دەوێم[٣]
تاجی سەربەستی لەسەر ناوە، سەرانەی لێ دەوێم
ڕووتوقووت و ڕوو لە مەرگە، داوەڵی بەرگ و گەڵام
بێگوڵ و بەرگ و گەڵا، بۆن و بەرامەی لێ دەوێم
سرکە سیسرکی خەیاڵم، خاڵییە خاڵی وتەم
پیر و بێشیر[٤] و نەزۆکم، شیرە شوانەی لێ دەوێم

---

[١] – ڕاوچی لە نوسخەیەکدا لە وشەی «ڕۆژێکین» کەڵکی وەرگرتووە.

[٢] – لە نوسخەیەکدا بە نێوی «بەیانی و گەز» هاتووە.

[٣] لە نووسخەیەکدا ئاوا هاتووە: شێعری تۆ شوانە گەیشت و شوانەی شوانەی لێ دەوێم.

[٤] لە نووسخەیەکدا «زورهان» هاتووە.

لێوی شێعری تۆ، لە لێوی گوڵ، بزەی بردۆتەوە

هەستی خەستی ئاگرینە، سەد بە هانەی لێ دەوێم

دوورە مەیخانە و مەی و مەیگێڕی لووسە، پیاوی پیر[1]

کەشمونەشمی شێعری کۆنت، کۆنەبادەی لێ دەوێم

بوومە سۆفی خانەقا و خاوەنی ڕیش و جبەم

شێعری تۆ بەو ڕیشەوە، ئیشی کوڕانەی لێ دەوێم[2]

هەروەکوو تۆ لار و گێڕە، شێعری بێ شانوملم[3]

نا هەقە تەبعی تەڕی تۆ، ململانەی لێ دەوێم

چەککراوێکی دەسی[4] دەورانی بێ‌ودم و فەڕم

بەدفەڕی، شێعری شەڕی[5] تۆ، بەزمی کاوەی لێ دەوێم

کۆنە «راوچی» چەککراوم، بێ‌چەك و چەکمە، وڕم[6]

شێتییە شێعرت، نەچیری چاردەساڵەی لێ دەوێم

١٣٧٦/٧/١٠

شاعیرێکی تازە پێگرتوو، جحێڵ و بەسمێڵ و وردبین و بەزەوق، کاك مەلا غەفووری کەسنەزانی، واتە خەڵکی گوندی کەسنەزان، نازناو بە «ژاکاو» پۆلێك هەڵبەستی بە دەم و لووتی مندا کێشابوون، لوتفی خۆی لەمەڕ ڕابردووما نیشاندابوو، منیش بەو غەزەلە، غەزای خۆم ڕاگەیاند و کەسنەزانم وەبیر هێناوەتەوە.

---

[1] لە نووسخەیەکدا ئاوا هاتووە: لووس و عازەبم

[2] – یان: وەك کچی تووسەن بەشەو بەزمی کوڕانەی لێ دەوێم

[3] لە نووسخەیەکدا ئاوا هاتووە: هەروەکوو تۆ لار و گێڕە، هەستی گێڕ و لاوەچم

[4] لە نووسخەیەکدا ئاوا هاتووە: دەم

[5] لە نووسخەیەکدا ئاوا هاتووە: تەڕی

[6] لە نووسخەیەکدا ئاوا هاتووە: کۆنە ڕاوچی چەککراوم، ڕاوەچەك یاساغە لێم

**یادێ لە کەسنەزان**

کەســـنەزان و کەســـنەزانی، کـــێ دەزانـــێ کــێن و چــین
نۆکــەری بەرچــاوی وانــە، چــاوجوان و جــوانی چــین
کەســـنەزانە، جـــێهــەواری شـــیرن و فـــەرهادی کـــورد
کەســـنەزانە جێگـــە فرگـــە و هەڵمـــەتی لاوی بـــەتین
تــا دەســم بگـرێ قەڵــەم، ئــەی شــاپەڕی بــاڵی خــەیاڵ
هــەر دەوێــژم دیمــەنی تــۆ، وەك بەهەشــتی ســەرزەوین
گوڵ بە دەستێ دەستی گرتم، شەو لـە نێو گوڵزاری تۆ
هــەر لـە وێڕا بوو کـە هەستم، بوو بە گوڵزاری ئەوین
گــەر دڵــی کــونکـون بــە ناســۆرە و تکــەی لــێنــابڕێ
ئەو دەمی پێکرا، بە سیلەی چاوەچاوی، چاوی شین
ســێو و مێـوی بەردەمــە، زیــن و مــەمی نێــو بــاخی تــۆ
کلْفەتی جێژوانی تۆیە، «خاتوو ئەستێ» و «خـاتوو زیـن»
دوێکــە «ژاکــاوێ» نــەکاوێ، یــادی تــۆی هێنــاوەبیر
ژینــەوە، فرمێــسکی ســوێری، بەربــەیانی گەرمەشــین
مــوژدە بــێ بێکــەس نــەماوی، ڕوونــە ئاســۆگی هیــوات
بــۆ بــەرەی تــۆ تێدەکۆشــن، لاوی«ژاکــاو» و خــەمین
کەسنەزان! ئەی کێڵە سیپانی، «سیامەند» و «خـەجێ»
دەچــنە ســەرداریٚ لــە پێنــاوت، هــەزاران شــێخەمین
ڕاوبــەتاڵی بــۆ نییــە «ڕاوچــی» هــەرێمی جــوانی تــۆ
لاوی تــۆ دوژمــنبەزێنــە، بــێهــەراس و بــێبــەزین

١٣٧٦/٦/٤

**هاوار لە دەس پیری**

دەپرسـی لـێم بـرا، کـۆن و کـەلاك و کۆڵـەوارێکم

لـەبن سـەرباری پیریـدا، نـەخۆش و لـەش بـەبارێکم

تەمـەن جـەرگی بڕیـوم، لێـیدڕیـوم دەفتـەری ژیـری

بـەرەو بێروونـی خـەمباری، خـەریکی بارەبـارێکم

گەرووتـەنگ و پـشووتەنگ و بـەهاری لـیێ ونـە لێـوم

بـە دڵ ئاتـاج و موحتـاجی بـزەی لێـوی بـەهارێکم

تەمەن گەستوومی، چاوم یەك بە دوو دێنێ، بەرەو پیرم

لـە خـوێنی دڵ پـڕە کاسـەی هـەموو شـام و نـەهارێکم

هـەموو دەردی بەدەمـدا کـردووم، دەردی تەمەنـداری

لـەوەش بـەولاوەتر، شـین و جـەخاری کۆنـەیارێکم

بـەرەو گـۆڕ و سەرەوشـۆڕم، لـە یـارانم خوداحـافیز

ئـەوەم یـارە کـە ڕابگـرێ، نـەواری شـوێنەوارێکم

خـوا زێـدم بـەبێ شـێعری تـەڕی«راوچـی» نـەبێ تـاکوو:

وەسـەر بـەردێ نـەمامی بـەردەلان و دەم حەشـارێکم

١٣٦٥/٣/٣ . سەدراباد

به وتەی میرزا «محەمەدی ئەفخەمی»، ئەم غەزەلەی ژێرەوە هۆنراوەی مامۆستا «مەلاهادی ئەفخەمزادە»ی برایەتی:

### کوڕە شێخ

دەڵێن ڕۆژێك، کوڕە شێخێك بە بابی خۆی گوت ئەی باوە
لە مەکر و فەندی تۆ عالەم هەموو سەریان بەسووڕ ماوە
ئەگەر چی من کوڕی تۆم و جگەرگۆشە و عەزیزم بۆت
لەبەر خاتری منە داییم، کە کارو شوغڵی تۆ ڕاوە
لە کونجی خانەقا دەخزێی، شەو و ڕۆژ بۆ نچیرگرتن
وەکوو گورپەی، لەسەر بەرماڵ بە حیلە چاوی قونجاوە
بە زاهیر عابد و زکرت هەموو قورئان و ئایاتن
کەچی بە دزی دەڵێی یا مشك و یا کەشك و پشی میباوە
هەمیشە هەر خەریکی مەکر و فێڵ و فیت و تەزویری
عەبا: تەپکە و درۆ دانە و زمانت داوە، بادراوە
دەزانم بۆمنە سەرپاکی ڕەنج و کار و کەسپی تۆ
هەتا دونیا لە من خۆش بێ، ئەتۆ دینت لە دەس داوە
لە بەر منتە، سەراپا، ئەم بسات و داموودەزگایە
وەکوو، دێوانە لەم دنیایە، عەقڵی تۆ کە گۆڕاوە
لە شاری نامسوڵمانان لە بازاڕی خەیانەتدا
دوکانێکی درۆت، بۆ سەربڕینی خەڵکی داناوە
ئەوانە و سەد ئەوندی تر کە ناگوترێ لە شەرمانا
دەزانم پاك لە بۆ منتە، هەچی ڕەنجت کە کێشاوە
ئەما خۆ من نەفام و بێشوعور و نامسوڵمان نیم
کە ڕازی بم بە ئەو حاڵە، کە دینی خەڵکی تێکداوە

دەبێ من چۆن دڵم خۆش بێ بەوە، خۆشخۆر و تەڕپۆش بم

مریدی ڕووتوقووتیشمان، لە خەودا خاوەنی جاوە

ئەمن پۆشتە و ڕەحەت، بێخەم، خەریکی عەیش و نۆشی بم

لەگەڵ دولبەر لە بن سێبەر، وەتاغ و سفرە چنراوە

مریدێ ڕووت و پێخاوس لەبەر قرچە و کوڵی گەرما

لەبەر تاوە، دەموچاوی، وەکوو نێوتاوە، سووتاوە

لەگەڵ ئەو ڕەنج و ماندوویی و زگی برسی و دڵی پڕخەم

لە مانگێدا، شەوێ، جەژنی، بەشی ئەو هەر پیازاوە

دەبێ چۆن من دڵم بڕوا بدا، ماڵی ئەوانە بخۆم

بە زەهرم بێ ئەگەر بیخۆم، حەرامە، پیسە، خوێناوە

ئەتۆ بۆ خۆت دەڵێی شێخم، لە زومرەی ئەولیایانم

نوفوسم پاکە بۆیە گەر دۆعاکەم، بەردی ڕق ئاوە

کە وایە بۆچی، بەردێك ناکەیە زێڕ، یانە زیوینە

ئیتر چاو نەبڕیە دەس کەس کە داخۆ هیچی هێناوە

کە تۆ دۆعات بە قازانجی کوڕ و ماڵت قبوڵ نەکرێ

بە چی خەڵکت فریو داوە، خودا بتکوژێ ئەی پیاوە

ئەوا ئەوجار، قسە و وەعزی برای خێرخوام لە لا ڕاستە

کە پیاوانە بەبێ باکی، گوتویە، وا قسەی قاوە

ئەگەر شێخ و خەلیفە خاوەنی کەشف و کەراماتن

لەبەر چی خەڵکی کوردستان لە فەقر و زیللەتا ماوە

کە ئەهلی خارقولعادەن لەبەر چی سۆڤی یا دەروێش

لە باسی دین و مەزهەبدا، ئەوەی زانیویە هەر ناوە

هەتا کەی نامسوڵمانی حەیات بێ، بەسیە ئەم کارە

لە ناڕاستی ئەتۆیە کورد، لە دونیا دینی شێواوە

**وەڵامی جەنابی شێخ بۆ کوڕە زاناکەی**

**بە هۆنراوەی(ڕاوچی) ساردەکۆسانی**

**کوڕم، ڕاستە هەموو زکر و تەلیلەی من تەڵەوداوە**

**بە داوی دینە گرتوومە، هەچی گشتە وە یا خاوە**

**کوڕم ئە و تەپڵ و زەرگ و مێزەر و ڕیشەم، کە دەیبینی**

**میراتی باوباپیرە بەجێیە بۆم بەجێماوە**

**بە فرمێسکی ڕیابازی، دەدێرم وەرزی داهاتم**

**دراوم بێ، دەراوم ڕۆشنە، جێگەم لەسەر چاوە**

**من و تۆزێ ڕدێنی ڕاچەنینی پڕ لە دووڕوویی**

**دەسی هەر ئاڵ و وێر و دەسبڕی شارانی با داوە**

**نییە ترسم لە هەرچی، چی دەڵێت و، چی دەڕاوێنێ**

**مەڵێ ئەو شێخە، کەی شێخە، کە ویژدانی لە دەسداوە**

**کوڕم ئاقڵ بە، دینار و قرۆشت گەر نەبێ پووچی**

**پڕوپووچی، ئەگەر عیلمت بەخوڕ، بڕژێتە دەریاوە**

**قەڵا و قفڵ و کلیل و دەرکەوانی لێنەزانت بێ**

**لەناو قەومی نەزانا، کۆنە بەرماڵت، لەسەر ئاوە**

**گەلێ ئەهلی عیلم، گەوج و نەزان و کەودەن و گێژن**

**کە شێخی، دوو، درۆی پێبێ، لە مێژە بۆی لە کەوداوە**

**زمانی سیخوڕی، سیخورمەیە، بۆ دوژمنی ڕاوت**

**ئەگەر سیخوڕ نەبێ، ڕاو و تەڵە و داوت لە دەس داوە**

**سەپانی دەستوپێ چڵکن، نەفامە ژینی پێناوێ**

**مشایەخ ژینی پێویستە، لە ویستی دینی لای داوە**

**سپێرەی من لە دڵ بگرە کوڕم دوو، ڕوو، نەبی، ڕووتی**

بە ڕووتی چت بە چی نابێ، نە لەملاوە، نە لەولاوە

هەتا دەمری لە ویژدان و لە ڕوحم و عاتیفە مەدوێ

دراوی زۆر و بۆرت بێ، مەپرسە کێ لە قوڕ ماوە

خەتی تۆ پارەیە و پۆزی ڕدێن و یاهوو یا پیرە

مەترسە، بۆ درۆزن، پۆلەکەر هەر بوون و هەر ماوە

قەمە و ساتۆر و تەکیە و خانەقا، داو و تەڵەی ڕاون

هەزار، پۆڕ و پەری دەگری، ئەگەر ئاقڵ بە جێ ڕاوە

کوڕم ئاسانە، مەیلت بێ، فڕوفێڵی، مشایەخ بوون

عەبای بە درۆ هەرای بە درۆ، هەمووی بە درۆیە بەرچاوە

ئەگەر تەڕپۆش و تەڕنۆشی بەرەو باخی حەرەم ڕابە

تەڕی لەو شوێنە، هەر سینە و، مەم و داوێنی نازاوە

لەوێ یەک مەستە، یەک مەستی لە ناو دەستایە وەستایە

لەوێ هەر کەیفەیە، کەیفت هەبێ، هەر کەیفە دەستاوە

دەمت خۆش، شاعیری ڕەند و بوێری، قەڕنی، لاساری

بە قوربانی دەمی تۆ بێ، دەف و تەپڵی، بە ئاژاوە

١٣٧٥/٣/٢٢ ترکاشە

**لالەخەوێك**

لە خەودا بولبولی زەوقم، لەسەر سینەی سپی ئەوشۆ

بەبێ شەرمی، گوڵی شەرمی، لە بەژنی گوڵچنی ئەوشۆ

هەلی دامێ فەلەك، دەستم لە داوێنی گوڵێ وەرهات

گرێکوێرەی کەمەر شل بوو، کراوە، داخزی ئەوشۆ

لە بوتخانەی پەلوپووزا، بزەی هاتێ بوتی نەوسن

مەتەی دەستی قەزا، بورجی سەری نەوسی سمی ئەوشۆ

بەهانــەی دامــە دەس، لێــوی بــزۆز و لالەشــی ڕووتــی

دەسی خۆش بێ، قەمەی شێخی بەهانەی لێبڕی ئەوشۆ

کرا هەرچی دەبوو، نەکرێ، لە چاوی گوڵ ڕژا خوێنێ

ســەرو بــەرگی، حــەیا دۆڕا، لــە بــەزمی ڕافــزی ئەوشــۆ

لــە میحرابی پــەل و پــێدا لــە پــێ کــەوتم، جــەنابی شــێخ

گــوڵی تۆبــەی بــە بــادا دا، گرگــاڵی دزی ئەوشــۆ

شــکا بــێشــك، شــکی ڕۆژوو، هــەواڵی چــەژنی بــۆ هێنــام

لــە ژێــر هــەوری کراســی چین، هیلالــی بــێشــکی ئەوشــۆ

بــە مــەیگێڕم، بڵــێ «راوچــی» بــەرەو مــن، بــا نــەدا بــادەی

هەتا مەحشەر تەڕ و مەستم، بە بادەی گوڵچنی ئەوشۆ

ترکاشە

ڕێکەوتی ٦/٥/ ٦٨ هەتاوی، کۆڕێك بۆ یاد و بیرەوەریی مامۆستا ئاوات لە یەکێ لە مزگەوتەکانی بۆکان گیرابوو. بەڵام نەیانهێشت ڕێوڕەسمەکە بەڕێوە بچێ. مامۆستا ڕاوچی بەم شیعرە وەڵامی ئەو کارە دزێوەی داوەتەوە.

## چەکی ڕزگاری

ویستم هەستم بۆ مەبەستم
کاڵۆکەی، ئاسن هەڵبەستم

لە لالەخەو، خۆ ببوێرم
خۆم بە خەیاڵێ بسپێرم

کۆمای خەیاڵم لە کەو دەم
دڵ چی دەوێ، دڵ بە ئەو دەم

ڕابم، بەرەو کوێستانی کورد
سەری «بەسری»، پۆپەی «هەڵگورد»

«کوڕەش»، «مامەڕەش»، «بەر نێری»
«ڕێلکە» و «سۆیلە» و «بازی بێری»

«سادر»، «ساسۆن»، «جەبەل حەمرین»
«پۆپەی پیرس»، «چیای شیرین»

بچمە چاوەی چاوگە گوڵان
جێ هەڵوێستی دڵ بە کوڵان

سەر دەراوی، شوان و بێران
جێگە قریوەی، هاوێران

جێگەی، حەز و، بریای دڵان
ببمە میوانی نێو گوڵان

لە هەر گوڵێ چەپکێ بکرم
بە باڵای شێعرێکی ببڕم

شێعرێ بە گوڵ وەرازێنم
لە سوێگەی دڵ دایبەزێنم

تا تێبگەن بەرز و نەوی
شێعرە فریشتەی سەرزەوی

کامە شێعر شێعرێکی زەنگ
لە سوێی کۆمەڵ، بە سوێ بە دەنگ
بە دەنگ، بە دەنگ دەنگی کاری
چەکە، چەکە بۆ ڕزگاری

جامی جەم کە هەبێ شێعرە
هاوتا لەگەڵ گەڤ سێحرە

شێعر تیشکێکی زێڕینە
بە تینێکی هێن دێرینە

هاوتەمەنی بابادەمە
دەرمانی هەر دەرد و خەمە

شێعر بووکی حەز و هەستە
شێعر نەبێ ژیان پەستە

شێعر بەڵگەی زیندوو بوونە
زنەی هەناوێکی ڕوونە

شێعر ماکەی سەرکەوتنە
ئازایەتی، نەسرەوتنە

شێعر گوڕووی گەرووی پڕە
خاوەن دنەی گەرەوگوڕە

پێلی، دەریای حەماسەیە     تەزووی هەستی بە تاسەیە
شێعر بەرهەمی فرمێسکە     ناڵەی، گۆشت و پێست و ئێسکە
شێعر ناڵەی مل بە هەشن     تۆ نایبینی، دەنا گەشن
شێعر،کۆرپەی دڵی بۆسۆن     بێ لووت نەبی، بە تاموبۆن

کامە شێعر شێعرێکی زەنگ
لە سوێی کۆمەڵ، بە سوێ بە دەنگ
بە دەنگ، بە دەنگ دەنگی کاری
چەکە، چەکە بۆ ڕزگاری

شێعر خەجی هەڵفڕیوان     لە سیپانی کردە میوان
شێعر خەجی بردە سەرێ     کوێنی ڕەشی کردە بەرێ
شێعر دارەبەنی ڕوان     خەجی بە لارەمل نوان
شەوگوردی شێعری تەنی     سیامەند و دارەبەنی
ناسر، ماڵماڵ، خان و دمدم     میرە کوێرە، سوڵتان جمجم
لاس و خەزاڵ، میر سێوەدین     عەرفۆ، چەکۆ، بەکری بێدین
شەم و شەمزین، مەحموودە شۆڕ     سەدانی تر، بێپۆ پسپۆڕ
هێزی شێعر باڵی گرتوون     دەیان ساڵە هەر نەمردوون
شێعر بەڵگەی مێشکی پڕە     نەقورچەیە، گورچووبڕە
شێعر شێعرە سێحر نییە     چەکە لە چەك کەمتر نییە
ناڵەی گەرووی سەر بە هەشە     هەنگی شاخە ئەشکی گەشە
پێغەمبەری وتار شێعرن     مستی، دەمی نەیار شێعرن
کۆمای بە بێ بژار شێعرن     هۆرەی هۆبەو هەوار شێعرن

کامە شێعر شێعرێکی زەنگ
لە سوێ کۆمەڵ، بە سوێ بە دەنگ
بە دەنگ، بە دەنگ، دەنگی کاری
چەکە، چەکە، بۆ ڕزگاری

بڕای گێلی دیمەن هەیاس / بێ‌جێ، بێ‌نێو مێژوو نەناس

خۆگێل مەکە گوێ بگرە بۆم / ئەتۆ من و منیش هەر تۆم

مێشکی شاعیر ئاوێنەیە / نوێنگەی هەراوی وێنەیە

هەر دیمەنێ مەیلی بسێنێ / لەناو شێعرا دەینوێنێ

جیهانی ژین کە دانرا / شاعیر ناوی چرا نرا

شاعیر شەمی شەوەزەنگە / زانایە پوختەیە دەنگە

دەنگی دەردی من و تۆیە / بەرچاوە، ڕایەڵە، پۆیە

چەکی دەمە، دژ تۆقێنە / سێلاوە، خەم هەڵوەرێنە

ژیان شەوە، شاعیر شەمە / شەوی بێ‌شەم دەرد و خەمە

وتەی بەرزی بەرزە وتار / مەکۆی بیروبڕوا «هەژار»

نەوەك هەژار، بەڵکو قەوی / تیشکی هیوا لەسەر زەوی

دەڵێ: کۆمەڵ بەبێ نووسەر / هەر لاشێکە، بێ‌سەروبەر

وتەی «سەعدی شیرازییە» / جێگەی ڕێز و شانازییە

دەڵێ وشتر بە شێعری خۆش / دێتە سەما، سەر و ڕووخۆش

ئەوەی شێعری لە لاچووکن / چووکەی وشترێکی چووکن

فشوفۆڵە، لێنەزانە / کەڵکە و بەربایە زیوانە

شێعر و شاعیر مانگەشەون / خێری خووا هەبێ ئەون

شاعیر مانگی شەوی ڕەشە / بەرز و بەشۆقە، ڕووگەشە

پاشی مردن هەر زیندووە / تام و بۆنی ناو مێژووە

خاوەنی شێعری هەنگێوە / چ «ڕاوچی» یا ڕاوچی شێوە

لە مەرگی شاعیر مەترسێ / دوژمن لە کێڵی دەترسێ

یارەب هەتا زەوی هەبێ / ژینی بەرز و نەوی هەبێ

هەر زیندوو بێ شێعر و شاعیر / دوو ئەستێرەی گەش و زاهیر

١٣٦٤/٦/٢٤ . ترکاشە

## کورتەشین

بەرلەوەی بگرێ ئەجەل بەربینی ژین / بەرلەوەی، شەم بۆم بگێڕێ گەرمەشین
بەرلەوەی بمبەن بەرەو، تاتی شتن / بەرلەوەی بشکێ، زمانی پێگوتن
بەرلەوەی کفنم لەبەروێ، هەڵدروون / بەرلەوەی دووپشکی گڕوێ بم گوروون
بەرلەوەی، بچنێ، ئەجەل مۆخی وتەم / بەرلەوەی بەرپێ‌کەوێ دەست و پتەم
بەرلەوەی بەر بێ لە دەس، داوێنی ژین / بەرلەوەی لاشەم بهاڕێ کورتەشین
بەرلەوەی ئەستوندەکی بشکێ، تەمەن / بەرلەوەی سینەم لە پەلدا دارەبەن
تاکوو شەی ماوە، شەمی شەوگاری ژین / با بناڵێ بووکە شێعری، سەر بەشین
با بڕێژێ خوێ، لەسەر زامی بەسۆ / تێگەیێنێ ڕۆڵەکانی، ڕەنجەڕۆ
بازنەی ئەشکم بدێرێ، نیشتمان / با ببێتە چیمەن و گوڵ ڕێزمان
با زمانی مەش بە کەش بێ، ڕۆژ و ساڵ / پێنەگرتوو، بێنە سەرپێ، بێنە حاڵ
بۆ گوڕوگاڵی وتەم، گوێ بگرە گوێ / کۆنە «ڕاوچی»م و پەیامم نوێیە، نوێ
کۆنەدەردە، دەردی، کۆمەڵ، نوێ نییە / ریشەدارە، بن ڕەگە، سەرتوێ نییە
ریشەبڕ نەکرێ، دەکێشێ ریشەمان / زەرد و بێ‌گوڵ، ڕادەوەستێ تیشەمان
بێ‌سەوادی هۆی، هەرێ نزمی مەیە / تا نەخوێنی، خوێنی دڵ، بۆ تۆ مەیە
بێ‌قەڵەم، خاوەن تەلا بێ، قڵخنی / بەربەلایی و نیوەماوی مرخنی

## خوێندن و ژین

بۆم بڕۆ فێرگە و بدێرە بیر و هۆش / پڕ لە گوڵ کە، وردەوردە مێز و کۆش
خوێندنە هۆناسی دەردی داسەپیو / خوێندنە، پیو و بەزی پشتی بڕژیو
خوێندنە فڕگە و گەوی لاوی بەنێو / خوێندنە مستی دەمی لاسار و دێو
خوێندنە ڕێچاری ژینی بێ‌بڕژیو / خوێندنە خوێنی گەلانی ڕاپەڕیو
خوێندنە تاجی سەری سەرداری گەل / خوێندنە گۆچانی، گۆج و یاری شەل
خوێندنە شابالی بازی بەرزەفڕ / خوێندنە هێز و برستی ڕەندە کوڕ
خوێندنە، نەخش و کری ئاکاری ورد / خوێندنە، بۆ چارە دەردی دەردە کورد

تا نەخوێنی، هەر بە بێ‌خوێنی دەڕۆی — یا نەماوی، یا کە ماوی ڕەنجەڕۆی
گەل نەخۆش و، داتەپیوی خوێندنە — خوێندەواری، هێن کەمە شورت و ونە
شورت و ون بێ‌دەنگ‌وڕەنگ و بایەخە — کورت و قرت و قڕکراو و ئایەخە
عەبرەشە، بێ‌پاشەوار و ڕۆڵەیە — بێ‌بڕستە، تێشکاو و کۆڵەیە
چووکە، پووکە، ژێر چەپۆکە بێ‌بەشە — مۆلەترسە، سایەقورسە، پێ‌ڕەشە
بێ‌قەڵەم، کۆمەڵ بەرەو تۆف و مژە — سواری ئەسپی باووبژ بێ خۆکوژە
بێ‌قەڵەم، لامێژە مێژوو، بێکەسە — لات و پاتە کشکراوە ئەجمەسە
بێ‌قەڵەم بێ، وشکەڵێکی وشکەڕۆی — داوەڵێکی بێ‌گەڤ، بەورە پەڕۆی
بەربەلایە، کۆمەڵی نەخوێندەوار — پێکڵی ژێر کوڵ‌وبارە، کۆڵەوار
تا نەخوێنێ، ڕوو لە ڕێ نێ، ڕێ‌ونی — بێ‌بەشی کووز و کولان و قوچبنی
هەر قەڵەم، قەڵغانی گورزی تۆڵەیە — هەر قەڵەم، ڕۆ بێتە کاری ڕۆڵەیە
هەستە بخوێنە برا، هێشتا زووە — ڕەحمەتی تۆ، بۆ بەرەی داهاتووە
پاشی مردن، پاشەڕۆکی کردەوەت — بەرهەمێکی پایەدارە بۆ نەوەت

## من و کوڵە قەڵەمەکەم

پیرەدارێکی گەلازەردی کەلم — ڕووت و قووت و بێ‌بەشی پۆپ و پەلم
هاکە باسەر، بێ‌سەرما لەشم — لەش بەجێما، بێ‌سەر و کەشمونەشم
ئەی قەڵەم دەستم بە داوێنی بزەت — با بەرەو من بێ، بەرەو من بێ، کزەت
تاکو شەی ماوە، هونەر نۆبەی منە — هەر کەسێ، بێ‌تۆ بژی، خۆی لێ‌ونە
تا کەمێ سرتەی هەیە، سیسرکی دڵ — تا بە قڕ نەچووە، پەلوپۆپی بە گوڵ
هاکە بەستی ڕێگە ژینم، ڕێکەوت — هاکە تیری چڵکنێکم، وێکەوت
هاکە بوومە تێشکاوی، با سەرێ — بوومە قوربانی لە پێناوی سەرێ
تۆم نەنووسی کێ دەزانێ کوێندەریم — بۆ ڕژا ڕەنگی ڕەشی دەردی سەریم
دەی قەڵەم قوربانی، سۆزوسازی تۆم — گوڵچنێکی ڕێڕەو و ڕێبازی تۆم
دەستی من بگرە، بەرەو مێژوو بەلەز — بمخە، ڕیزی کوردەکانی خۆنەگەز

بۆم نەنووسی، کێ دەزانێ کوێ چووم
کامە قەمچی سیرمەسیرمەی کردووم
بۆم بنووسە تا لەسەر خۆیە هەناو
باسی زینداني ڕەش و پێوەند و داو
بۆ (قزڵقەلعە)ی تەروبڕ بوو بە جێم؟
بۆ لەشی خۆشی نەدیوم بوو بە کێم؟
بۆچی ڕۆژی ڕوونی من گۆڕا بە شەو؟
بۆ کرامە داوەڵی، بێخەون و خەو؟
بۆ لە من، بۆتە ملۆزم، تەپلەبۆر؟
چۆنە تێر نابێ، لە لێدانی بە زۆر؟
گا بە قەمچی گا بە دەسبەندی قەپان
گا بە پۆل و گڕ، دەسووتێنێ زمان
زۆر نەفامە، داروەدەستەی پەهلەوی
چۆن نەوی دەکرێ بە قەمچی دڵقەوی؟
چۆن کەوی دەکرێ بە تینی شیشەداخ
باز و بازۆکەی تەلان و شاخ وداخ

**ناترسم**

ناڵەناڵم، کەی لەبەر قەمچی زرە
هەر کوڕێ قەمچی نەدیوە کەی کوڕە!
پیر و پێشینەی گەلی کوردم دەڵێن
بابەتی قوربانییە، بەرخی کەڵێن
من کە ڕۆڵەی هۆزەکوردی بێ لکەم
بابە قوربانی، گەلم بێ خوێنەکەم
خوێنی من بڕژێ، لەسەر ماف و بەشم
زۆر بە بەرزی هەڵفڕیوم، ڕووگەشم
دیارە بێفام و نەزانە، دوژمنم
وادەزانێ کوردەواری، هەر منم
چۆنە، تێناگا، کە کوردی ڕاپەڕیو
بوونە تەرزی، قەفقەفۆکەی سەرپەڕیو
هەر قەفێکی هەڵپسێنی، نالەبار
ئەو قەفی تر، دێتە گوڵ تێر و تەیار
هەر گوڵێکی هەڵوەرێنێ کۆنەدز
ئەو گوڵێ تر، خونچەیە ڕاساوە بز
بەوری شاخی، نەیرەتێنێ بێزەرە
خەوتووە، بێکێشەیە، ماتە، کەرە
بێت و ئازاری درێ وا دێتە شەڕ
شەڕ بسووتێنێ، پەرێزی وشك و تەڕ
من کە «ڕاوچی» چرگەن و لێڕ و چڕم
شاعیرێکی، هەڵبڕاو و دڵپڕم
گەر بە نووکی نێزەوە گەو بێ لەشم
هەر دەڵێم مافم دەوێ، کوردی گەشم
سەرنەوی ناکەم، لەبەر قەمچی بزۆز
چی لە دەس دێ بێمنەت بێ تەپلەبۆز

با منیش بگوژێ لەڕێوە تەپلەزل
هەر لە جێگەم جێگرە بەوری بەمل

## وردەئازاری دیلخانان

دیل و دیلخانەم نەدیبوو، بیستبووم
نووکە قەمچی بۆ دەمێ نەیگەزتبووم

دیتن و بیستن برا، فەرقی فرەس
کەی بە بیستن، تینی ئاگر دێتە دەس؟

تا چزەی قەمچی نەچێژێ، شانوپیل
کەی دەزانێ حالی چۆنە فیلی دیل

باسی مەرگە، بەیتی ئازاری شەوان
دەنگی پۆتین و چەقەی زیندانەوان

کێشەکێشی، کێشی نینۆکی شەوێ
هەر کوڕی کوردێکە، مەردە نانەوێ

ترسی قەمچی، ترسی هەوچی، ترسی دار
ترسی نێڵەی، ژێر نینۆکی کۆڵەوار

کێچ و ئەسپێ، وردەڕشکی، جێ خوروو
دانەخۆرەی ژێرکراس و بن پزوو

بۆر و باریك، و گەڕۆڵ و سیسەڵەن
سیس و پیس و پێستەخۆر و ڕیوەڵەن

هەر یەکەی داخی عەزا بێ، بۆ ئەسیر
چۆن بژی، باشەکوڕی بەندی فەقیر؟

من کە «ڕاوچی» ڕاوەچاوێ بووم لە دێ
لێرە ڕاوی، ڕشك و ئەسپێم پێوەدێ

قامکەشادە و پانەنینۆکی دەسم
بوونە هاوڕێ، بوونە هاوکار و کەسم

جووتەبازی، لەش لە خوێنی هەڵکشاو
بوونە کێشك بۆمنی لا لەشخوراو

دووبەدوو، هەردوو، لە ژینم بەرگرن
کەم هەبوو کێچێ وەجووڵێ نەیگرن

سێ و دوو حەوتەم لەسەر تێپەڕ بووە
لەش نەشۆراوە، پواوە، گەڕ بووە

بێشەم و شەمزاوی، ئازاری، شەوم
جێتەڕ و بێڕاخەر و خەون و خەوم

هەر لە تۆقی سەرمەوە، تا مووچی پێم
چۆڕەچۆڕە لێیدەچۆڕێ، خوێن و کێم

گرژ و کۆم و داتەپیو و نیوەماو
باوەڵی دار و، شەل و ئەژنۆشکاو

هەر بە دارو، دارە دارە و کۆمەکۆم
هەر بە شپڕێوی بەرەو میزگەم دەڕۆم

دوو کەڕەت ڕەسمە بەرەو بۆگەنکە چوون
جورمی شێلاقی هەیە، بێنۆبە چوون

غەیری ئە و ڕەسمە دەبێ بگری پەسیو
یا لەگەڵ دەرپێ بسازی، بۆگەنیو

یەك دەقیقە ڕانەبی سەر كاری میز   تۆسن و جووتەوەشێنە باوەحیز

بێچووە تریاكی تولەی بابۆگەڕن   بێفەڕ و قرتی وەر و پاشەڵ تەڕن

فیتەر و حەیتەزەلام و مۆنومۆڕ   تێنەوەست و گوێنەبیست و سرك‌وتۆڕ

بۆ مولومۆ، دێنە زیندانی شەوان   وردەبەرتیلی دە وێ زیندانەوان

نەیدرێتێ درهەم و دینار و پوول   چی بەسەر دێنێ بەیانی، داروتوول

هەر مەپرسە دیلە كوردی بێسەواد   چی بەسەر دێنێ سەری قەمچی گەواد

هەر مەپرسە حاڵی دیلی بێدراو   چی بەسەر دێنێ قەفی زنجیر و داو

هاكە پڕ بوو كاسەسەبری تێشكاو   نۆبەتۆڵەی هاتەوە دەس لێوەشاو

هاكە بەرخی بن سەوەی بوونە بەران   هاكە خەنجەر بوونەنەشتەر بۆ سەران

هاكە هەستا، كۆمەڵی بڕبڕكراو   هاتەوە تەیری كەژی داگیركراو

هاكە تەور و قۆچەقانی بوونە چەك   دەنگی داوە چیغ بەچیغ بە بێچووە سەگ

هاكە ڕیز بوو داس و تەورداس و كوتەك   فیكەفیك و بەردەفڕكێ بوو بە چەك

هاكە شەو بەندی ترازا، خەنجەری   كوردی دەشتی، كوردی كێو و بەندەری

هاكە كۆكۆ كۆمەڵی كەڵ ڕاپەڕین   نووكەشەق تەپلەی بە شەق هێنا دڕین

هاكە زیندانی شكا، زیندانەوان   بوو بە دیلی دەستی زبری دەشتەوان

هاكە تاجی شابەشاوە بوونە دیل   كەوتە، بەردەستی بزۆزی كۆنەدیل

هاكە سەر بێتاج و تاجی سەركەوت   زەبروزەنگی دەستی تۆڵەی وێكەوت

من كە كوردێكی ئەوینداری چیام   ڕۆژی تۆڵەم دێتە دەستێ، دڵنیام

ڕەوڕەوەی چەرخی سروشتم، قازییە   ژینی كۆمەڵ، تەختەنەردە بازییە

جاری دێت و جاری دەڕوا، نۆبەباو   جاری دیلە، جاری فیلەكورتە لاو

گەر لە دیلخانەی عەجەمدا بوومە دیل   دێلەڕێوی دەمگەزێ، لێم بۆتە فیل

ریشەبڕ نەبووە هومێد و چاوەچاو   روو لە ڕۆژی، تێشكانە بەند و داو

گوندی «سونی» كوردستانی باشوور. ١٣٤٤/٤/٦

### «زاوا و بووك و نووکە نووکی بووکێ»

کوڕێکی قەشمەری کوردی دلاوا
چ خۆشە هەڵکەوێ بکرێ بە زاوا

گراویلکەی[1] بە بووکی بێتە بەردەس
هەوێردێکی حەمایەت بێ، نە بەیدەس

مەکە و لاچۆ، قەلاچۆ بێ لە نێوان
بەدەس بگرێ، مەم و لێوان بە لێوان

لە شەڕگەی دوو لەشی دەمڕووت و لەشڕووت
لە چاوی گوڵ بچۆڕێ ئەشکی یاقووت

بنۆشێ زەمزەمی لێو و دەمی چووك
کەوی کا دوو مەمی سرك و سڵی بووك

لە پێتەختی سپی سینەی سەمەن بۆ
ڕەوایە بەرهەمی چڵپە و مڵۆمۆ

لە مێشێنی پەل و پووز و کەمەردا
هەلە هەرچی وەبەر دا، هاتە نەردا

وەکوو پەروانە، دەمدەم خۆ لە شەم دا
دەس‌وپەنجەی خەیاڵاوی لە مەم دا

وەلاوێنێ بە دەم، دەمدەم دەم و لێو
بچێژێ تام و چێژی بەرهەمی مێو

دەمێ میوانی بەژنی نەیشەکەر بێ
دەمێ مەیخوازی گارسۆنی کەمەر بێ

دەمێ ئاودێری وەرزی پووز و پێ بێ
ئەوەن تەڕدەست و لێزان و بەپێ بێ

بدێرێ نێرگزی هەرگیز نەدێراو
وەدەس خۆ خا دوڕ و گەنجی وەشێراو

بە دەم بگرێ دەم و دوو مەم بە پەنجان
لەخەو ببرێت و بسمێ دوڕ لە گەنجان

پەل‌وپۆ ڕووت و لەش نەرم و پڕوو شل
شکۆ ئەستۆشکاو و جێ شکۆ فل

شەوی قوربانی گیان و ڕشتنی خوێن
ئەوێ گیانی فیدا بێ، خوێنی بەر پێن

لەمە زیاتر چییە زاوا مەبەستی
هەچی بوو هاتە دەستی مژتی گەستی

بەخێر چێ ئەو دەمی دەورانی مەم بوو
لە بەخشینا، لەشی زینێ حەتەم بوو

### نووکەنووکی بووکێ

چ خۆشە نووکەنووکی ئەو دەمی بووك
بە نووکەی تۆسن و تووکی لە دڵ سووك

دەڵێ زاوا بەرمەدە، هەستە بەسمە
شکاندووتە شکۆی هەرچی تەلەسمە

سماوە گەوهەری گەنجی گزوفت
ڕناوە بەرهەمی شەرم و حەیا فت

---

[1] یانی دەزگیرانی خۆی

بەرمـــدە بەربەیانـــە، کورتـــە مـــەودا
سمـــاوە جـــێسمـــی ئاســـك لـــە شـــەو دا

هـەتا کـەی تـیر مـڵومـۆ نـی، لـە خـالآن
بـە دەسـتی تـۆ، کـچێنیم چـوو بـە تـالآن

بـــە حـــاڵی مـــن دە نـــاڵێنیّ، مـــەلاییك
کـــچی دوێنـــێم و ئـــەورو، بوومـــە دایـــك

کەمـەر شـەمزاو و پـشتبەندی کەمەرشـل
ڕنـــاوە بەرهـــەمی بـــەژنی شـــلومـــل

چـناوە شـاگوڵی پـووز و پـەل و پـێم
بـــە بـــەربووکیّ بڵـــیّ، فریـــا کـــەویّ لـــێم

برینـــداری هـــەل و کـــاتی زەمانـــەم
بـــە خـــوێن دێـــراوە، دێـــراوی کـــچانەم

خـول و گێـژ و بـەزیوی جێگـە شـەرگەم
کـچی ڕووسـووری کـورد و خوێنـە بەڵگـەم

لە بێستوونیّ مەپرسە، چی بەسەر هات؟
لـە دەس نێـلّ و قـوڵینگی عیشقی فـەرهاد

ئـــەوەن گوشـــراو و چـــڕژاو[1] و مـــژاوم
مەگـــەر«راوچـــی» بزانـــیّ چـــۆن کـــوژاوم

نەنووسـیّ پـووز و پـیّ، تـا کـویّ قەڵاچـۆن
وەبـاڵی سـەد پـەل و پـووزی لـە ئەسـتۆن

۱۳۷۸/۲/۳ دەروێشان

تەمەنی حەفتا و پێنج بە نەخۆشی دڵەوە لە سەر جیّوبان دەناڵێنم. خەمڕەوێنم خەمە و هـاودەنگم هاوسـەرێکی[2] دڵسۆز و بەسـەرەدەر و بەوەفایـە. خـۆم و بـەختم کـاوەی کـوڕم بێچوویەکی[3] لێرە لیّبەجیّماوە، ڕەش و برش و پانکەڵە. بەڵام سیّ برێکی، بەبڕ و چەنەوێژ و شیرینبێژ و بەمژی و مێشك و بێژە. لە دڵی من بۆتە وێروێرکە و ئاوڕوونکەیەکی خولآداوە، گۆرانیم بۆ دەڵیّ و دەمشێلیّ، جاروباریش دیّ بە بیّبێزووبۆ ڕوومەتە چرچەکانم ماچ دەکا و بە زمانە لاڵوپاڵ و منالآنە دەڵیّ (مام مەلا گیان، مەشەییینم بۆ دەکلی) منیش بە بەهای (دیدی) ئەو منالە سیّ ساڵەیە گۆمیلکێك فرمێسکی منالآنە هەڵدەڕێژم و دەڵێم باشە بە چاوان.

هەر لە سەر ئەو جێگە وبانەی کە هەموو دڵێك لێی نەبان و نامۆیە، ئەو دەفتەرەم لە وێرە و باڕەو بارە و باری، خەیاڵ و کورکە و ورتەی چەن ساڵەی خۆم نووسیوەتەوە.

---

[1] «برژاو»یش هاتووە.

[2] مەلاژنە بەسیّ

[3] ئەفشین

گێرو گەواڵی خەت و چین و چرووکی وشە و شەوگوردی نووسینەکەش چاوی کز و دەستی لەرز و بیٚهەناویم دەخاتە بەرچاو.

بە چاوێکی پڕ لە خواحافیزیەوە نیازم بە دوعای خێر و یادی خێرتانە. وا دوا هەناسەم ئەو ڕاستییە دەدرکێنیٚ کە بیٚژم، سوێندم بە خوای گیان و گیان هەستێن، تا ئێرە لە خوا و خەڵکی هەژار جیا نەبووم و هەر نەمویستووە جیاوە بم. تڵتە و چڵپە و ترس و هێرش، دەرۆستی بیر و بڕیار و باوەڕم نەهاتوون و ڕاوکەی پیٚنەدۆڕاندووم. هەر ئەوەش بوو بە هۆی زیندان و کۆت و ئەشکەنجەی ساواکیان و حەمەڕەزا شای لاوەکی و ئاوەکی.

بە هیوام دۆستان و کوڕە کوردەکانی بەرەی داهاتوومان خۆناس و خووناس و هەژارویست و نیشتماندۆست، داوێنپاك و پتەو و هاودەنگ و بڕوا و بەرابەر بن لە سەر دین و مەرز و ماڤ خۆیان. پێشمەرگەیەکی بەڕەك و بزەکێکی هەنگێوە و سەربازێکی بەچنگ و پل و بەمەچەکە بن. ئیتر بە خوداتان دەسپێرم.

مەلا عەبدولکەریم عەزیز نژاد

(ڕاوچی ساردەکۆسانی)

ڕۆژی ١٣٧٩/١٠/٧ ئەو قەسرە نووسینی تەواو بووە.

بیرەوەری:

وەبیرم دێ ساڵی ٧١ بۆ زانکۆ دەرچووم و ماڵمان لە گوندی ترکاشە بوو. داوای دیاریم لە بابم کرد. فەرموویان: «کوڕم چ نییە تا لێت وەشارم. بەڵام ئەو دەفتەرە چکۆلەیەت دەدەمێ، کۆن و لەمێژینەیە.» لەلای خۆم هێشتمەوە. ماوەیێ دوای کۆچی دوایی ماموستا لەگەڵ کاک ئەمینی گەردیگلانی پێیدا چووینەوە، نە تەنیا کۆن نەبوو، شتی زۆر تازەی تێدا بوو. لە پێشەکی دەفتەرەکەدا ئاوای نووسیبوو:

باوی زەمانە بێئەمانە و بار تۆڵە هەستێنە لە شا و خوونکار

راوچی. ١٣٣٥/٩/٩

دیارە خوالێخۆشبووی بابم لە ڕێکەوتی ٧٩/١٠/٧ی هەتاویدا نیشتەجێی گوندی دەروێشان بووە. ئەودەم دیوانەکەی هێناوەتە کۆتایی. بەڵام وەکوو زۆربەی شاعیران و نووسەرانی کورد، گەلێ جاران گوڵە شێعری دەم بە گوڵ و خونچیلانەی کردۆتە دیاری و لە لای خۆی نەماون. یان وەك سازێکی ناساز هەڵپەسێراون و لە ترسی سیخوڕ و سیرمەدڕ شاردراونەوە و یان سووتاون. ئەم بەشە لە شێعرەکانی پاش مەرگی شاعیر لەسەر نەوار و فیلم هەڵگیراونەوە و کۆ کراونەوە و لە دیوانەکەیا نووسراونەوە. وێڕای سپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی یاریدەیان داوم، هیوادارم بەدڵتان بێت و لە داهاتوودا جوانتر کۆ کرێنەوە.

## خەڕەکی سکاڵا

ڕووتەڵۆکـــە مرۆیـــەك هەڵمـــژراو گیـان لەبەر هێرشـی دژخـوا بـرژاو

شـەقەیاری بـوو لـە شـەقشـەقـتر بـوو بنجـی ژیـنی، لـە هـەقی لـەقتر بـوو

مـۆن و سـەرزبر و بەسـام و شـڕ بـوو ژێرچـەپۆکی دەس و مـستی زڕ بـوو

ڕوو بـە ئاسمـانی سـکاڵا ئەیڕسـت خـەرەکی بـەختی شکاویشی سـست

گـڕ ئـەباری لـە هـەناو و هەسـتی بـێهیـوا مـابوو لـە گۆگـا قەسـتی

دانـە یـاقووتی گـوڵی فرمێـسکی دادەبارێنـەوە دەریـای ئێـسکی

چـارە دەردی بـە دەوا حەسـتەم بـوو بـە نـزا و تـووکی چـیا پڕتـەم بـوو

دەس لـە ژێـر چاڵی چەنە و ئـەژنۆ بوو دڵ بـە ناسـۆر و هەنیـسك و ڕۆ بـوو

بـە هـەوا ئەیوتـەوە: ئـەی یـاران وەرگـەڕێ کۆشـك و قـەڵای زۆرداران

کـورد گـەلێ دەربـەدەر و لێقـەوماو بـێبەشـی مـاف و هـەق و ژیـن دۆڕاو

تـاکوو کـەنگێ هـەر ئـەبێ بێبـەش بـن؟ لەش لە ژێر باری قەلی ڕووڕەش بن؟

تـا بـە کـەی دەربـەدەر و بۆسـۆ بـن؟ داخـی ناپـاڵم و چـەکی سـۆخۆ بـن؟

کـەی لـە ئاسمـانی هیـوا هەڵبەسـتێ؟ یـا لـە نـاو خێڵـی بڕاسـێ دەسـتێ

خڕوەکـا کـوردی تـەرە و ئـاوارە یەکیـەتی بێتـەوە بـیر دووبـارە

١٣٣٥/٩/٩

## دەردی دووری[1]

بـا بـسووتێنێ خـەمی تـۆ شـاپەڕی بـاڵ و بـەدەن

بـا بـە سـێڵاوی سروشـکم چـۆڵ و چـڕ بێتـە چـەمەن

بـا لـە ژێـر شـاڵاوی داخـی تـۆ خـەوم لـێهـەڵبڕێ

بـا بـە ناڵـەی مـن بـسووتێ خـەڵوەتی بەیتولحـەزەن

[1] بە نێوی «دیق و دووری»ش هاتووە. ساڵەکانی بەر لە ١٣٥٣ی هەتاوی کاتێ کاك شێخ تاییری ڕەبەت و هێندێ لە ڕووناکبیران دەگیرێن مامۆستا ڕاوچی لەگەڵ نامەیێ دەیکاتە دیاری و بەرەو ئەو هەرێمەی بەڕێ دەکات.

داخــی دووری تــۆ لــە دڵمــا ئــاگری کردۆتــەوە
شــێتوشــووری کــردووم کــاتێ ئــەبێ بمکاتــە پــەن
تــامی تــاڵی کۆچــی تــۆ، تــاڵی خــەیاڵی داومــێ
تــازە بــێتــۆ تاڵــە باســی بەرهــەمی بــاخی وەتــەن
موددەتێکــە بــێهــەواڵی، حــاڵی واشــڕ کــردووم
بوومــە گــەپجاڕ و گەمــەی کونـد و قــەلی شــاخی ڕەقــەن
شــاڵی تــۆ بــۆ، قەمتــەری زار و دەمــی دێــو و درنــج
ئێــستە تــۆ نــی، پێــوەدەر قــرژاڵ و قربــۆق و ڕەقــەن
تاکوو هاورێم بووی ئەتۆ پێشێلی پێ بوون گەوفرۆش
بــێتــۆ پێــشێلی ئەوانــەم هــەر دوو لاقــم دۆشــەگەن
«راوچــی»یــەکی پــڕ چــەك و وشیاری ئاسۆی یەکیەتی
دوور لــە تــۆ ئێــستاکە نزمــە و بــێچــەك و ڕووت و ڕەبــەن

١٣٥٣/١٢/٢

## دەرمانی خەم

ئافــەرین ئــەی چــاوی پڕشــین و گــرین
خەنجــەری جــەرگی ســرەوت و هــەڵوەرین

شە و خــەیاڵی خاڵی ئەستۆی بووکی دڵ
بــا بتــۆرێنێ لەســەر ئەســتۆ ســەرین

چــاوی ئاشــق گــوڵ نــەکا، ئینــسان نییــە
کــاتی کۆچــی گــوڵ، وە یــا گــوڵ هــەڵوەرین

دوورە پــیر بــوونی، هــەتا چــاوی تــەڕت
خــوێ بپرژێنــە لەســەر زاری بــرین

شــینی شــەو دەرمــانی دەردی ئاشــقە
بــۆ پــسانی خــەم و یــا خــەم ســەربڕین

دەتهــەوێ نیزیکــی گــوڵ بگــری، بــە شــەو
پۆلــەگوڵ ئاشــق بــە زۆنــگ و جێتــەڕین

تــا نــەناڵێنێ بــە شــەو هــەوری ســەما
کامــە گــوڵ دێتــە ســەما یــا هەڵپــەڕین

لێــی حەرامــە ئاشــقی بۆســـۆ لــە دڵ
کــاتی فرمێسکی خــەمی ڕوومــەت سڕین

کـاتێ برژۆڵـی شـەوێ تـەڕ بـێ بەشـین
نێزەیـە، بـۆ جـەرگی داخ و خـەم دڕیـن
«ڕاوچـی»یـا شـەوگاری دووری فرسـەتە
بـێخـەوی بـۆ ڕاوەخـەم یـا خـەو کـڕین

پایزی ١٣٣٧

## دیاری شەوی ڕەش

چ خۆش بوو ئەوشەوەی یارم دڵی سووت
بە مەی بەخشی بەهەشتی لالەشی ڕووت
شـەوی دێـنێ بـە دینـێکم لـە دەسـدا
دڵ و دیـن و حـەیا چـیم بـوو لـە دەسـدا
بـە گـەرمایی لەشـی جـوانێکی ڕووگـوڵ
گـوڵی تۆبـەم وشـك بـوو وەریـە سـەرگڵ
بـە شەوباشـی شـەوی ژوانـێ لـە ژینـا
وەفـا بـاری بـە شـێوەردی ئـەوینا
بـە شـۆڕابەی قـەڤ بـسك و سمـێڵان
گونـا شـین بـوو لەسـەر وەرزی جحـێڵان
بە سروەی بای هەناسەی ئاشقی ڕووت
ڕەوی هـەوری ڕەشـی دەوری دەم و ڕووت
بـە شاباشـی مـەزەی ماچـێ لـە کوڵمـەی
بەلاشـم دا، بەهەشـت و کەوسـەر و مـەی
بـە بـێ گیـانی لـە باوەشـیا کـە خـەوتم
وەکـوو گیـانێ لـەناو لەشـیا سـرەوتم
دەبـا بمـرم، کـەوا تـۆم دی گوڵـەگیان
بە ڕووتـی شەو لە باوەشما وەکوو گیان
کـەوا تـۆم دی بـە تـەنیایی لەسـەر جـێ
جەحەننـەم گـەر جەحەننـەم دێتەسـەر ڕێ
لـە باوەشـتا وەکـووژێ ئـاگری دڵ
جەحەننەم، گـۆڕی ڕەش قـوڕ بـێ و یـا گـڵ

بەهاری ١٣٣٧

«چوارینە»

## ئامۆژگاری سۆفی

سـۆفی چـییە ئـەو دەسـت و قـول و قاچەڕەشـەت

ئـەم ڕیـش و سمێـڵ و چـەنەگە و بـارە هەشـەت

هەسـتە بیـشۆوە بـە مـەی، دڵ و، پاکـەوە بـە

مـەیگێڕی بـەدەس بگـرە هـەتا مـاوە نەشـەت

❁❁❁

مێحرابـێ بـەجیٚهێڵـە لـە مەیخانـە تلـێ

ئـەو وادە کـە شـێخ داویـە پێـت، دوورە چـەلێ

بـەڕماڵ و جبـەی بـدرە لەبـەر پێـی جـوانێ

تۆبـەت بکـە شاباشـی دەم و پـرچ و ملـێ

❁❁❁

بـەو ڕیـش و جبـە و توێـژە ئـەدۆڕێنی دیـن

هاکـە لـە پـڕا زەردەوەبـوو بـەرگی ژیـن

زۆر دوورە جەحەننـەم، بـە جەحەننـەم چ دەبـێ

لێـرە دەمـێ دەم بـاوێ، دەمێکـی شـیرین

❁❁❁

پێـتخۆشـە لـە بەخـشینی خـودا پڕبـەش بـی

خـووگر بـە گونـاحێ بـە، هـەتا ڕووگـەش بـی

هـەر لێـرە لـە مەیخانـە مـەتۆرێ تـاکوو

هـاڵاوی قـەفی پەرچـەم و بـسکی ڕەش بـی

❁❁❁

خـوا چـاوی بـە تـۆ داوە کـە پێـی بڕوانـی

گـەر لێکـی بنێـی شـێت و وڕ و نـازانی

خـویٚچـێژی گونـاحێکی نەچـێژی، گێـژی

بـە جـوانی لـە جـوان بنـۆڕە تـاکوو جـوانی[1]

---

[1] ئاواش هاتووە: تێر گوناح بی بە وشەی عەفوی خودا تەرخانی

## پردی سوڵتان[1]

وا بەهارە و کەژ و سەحرا شینە / ژین لە نێو مێزی ژیان ئاژینە
گوێ چەم و باخ و پەنا بەستێنن / جێ سەرنج و دڵ و گیان ئەستێنن
دەتهەوێ تاوێ لە خەم بێ‌خەم بی / هاودەمی بووکی گوڵووکی چەم بی
روو لە قۆرخێکە[2] لەوێ گوڵچینێ / دوورەخەم، خۆشی بە گوڵ پەرژینێ
گوڵ لە ئە و جێیە بە کۆما ئەڕوێ / کۆڵە نەوسێ کە لەوێ بێ ئەسوێ
کاکە مەم خۆزگە دەبا بە شوانێ / خاتووزین بێری‌یە جا خەم کوانێ؟
کیژ و کوڕ پێکەوە خۆدەنوێنن / بەر و بەرموور و بەرۆ دەپسێنن
لەو بەری دەنگی کەوی خۆشخاڵە / لەم پەڕی سۆز و شنەی شمشاڵە
چۆم و ئاوێ کە لەوێ هەڵئەڕژێ / زات و زیپك و بڕی سواری دەمژێ
پردە بەردێکی لەسەر ئەستۆیە / ئاوی بەحرانی هەتا ئەژنۆیە
ناوی ئەو پردە ئەڵێن سوڵتانە / بار و کۆڵهەڵگری کۆڵبارانە
جێ مەکۆی ڕاو و شەوێنی کوردە / نەخشی نەخشینی هەموو دەس‌کردە
پردە بەردینەیە پێشی گۆمە / کۆلکەزێڕینەیە خێوی چۆمە
تاکوو ئەو پردە لەوێ ڕاوەستێ / بێ‌خەم ئەو نێوەیە دڵ یا هەستێ
خێوی ئەو چۆمەیە خوای لێ ڕازی / رادەماڵێ لە دڵان بێ‌نیازی
تاکوو ئەو پردە هەبێ کوانێ خەم؟ / کێ دەترسێ لە هەڕوگیفی چەم
بەر لە ئەو پردە بە واتەی کوردان / ڕێی لەوێ کەوتووە شاهی مەردان
لەو دەرە و چۆمە کە بازی داوە / شوێنە چەکمێکی لەسەر جێماوە
کوانێ پردێکی وەها ڕازابێ؟ / شوێنە پێی شێری خودای لێ مابێ؟
تات و بەردێ کە لەوێ چەسپاون / شوێنە پێی دوڵدوڵی لێ جێماون

---

[1] – پردێکی مێژوویی‌یە لە نێوان گوندەکانی سلامەت و ساردەکۆساندا ساز کراوە.

[2] – قۆرخ یان قەدەغە: شوێنێکی سەر چۆم و پڕ لە دار و دەوەنە و زۆر چڕە. لە لای سەرووی پردی سوڵتان هەڵکەوتووە.

شوێنە پێی دولدولی ئەو شاسوارە
بۆتە تاجی سەری ئەو ڕووبارە

ئاوی جێکەوشی ئیمامی زامن
بۆ هەموو دەردێ شیفایە و زامن

خاکەلێوە و دەمی ڕاسانی ئاو
هەر لە ئەو جێیە کوڕ و کیژی لاو

دڵ بە بریان و دۆعا دەخوێنن
ئاوی ئەو شوێنە لە خۆ ئەڕشێنن

چا دەڵێن بەستە بە هەستی جوانی
ڕوو بە ئەو پردە دەڵێن گۆرانی

زار و لێو پڕ لە بزە و ئاواتن
دوورەخەم ڕوو لە شنە و داواتن

جا دەڵێن پێکەوە تێکڕا، وێڕا
جوانە ئەو پردە، لە بێشکەی لێڕا

پردی سوڵتان کە بە حەق سوڵتانی!
هەڵسواوی دەسی دڵناسانی

لەش لە نێو ئاوی شەتاودا بەندی!
چارەخوڵقێنی خودای مەڵبەندی!

زۆر لەمێژینە لەوێ وەستاوی
دوورەپیر بوون و بە لاوی ماوی

دژ بە تۆفانە قەڵاندۆشی تۆ!
جێ پەنای مانە بەروکۆشی تۆ!

دەس لە بن باڵی گەلی بێنازی
ڕووی خودات لێبێ ئەوەن ڕووبازی

وشەداڕێژی وشەی کوردی بوو
دژ بە ترسان و شەوارگەی دی بوو

تاقەتێکی بوو لە ئاسۆگی گەل
دڵ بەخەم بوو کز و لاواز و شەل

بەربەرۆچکێکی بەهاری نوێ بوو
بۆ بەرەی پێکز و بێپێ، پێ بوو

هەر لە ئەوجێ بوو کە کوردم ناسی
کوا بە دەم دەکرێ سپاس و باسی

تا بڵێی خاوەنی زیپك و بڕ بوو
لە عەجەم تاکوو بڵێی دڵ پڕ بوو

لە مەرگ ترسی نەبوو ئەو «لاوە»
بێوچان هەڵدەخولا لەو ناوە

هەر لە ئەوڕا بوو لە خەم هەستانم
ڕووبەڕووی دوژمنی گەلوەستانم

هەر لە ئەوڕا بوو خوای لێ ڕازی
ژینەوەی زۆنگ و زنەی شانازی

بنکڵی ژینی وەها بۆ دانان
لاوی کڕ هاتە کڵی خۆڕانان

زەمزەمەی گەرم و بزەی کوردانە
هاموشۆی نیوەشەوی حیزبانە

بوو بە دەنگۆ لە بەشی کوردستان
پۆلە سەگ زانی لە برسا هەستان

ڕەشەکوژ کەوتەوە نێو مەڵبەندان
کەوتە دەسبەندەوە دەستی ڕەندان

تێک شکا زیپک و بڕ و وریایی
بوویە پێشێلی عەجەم جێشایی

چوونە ناو بەندەوە لاوانی زیت
قەسری قاجار و قزەڵقەلعەی خیت

دوور لە تۆ ڕاوچی بەشی پێبڕا بوو
دەس بە دەسبەندەوە بەندی کرابوو

سیوهەشت تا چل و یەك بەندی بوو
ژان و ژاراوی شکەنجەی دیبوو

باسی زیندان و شکەنجەی کاری
یادی چنگوڕکی سەگ و سەگداری

هەر لە بیر ناچێ هەتا نێو گۆڕان
هەر تف و نەحلەتە بۆ گوێ شۆران

چ بڵێ ڕاوچی ئەوەندەی جوانی
بۆ هەموو کاتێ پەنا و ئامانی

خەرمانانی١٣٥١

## ئاشی ئاغای

گیانە بۆم بێژە بە ئاشی ئاغای[1]
هەروەکوو پێشوو بووی، وا ئازای؟

«ڕاوچی» میوانە لەوێ شەوگاران
مفتە هەنگوین و کەرەی بۆ یاران

چەکی هێناوە لەگەڵ دێوجامە
سنگەکەو حازرە بۆ ئەو شامە

وردە میوانی، بەرەی قازی بوون؟
یانە ئاشێری لە سەرما مردوون؟

دێنە لای فایق و ئەحمەد تۆفیق؟
یا عەجەم دێنە پەنای بۆ تاقیق؟

گێلمەگێلمی عەجەمان نەبڕاون؟
ژانی دڵ هێشتە بە دڵ نەشکاون

نۆکەری شایە بە سەرتا دەخوڕێ؟
چۆنی پێخۆشە وەها لێدەخوڕێ؟

یانە لاواز و کڵۆڵ و گەڕ بوون؟
سەرنەوی، بێفەڕ و پاشەڵ تەڕ بوون

جاش و ماش دێنەوە خۆیان دەگرن
سەرنەوی تێدەپەڕن ڕادەبڕن

خاترت زۆرە هەرێمی پردێ
روونە لێم، ڕۆژێ نەمامت بەر دێ

تاکوو ئەو دەم بە خوام ئەسپاردی
لەش کە نەتوانە دڵم بۆ ناردی

---

[1] لە ناو شیو و دۆڵی قەدەغەدا لە مابەینی گوندی سلامەت و ساردەکۆسانا لە ناوچەی گەورکی موکری سەر بە شاری بۆکاندا هەڵکەوتبوو. ئاومالی ڕوو بەخاڵی «پردی سوڵتان»ە. وەك دوو ئەویندار یەکتریان لە ئامێز گرتووە و قۆرغی قەدەغەیان کردۆتە بێشکەی ئەوین و ژوانگەی بووژانەوە و چاوبڕکێنەی ئەویندا‌ران و ئەم قۆرغەیان لە لاوەکی و چاوچنۆکان قەدەغە کردووە.

گیانه‌ پێ هه‌ڵگره‌ لاچۆ لێره‌ — پرده‌ به‌ردینه‌[1] به‌ دڵ بسپێره‌

خه‌رمانانی ٥١

## وه‌ڵامی پووچه‌ڵ بۆ که‌چه‌ڵ

ئه‌وا شین بوو ته‌لان و به‌نده‌ن و کێو — به‌ گوڵ ته‌نرا که‌ژ و لێڕ و چڕ و چێو
له‌سه‌ر بستووی ژیان ڕۆژی هومێدم — بزه‌ی هاوێته‌ سه‌ر سوێگه‌ی ده‌م و لێو
به‌ هۆنراوه‌ی پڕ و زه‌وقی عه‌زیزێك — ژیاوه‌ نه‌وبه‌هاری خۆشی هه‌نگێو
له‌ پێشا با بڵێم چرپه‌ی هه‌واڵوو — درانی سه‌رده‌مه‌ی دووری که‌س و خێو
هه‌تا ئه‌وڕۆکه‌ شێخێکی وه‌کوو تۆ — نه‌بینی ڕاو له‌ شار و گوند وبێ‌کێو
له‌ هه‌ڵدێری ده‌م و پێنووسی لووسوو — به‌ خوڕ ده‌ڕژێ قسه‌ی زل تاکوو به‌رپێو
وه‌ڵامی شێعری تازه‌ی شێخی تازه‌ — له‌ ده‌ستی نایه‌ داوبازی که‌ژوکێو
بڵێم چی چۆن وه‌ڵامی بێ به‌ ده‌مما — وه‌کوو پیاوێکی نێری، نێره‌هه‌نگێو
به‌ڵام نانا وته‌ی به‌رزم قه‌بووڵن — به‌ من چی خاوه‌نی نێره‌ و یا مێو
هه‌واڵت دابوو ڕاوچی بێنه‌ گۆڕی — له‌ گۆڕایه‌ پلان و گۆنگه‌ڵی دێو
میسالی هه‌وهه‌وی سوار و ژنی پیر — وه‌بیرمهاته‌وه‌ خه‌مبار و خه‌مپێو
ترۆتۆپی سمێڵ بادانی چۆمی — گه‌لێ دوورن له‌گه‌ڵ هه‌ڵپه‌ی که‌ژوکێو
که‌چه‌ڵ پووچه‌ڵ ده‌بێت و بۆنی لێدێ — که‌ هه‌ستی بێته‌ مه‌یدانی له‌گه‌ڵ دێو
له‌ شێخ دووره‌ خه‌یاڵی شاهه‌ڵۆیی — ئه‌گه‌ر شێخی بڕۆ بمره‌ به‌بێ نێو
وته‌ی من گه‌وهه‌ره‌ بۆ تۆ به‌ بایه‌خ — که‌ بینووسی به‌ پێنووسی چه‌مه‌ر زێو
له‌ ده‌شتی خۆ مه‌تۆڕێ بۆ چڕوچۆڵ — هه‌را عه‌یبه‌ به‌ پێخواسی به‌بێ شێو
گه‌مه‌ی سواره‌ و گه‌له‌ی گورگه‌ له‌ شاخی — چ ئه‌م بتخا و چ ئه‌و بتخوا به‌بێ نێو
برا بۆ تۆ ئه‌گه‌ر شێخی له‌ ده‌شتی — رمێنی چاتره‌ قه‌ند و قه‌ڵی مێو
هه‌تا به‌عسی له‌ گۆڕا بێ له‌گه‌ڵ شێخ — ئه‌بێ بنوێ شه‌وێ مسکین به‌بێ شێو
له‌ دڵ نه‌گری که‌ ڕاوچی چی له‌ ده‌م هات — وتاری حه‌ق عه‌جووله‌ و دێته‌ سه‌ر لێو

---

[1] مه‌به‌ست پردی سوڵتانه‌

هەوەڵی خاکەلێوەی ساڵی ٨١ی هەتاوی بڕیارم دا بۆ پشوودان و بووژانەوە و هەڵکردنی ئاڵای ئاوری نەورۆز بەرەو سروشتی شێوە بەهەشتی شاری سەردەشت وەڕێ کەوم. بارگە و بنەم تێکنا و خۆم و بەختم. چەن شەوێ لە شارۆکەی ڕەبەت گیرسامەوە. وڵاتێکی سەربەرز و سەرسەوز و پڕ لە هەڵدێر و ئاو و کان و کانییە.
بە یارمەتی خەڵکی میوانگری ئەو هەرێمە بەتایبەت کاک سەید تاییری ڕەبەت چەن شیعر و وێنەی جوان و قسەی خۆشم وەدەس کەوتنەوە. سەرچاوەکەیان بۆ ساڵەکانی ١٣٤٠ دەگەڕایەوە. وا لێرەدا نووسراونەوە. (کاوەی ڕاوچی)

**ژینی پڕ لە ژانی دنیا**

ژینی دنیا چیە تا پێی خۆش بی
دڵ بە خەم بگری وەیا ڕووگەش بی

هەر ئەبێ بمری لە دنیا دەرچی
خاوەنی کۆشك و سەرا یا هەرچی

ژینی دنیا خەمە بایی ناوێ
شیرنایی هەڵێکە و تاڵی تاوێ

کاتێ بارامە، لە ڕاوی گۆڕان
کاتێ گۆڕن جێ سەری بڕ زۆران

کاتێ سەرخۆشە، بە خۆشی ئاهەنگ
کاتێ لەش بۆشە لە ناو گۆڕی تەنگ

کاتێ دڵ مەستە بە هەستی نازێ
کاتێ لەش وشکە لە سەر ڕێبازێ

بیر وەکە تاوێ، چها گیان و لەش
پەرچەمی خاو و کەزی شۆڕ و ڕەش

ڕاکشاون بەخەم و ناڕازی
چوونە ناو گۆڕی تەڕی بێنازی

ئەو گوڵانەی کە لە سەر گۆڕانن
ڕەنگی خوێنی گەلی ژین دۆڕانن

کێ ئەزیزێکی لە ژێر گڵدایە
نووکە تیرێکی لە ناو دڵدایە

قەت لە بیر ناچێ هەتا مابێ لەش
دیق و دووی مەرگی ڕەفیقی ڕووگەش

## شینی مەجید خانی نەمشیر و بەرەو گۆڕستان

لـێمگـەڕێ لێـرە وچـانێ بگـرم / سـەر بـە داوێـنی خـەیاڵ بگـرم
یـان وچانێ لـە سـەر ئـەم گڵکۆیـە / گڵـی دەرمانـە هەنیـسك و ڕۆیـە
ئێـرە گڵکۆیەکـە سمکـۆی تێـدا / بارەگایێکـە کەسـی تـۆی تێـدا
لێـرە نێـژراوە مەجیـدی وریـا / پێـشڕەوی کـاتی هومێـد و بریـا
لێـرەدا لاوی دلێـر و زانـا / چـاوی یـەکجاری لـە سـەر یـەك دانا
بوو بە ڕێبواری ڕچەی بێنازی / قارەمـانێ بـوو خـوای لـێ ڕازی
گـوڵ ببـارێ لەسـەر ئـەو گڵکۆتـە / جـوان و خـاتر تـەڕی مـاڵی خۆتـە
بـۆ دەمـی وەفـاتی ئـەو لێزانـە / شین و گریانی «شەوی خەم»[١] جوانە

## فرمێسك و دیاری شینگایی

ئـەی بـرای کـوردی لـە ژیـن تـۆراوم / بگـرە دیـاری دڵـی هـەڵبڕژاوم
بگـرە ئـاقیقی گـوڵی فرمێـسکم / بـا بـسووتێ لـەش و گیـان و ئێـسکم
بگـرە دیـاری دەسـی دڵسـووتاوان / دانـە فرمێـسکی بەخـەم شـێواوان
لێگـەڕێ چـاوی لـە خـەم تـۆراوم / هـەڵبپـڕژێنێ دڵـۆی زووخـاوم
بـا ببـزوێنێ کـزەم جـارێکی / وردە کـاکۆڵی سـەری سـەردارێکی
بـا ببـارێنێ زنـە و زۆنگـی چـاو / تـەڕبکا قـەبری ڕەفیقێکـی لاو
بـەڵکوو بـڕوێنێ گـوڵ و شـینایی / پۆلـە فرمێـسکی شـەوی شـینگایی
گـوڵ لـە سـەر قـەبری جحێـڵ و لاوێ / تـەڕ وەبـێ باشـە لـە ئـاوی چـاوێ
سـوێند بـە تـۆ تاقـە گـوڵی بـابردوو / تـا بمـێنێ لـەش و گیـانم هـەر دوو
شـەمی شـینگایی شـەوت بگـڕێنم / خـوێ لەسـەر زامـی خـەمت بـڕژێنم
بۆچـی نـەگریم و نـەبارێنم بـۆت / دڵ شـەقی بـردۆ لەبـەر سـۆق و سـۆت

---

[١] – شەبی خەم بە پێی ئەبجەد ساڵی ١٣٥٢ یانی ساڵی کۆچی مەجیدخانی نەمشیر دێتەوە.

دڵ بە بێ تۆ دانەسەکنێ تاوێ
با لە خەم لادەم و ڕۆژ بەس کەم
بیر نەبووریتەوە، هیوات ڕوون بێ

با ببارێنێ کوڵۆی خوێناوێ
شینی سەرداری لە سەرخۆ کەم کەم
کۆڵە خەم داکەوێ تەرت و توون بێ

## مەرگی کچە کوردێك

دڵی شێت بەسیە ماتی و دڵپڕی
دەبا دووبەدوو ڕوو لە چاکی بین
بەرەو گۆڕستان بنێین هەنگاوێ
ئێرە سی چاك و چاکی دڵ چاکن
خێڵاتی لێرە لە گڵ بەزیون
بێ دڵان لێرە خاوەنی دڵن
دەبا من و تۆ بەرەو ڕووی چاکی
لەسای وارشی چل دانەوەن بین
لە ناو ئەم گۆڕە داماوێ هەیە
جوانەمەرگێکە و بێواز کەوتووە
لە بان گڵکۆکەی دوو بە دوو تاوێ
بزانین دڵی بێ دڵار، چۆنە

زەردی و بێدەنگی بە خەمی کڕی
پەپوولەی چرای دڵ ڕووناکی بین
بۆ جوانە مەرگێ بگێڕین چاوێ
لە هەموو تەڵە و پلانێ تاکن
بێناز و زەرد و شڕ و تەزیون
ڕوو لە ڕاستین و لە خواری سڵن
وێڕا دڵگرین، بە داوێن پاکی
دەس بە داوێنی دار و دەوەن بین
لەشی بێگەرد و سووتاوێ هەیە
کچێکی کوردە و لەناز کەوتووە
وچانێ بدەین بگێڕین چاوێ
ڕەنگوڕووی گوڵی لە بن خار چۆنە

## دوانی جوانەمەرگێك

سڵاو فریشتەی لە دونیا فڕیو
هەوێردەی نەرمی لە نشێو کەوتوو
نموونەی خەروار ڕەنگی بێڕەنگی
لە سەر ڕایەخ و سەرینی بەردی
دوو چاوی ڕەشت بە خەو چەسپاون

پەپوولەی سەربال وەسری تەزیو
لە ناو باوەشی بێبەشی خەوتوو
میوانی گۆڕی ماتی و بێدەنگی
شەکەت و ماندوو شکاوی دەردی
یاخۆ لە خۆشی ژیان تۆراون

کـوا تاسـە دەشـکێن وەڕەزی شـەوت — کێیـە هاوبەشـی باوەشـی خـەوت
کـام لـەش هاولەشـی لاشـەی تـەزیوت — سـڕ بـێ، وەك گۆنـای سـەرما گـەزیوت
کامـە دڵ هـاودڵ دڵـی بۆسـۆتە — کامـە دەم هـاودەم هـۆدەی گڵکۆتـە
کـام کێـو بـە تـەم و لەخـەم دڵپـڕە — وەکـوو گڵکۆکـەت مەکۆگـەی گـڕە
هـەڵبڕە چـاوێ بڕوانـە لێـرە — شـین کاڵـەی گـۆڕت بـە شـین زەنـوێرە
هـەر گـوڵێ لـە سـەر گـۆڕت ڕواوە — بـە ئـاوی چـاوێ پـاراو کـراوە

## وڵامی جوانەمەرگەکە

ئێمـە میـوانی نـاو دڵـی گڵـین — هیـوا بـە ڕوحمـی خـوای خـاوەن دڵـین
دایـم بـە ڕەنگـی بێـدەنگی ڕەنگـین — ئەسـیری گـڵ و سـڵین،دڵ تـەنگین
ئێمـە کـوژراوی گـژەی ئـەوینین — پـەڕ وبـاڵ و دڵ سـووتاوین، دیـنین
ئێمـە گڵـووکی بـاوان نـەدیوین — بـێ بـەهار و گـوڵ، گـەڵا وەریـوین
گـەزیوی گـەڕی شـەختەی بـێدڵـین — تـەزیو و تـەڕی تـەڕایی گڵـین
بێبەشین لـە بـەش، لـە ڕەشی خـەوتوو — لارە مـل، بـێکـەس، لـە گەشـی کـەوتوو
پڕخـەمی، دژی، ڕووتـەڵی، شـڕی — بـێنـازی، کـڕی، وەڕەزی، گـڕی
ئەوانـە گـشتی بـۆ ئێمـە بەشـن — قـوڕ و چـێو و گـڵ ڕایـەخی لەشـن
یاسـاخە لێمـان شـنە و دڵتـەڕی — بەلاشـە بۆمـان ڕووتـی و جـێ تـەڕی
سـەر و پـێ پـەتی، بـێجـل و بـەرگین — میـوانی کـۆخی پـەڵۆخی مـەرگین
بـێبـزە و بێـدەنگ، دزێـوین، زەردیـن — لـەش لـە نـاو دڵـی بـێ دڵـی بـەردین
بـەختمان نـەختێ لـە شـەو ڕەشتر بـوو — ڕەشـی، لـە بـەشمان گـەلێ گەشـتر بـوو
ئـیتر خـواو لەگـەڵ، مەوەسـتن لێـرە — لـە بیرتـان نەچـێ، ئـەوەی گوێـدێرە
لـە نـاو دڵـی گـڵ، هیـوایێ نییـە — لـە پـاکی بـەدەر، پـەنایێ نییـە

بەهاری ١٣٥٣

### بۆ وێنەکەم (١)

شێوەردی تەمەن چها بێ‌کەش بوو
بەرهەمی شیوەن، فرمێسکی گەش بوو
تۆزە هەستێ کە هەبوو پێی هەستم
بای ئەجەل ڕایدا لە وەندی کەش بوو
لەشی سووتاوم لە چیای دڵداریم
دەستەچیلەی گڕ بێ ماف و بەش بوو
رووسووری ئەوەم لە سوێی گەل سووتا
کێ لە گەل ڕۆیە دەرێ ڕووی ڕەش بوو

### بۆ وێنەکەم (٢)

دەسکەنەی مەرگە گوڵی شەمزاوم
پاشەڕۆکی لەشە وێنەی ماوم
لە سەر ئەم خاکە، لە ژین بێبەش بووم
ئێستێ بروانە کە خاك و ئاوم
بەر لە ئێستا، کە کەمەندم دەپساند
ئێستە وێنێکی بە بەن بەستراوم
وەلێ دڵخۆشی ئەوەم بۆ گەل بوو
مەتەڵی ژین و دنەی وتراوم
هەبێ پرسیاری لە ناو ئەو گۆڕەش
هەر دەڵێم کوردی زوڵم لێکراوم

١٣٧٠/١١/٢ . بۆکان . مەتەبی ددانسازی

### گۆڕ

بە سەر گۆڕی عەزیزمدا دەنۆڕم
لە ئەورا تێگەیشتم ڕوو لە گۆڕم
لە ناو گۆڕی شەپۆڕ و شینی ئێوەم
شەپۆڕی من دەگێڕێ شینی کۆڕم
کە ئێستا چۆڕەچۆڕەی مەی لە دەم دام
سەرێکی‌تر لە گۆڕا هەڵدەچۆڕم
کە ئەوڕۆ داو و تۆڕم، تۆڕی تێدان
سبەینێ پێ بە داو و مل بە تۆڕم
بە فۆرم و پۆزی ئەوڕۆکە مەگۆڕێ
لە ناو گۆڕا نە پۆزێکە و نە فۆڕم
ئەگەر باشی و بە باشی بچیە بن گڵ
بڵێ خاوەن خەزاڵ و لاسەشۆڕم

سێ چاکانی ساردەکۆسان . ١٣٦٠/٥/٢
نەخۆشخانەی شاری سابلاغ . ٧٩/٦/٢٤

### خوشکە سیما[1] و خوشکە ڕێزان[2]

خوشکە سیمای قژنۆکە
بچکۆلە و بیلبیلۆکە
زووتر هەستە بەپێ بە
پێڕۆکە بە، پێڕۆکە
دەستی ڕێزانێ بگرە
چەپکە گوڵان وەکۆکە
لەبەر دەمم هەڵپەڕن
خەمانم بۆ پەرۆکە

### خوشکە سنوور[٤]

سەر سنووری گرتووە جوانی سنووور
ئاخ چ شۆخ و مەستی نازە کوڵمەسوور
چاوی بازە، بازە ڕاوێکە جەسوور
خوایە ئەو چاوە لە چاوی بەد بە دوور

### خوشکە سێبەر[٥]

وەك بەهاری بێهەتاو و سێبەرم
پەلشکاو و بێگوڵ و بەرگ و بەرم
خوشکە سێبەر دەی بەرەو من بادەوە
دووری تۆیە شیوەنی سەرتاسەرم

### خوشکە سروە[٦]

سروە هەستە ڕامەوەستە ڕێکەوە
دەستی گوڵ بگرە بەرەو من پێکەوە
چاوەڕێتە شاعیری ئەستۆ شکاو
هەستە بۆی وە سوێ کەوە بۆی تێکەوە

### خوشکە سوعدا[٢]

خوشکە سوعدا ئەی کچی کوردی کلۆڵ
ئەی تەشی ڕێسی هەواری چۆڵ و هۆڵ
مزدە بێ سا کە بەهاروو هاتەوە
گۆڕ دەبێ ئەودەم گەڕی سەرما و سەهۆڵ

---

[1] . ژمارە ٢ تا ٦: ئەو منالانە نەوەی مامۆستا «راوچی»ن
[2] – کچی پوورەمێری گۆلی‌یە و خوشکی زاواکەی مامۆستا «راوچی»یە.

کاتی بیر و بانەمەڕ دێ ئەو دەمێ
چۆڵوهۆڵە کێو و کەژ بێ شوان و بیر
ڕۆژی ڕوونی تۆ بەرەو چاوە گوڵم
ڕۆژی شایی تۆ لەوێ بم بۆت دەڵێم
دەستی نەرمی دۆیێ دەگرم (دوو لە تۆ)

هەر لە تۆ جوانە بەر و توربێن و کوڵ
بەربەیانی ڕوونە، کیژی توند و تۆڵ
هاکە لێیدا بەزمی شایی تۆ دەهۆڵ
شیعری خرخاڵ و خڕەی قۆڵبەندی قۆڵ
دەیڕەتێنم ژانی جەستەی ناو سەهۆڵ

## راوچی ئەوین

بە سەر چووم و سەرم دانا لە بەر پێی
نەهاتیم بوو، بەسەرهاتی نەپرسیم
هەناسەم ڕوومەتی گەزت و بە سرتە
گوتی ناگاتە خەرمانەی گوڵی ڕووم
گوتم گیانم ڕەها کە با ڕەها بم
گوتم دووریتە هۆی هێڵی و کوڵۆڵیم
ئەوەن گریام و شینم خستە کێوان
بەزەی هاتێ و دەمی دامێ دەمێکی

کەچی نەیکوت چیە بۆچی بە سەر دێی
هەچەند فرمێسکی ڕوونم ڕشتە بەر پێی
گوتم کەنگێ دەپشکوێی و وەبەر دێی؟
دەمت تاکوو دەمێ نەکولێ و نەبرژێی
گوتی دیلی منە گیانت لە هەر جێی
گوتی نیزیک وە بێ، کالێ، دەسووتێی
ئەوەن ئەستۆکەچیم دانا لە بەر پێی
گوتی «راوچی» ئەوینی با نەڕەنجێی

## راوەشێعر

خۆم و هەستی ڕووت و قووتم
لەگەڵ هێزی بابردەڵەم
بە تاریکی شەوەزەنگێ
چووومە ڕاوی پەری شێعرێ
بە یارمەتی دەستی هەستم
خزامە سەنگەری هەستم
وەکوو شەمێ لە خەو بڕام

لەگەڵ ئەسرینی یاقووتم
وێڕای سێحری زاری قەڵەم
پەنامەکی بە بێدەنگێ
جوانتر لە لاچاوی سێحرێ
دەستم پڕ کەم لە مەبەستم
هەستێ کرتر لە هەڵبەستم
تا بەربەیانی گەش گڕام

لە چڕگەنی بیرۆچکەما — لە ناو دەریای مەندی خەما
چوومە سەر ترۆپکی بیران — داوم دانا وەکوو ژیران
ویستم بگرم هۆنراوەیێ — بنکەی گەرمی ئاژاوەیێ
شێعرێکی تەڕ کێشی ژین بێ — شایی مەم و یایی زین بێ
ناسك وەکوو پەڕێ گوڵ بێ — تارای سووری خوێنی دڵ بێ
لە ناو گەرووی مەبەستێکا — لە چوارچێوەی هەڵبەستێکا
بیکەمە ئاهەنگێکی جوان — بیدەمە دەم بلوێری شوان
بۆمان لێدا هەموو شەوێ — هەوای شەو و نیوەشەوێ
تێی تووڕێنێ لە سەر بەردان — نەزمی قەر و گوڵەزەردان
وەلاوێنن کەژ و کۆیان — ڕاپەڕێنێ کوڵ و دۆیان
بەلام چ بکەم بە هەستی خاو — بۆم نەگیرا هۆنراوەی لاو
تێگەیشتم کە شێعری شەنگ — گیانی گەشی لەشی بە دەنگ
«ڕاوچی» دەوێ دەبێ کوڕ بێ — هەنگێوەبێ، گوڕچووبڕ بێ
دەنا هەستی کز و چرووك — بۆی ناگیرێ هۆنراوی بووك

٦٨/١١/٢٥ . سەدراباد

## ژان و ژیان

**مامۆستا محەمەدی نووری**[1]

گەلای سەوز و زومەڕد هەردوو ڕەنگین
بەلان پێ‌شێلە ئەویان، ئەو نگینە

گڕی عیشق و گوڕی دڵ هەردوو سەرکێش
بەلان ئەویان سڕە و ئەویان بەتینە

غەم و خۆشی لە فرمێسکا دەڕەخسێن
بەلان ئەویان لە شادی ئەم لە شینە

هەوای زەنوێر نەوای بلوێر لەجۆشن
بەلان یەکیان حەزە و یەکیان حەزینە

شەم و پەروانە بۆ یەکتر دەسووتێن
بەلان ئەویان مەمە و ئەو خاتووزینە

چڵوگوڵ هەردوو هاوڕازن لە باغا
بەلان ئەو بۆ چەوەڵ ئەم بۆ چنینە

هەتا دونیا هەیە و دەعوای شەڕ و خێر
بەشی هێندێکی ژانە و هێندێ ژینە

## یای زین

**(راوچی)**

بەڵێ دوو کەس وەکوو یەك دێنە ڕاوێژ
یەکێ مەستی سەفایە، یەك سەفانێژ

بەڵێ دوو سۆزی شادی دێنە بن گوێ
یەکێ سۆزی ئەوینە، یەك جەفابێژ

دوو دڵ توونی ئەوینی دینی ڕوونن
یەکی دینی دەوێ، یەك دان و کاوێژ

گوڵ و بولبول لەمێژە لێك دەنووڕن
یەکێ مۆرەی فەڕە و یەکیان فڕئاوێژ

دوو لێوی پڕ لە داوا دێنە مژتن
بەلاڕێژە یەك و یەکیان بەلاچێژ

نەچی بێژی سروشتە بۆی بڕیون
کە نازانی بە زانینە کول و تێژ

گوتوویە «یای زینی» زیت و وریا
کەلووی وردی دەوێ زیزانە دابێژ

بەشی جوولانە «راوچی» ڕاوی چۆمی
بەشی تەنبەڵ نە مێژوکە نە لامێژ

ترکاشە . ٧٤/١١/٢٧

---

[1] - لە شێعرێکی فارسییەوە وەرگێڕدراوە

**بە بۆنەی کۆچی شاعیری نەمر مامۆستا هێمن**[1]

بە کوردی پێت دەڵێم هۆنەر وەکوو نەی بێ‌جەرگ مەگری

لە سەر گۆڕی شەهیدی کوردەواری بۆ مەرگ مەگری

ئەمن سەروێکی مۆفەڕکی بەیانی کۆمەڵی کوردم

لە وەرزی من وەرە بچنە گوڵێ بۆ مۆفەڕک مەگری

دەسی شیوەن لە سەر خاڵ و خەتی من دامەنێ، ڕووتم

ئەوینداری گەلێکی ڕووتەڵۆکم بۆ بەرگ مەگری

هونەرمەندی نیە شیوەن لە سەر گۆڕی هونەرمەندێ

هونەر دەرکی قوفڵ نەدراوە، هۆنەر، بۆ دەرک مەگری

کە هات و هێمنێ نێزەی ئەجەل جەرگی سمی، ڕۆیی

ورەت بێ، بۆ دەمی تیغ و تەبەرزین و زەرگ مەگری

تەشی مێژوو، گەلێکی ڕستووە کورگی هونەرمەندی

لەمەولاوەش دەڕێسێ بۆ من و تۆ وا کورگ مەگری

لە قاچی ڕووتەڵۆکێکی گەلی ڕووتت وەکە درکێ

وەکوو کوڵ و کەل و گێژێ لەبەر چەقڵ و درک مەگری

لە «فرمێسکی ڕنوو»ی هێمن، هەڵێنجە قومقومەی زەوقت

وەکوو کوندێکی ساویلکە، بە هۆهۆ پڕ قوڕگ مەگری

لە شینگێڕی شەهیدی هۆزەکەو پرسن، دەڵێ چی دی

لە سەر سینەی سپی «سروە»م، لەمەو لا دڵ سرک مەگری

قەزا، خڕکەی لە سەر زیت و زرینگ و زیرەکی داوە

لە «راوچی» وەرگرە دەرسێ لەبەر بەرد و خڕک مەگری

[1] لە لایەن مامۆستا ئەمینی گەردیگلانییەوە بە دەستم گەیشتووە.

## نیوەژوان

تکەی تەبعم، فڕەی دانا لە سەر باڵ و پەڕی هەستم

بزەی هاویشتە سەر لێوی بزۆزی شێعر و هەڵبەستم

پەریزادەی خەیاڵی خۆم لە خەودا هاتە ئامێزم

دەم و لێوی لە سەر لێوم ڕەوەك بوو جێ بەجێ گەستم

بە داوی لێو و دەم گیرا دەم و مەم هاتە نێو هەستم

مەکە و شەرم و حەیا تۆرا لە بێ شەرمی دەم و دەستم

خەتی دانا تەزووی ئەشکی گەشی دیسا لە سەر کوڵمی

بە کورکەی نازەوە باریٚ جنێوی دا بە هەڵوەستم

بە پەنجەی گۆشتنی ئەوشۆ وەها ڕاسا کە پێم وابوو

کە نابووریٚ لە تاوانی، دەس و گازی بە ئەنقەستم

شەمامەی مەمکی کاڵم بۆ تکا هێنا بەرەو پیری

گوتم پیرێکی خەرفاوم بە مەی تاڵی ئەوین مەستم

دەمی دامیٚ دەمی خۆش بیٚ، بە مەرجێکی نەشێوێنیٚ

سکەی گەنجی کەمەر دیسا، دەمی پیس و شەڕی هەستم

هەچی بوو کەم نەبوو بۆ من کە ئەوشۆ تا بەیانی ڕوون

لە مەیدانی تەڕی تەبعا لە گۆڕم نا خەمی خەستم

لە ژێر پێی پیری ئیرشادم دەسی تاسە و دەمی تۆبەم

بە داوی پەرچەمی خاو و بە تاڵی بسکی ڕەش بەستم

بە شاباشی مەزەی ماچیٚ لە هەش ڕیش و سمێڵی بۆز

شکوور، شێخم لە خۆمانە لەمەولاوە چ دەربەستم

هەتا دەست و دەمم لێو و دەمی بگریٚ، قەرارم بیٚ

وەکوو «ڕاوچی» نەڵێم پیر و تەمەن حەفتایە یا شەستم

ترکاشە. ٧٢/٦/٥

بە پێی بیرەوەری مامۆستا ڕاوچی و شێعرەکانی، بە تایبەت شێعری پردی سوڵتان، ساڵی ٣٨ی هەتاوی دەگیرێ و دەخرێتە زیندان و ساڵی ٤١ هەتاوی دێتە دەرێ و مشت ڕ مڕ و مڵ و مۆی بزگوڕەکانی گەل دەیخەنەوە بەر گەمارۆی خۆیان. ماڵ و منداڵ هەڵدەگرێ و بەرەو ئێراق دەڕوا و ماوەی چەن ساڵێ وەك مامۆستایەك و بەرپرسێكی سیاسی لە گوندی شینێ[1] دەمێنێتەوە. وا دیارە لەگەڵ بارزانییەکان وێکڕا ژیاون. چ پێ ناچێ لێیان دەشێوێ. مامۆستا لە «سەنگەسەر» دەکەوێتە گێژاوی خەیاڵی «ساردەکۆسان» و لەگەڵی دەدوێ و دەڵێ:

## گوندی ساردەکۆسان و ماڵئاوایی

لێمگەڕێ گیانە کەمێتر بدوێم — خوێ بکەم، کوێرە خەمی کۆن و نوێم

خەم خەمێنی خەمە، لە وڵاتی دڵ — کۆچ و کۆچبارە لە جێی بارگەی گوڵ

کۆچ و بار،باری لە ماڵ ئاوایە — دڵەکەم تەنگە، بە دوویدا نایە

لان و هێلانی لە دایك بوونی — کان و کانیاو و دەروونی ڕوونی

بنەمای شێعر و هەواری قەستم — چۆن بە جێ بێڵێ خەیاڵی هەستم

ئەی هەرێمی گوڵ و ڕوو پڕخاڵان — ئەی بەهەشتی نەشە بۆ چاوکاڵان

دوور لە تۆ، پڕ بە دڵم نەژیاوم — بۆت دەبارێنێ هەتا هەم چاوم

گیانە جوانیت کە نەبا مردوو بووم — هونەری تۆیە کە پێگرتوو بووم

دەوروبەر چۆم و بڕ و بەستێنت — تەرت و لاپاڵ و چڕ و بژوێنت

جێهەوار و هەرەس و جێی مۆڵت — کەنەك و چڕگەن و شیو و دۆڵت

چۆم و کانیاوی سپی و زێوینت — بۆنی بیژان و بزەی سۆڵینت

بنگەڕ و جێگەڕی گوڕ و دەشتت — جێگە دیلان و پیاسە و گەشتت

جێی گەمە و گۆنگەڵ و جێی تۆپێنت — جێی تەقەی شێرە کوڕی خۆنوێنت

جێی مەلە و شیو و کوڵی دڵ نەرمت — جێی گزەی نیوەشەوی بێ شەرمت

---

[1] – گوندی شینێ: لە مابەینی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشووردایە. دەڵێن: ئەم گوندە زۆر خۆڕاگرە و تەنیا جارێکیش نەیانهێشتووە بکەوێتە بەر پەلاماری دوژمن.

جێ قنەی خاسەکەو و تەڕلانت　　بیر و سەربێری دەم و دوو جوانت
لە هەمووی بیرەوەریم هەڵدەقوڵێ　　چۆن دەڵێ گیانە مەناڵێ مەکوڵێ

سەنگەسەری ئێراق. ١٣٤٣/٣/٤

**تاکەبەیت**

دەردی دووری هێندە تاڵە چەشتنی　　زۆری وەك من دەردە دووری کوشتنی

## گوڵی شادی

کەژی سەوز و سوور و شینم　　رووگەی گوڕ و گاڵ و شینم
نەخشی خوای لەسەر زەوی　　ئەوەی لێی دەگەڕێم هەوی

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

ئەتۆی هەوێنی هەڵبەستم　　رەنگی لەسەر کری هەستم
بێمەی بە یادی تۆ مەستم　　خۆشەویستی دەتپەرستم

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

خەو ناتوانێ چاوبەستم بێ　　جەردەی بیر و هەڵبەستم بێ
تا ئەو جێگەی لە دەستم بێ　　خورەی هەڵدێری هەستم بێ

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

مێژووی تاڵی پڕ لە خەمم　　شەوی ڕەشی دوورەشەمم
بەستە و بەندی «هەر تۆم دەوێ»　　ناتۆرێنێ لەسەر دەمم

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

هەرچەن دووری لێم نەدیوی چاوی هیوام تێبڕیوی
بە هیوام ڕۆژی سەربەستی لێم وەرگری، خۆشەویستی

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

هەرچەن وشک و بابردەڵەم تووشی شەوی ڕەشی هەڵەم
بێهەناوی باوی کەڵەم هێشتا ئەڵێ زار و قەڵەم

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

ڕاوچی تەلان و تەرت و سوێم غونچەی نەدێراوم لە دێم
شەرت و مەرجم تێکناشکێ لەت لەت کرێم بۆ کورد دەدوێم[١]

دەتپەرستم گوڵی شادیم
قەڵای هیوا بۆ ئازادیم

٥٧/٩/٥. گوندی سارکێ

---

١ - لە نوسخەیەکدا ئاوا هاتووە: لەت لەت کرێم بۆ گوڵ (تۆ) دەدوێم

## راوی خەج

دڵشێتە لەژێر پێتەوە بێگیانە خەجێ          گیانی بە شەمی ڕووتەوە داغانە خەجی

نیازی یەکەمی نەوسنی لاوانە خەجی          گریاوە گوروی باخەڵی پاوانە خەجی

ماچی دەمی تۆ مەڵحەم و هەتوانە خەجێ

کام نەخشە وەکو خاڵی دەموچاوی خەجێ          کام نێزە وەکوو پەرچەمی ڕاساوی خەجێ

کام گوڵ شلکە وەك لەشی نازاوی خەجێ          کام بە ژنە وەکوو بەژنی شل و داوی خەجێ

مانگێکی بە شەوقی شەوی لاوانە خەجێ

ئاسکێکی سڵی ماڵییە مەڕدۆشە خەجی          دەم پڕ لە بزە و زەردەخەنەی خۆشە خەجێ

نەرمۆڵە مەلی توکنی دەنگخۆشە خەجێ          ئارامی دڵ و باوەش و نێوکۆشە خەجێ

شەوچەلەی نیوەشەوی بەزمی جحێلانە خەجێ

ئەو دیمەنی بەرچاو و خوواداوی خەجێ          ئەو ناز و بزە و شێوە کلەی چاوی خەجێ

ئەو لارولەرەی مەمك و بەر و باوی خەجێ          خەڵکی هەموو خستۆتە تەڵە و داوی خەجێ

نەوبووکی شەوی خەڵوەت و جێژوانە خەجێ

ڕۆژ ماتە لەسەرسۆیە لە سەیرانی خەجێ          جەرگی هەموو توێتوێیە بەپەیکانی خەجێ

هەر لاوە لە ئەو لاوە لە مەیدانی خەجێ          بێباڵ و پەڕن بوونەتە حەیرانی خەجێ

سوێسکێکە کە داودۆزی شەوارانە خەجێ

١٣٤٧ . چیای قەلاتی ساردەکۆسان

## ئاوڕێ لە یاران[1]

کورکە کورکی دڵ و خەیاڵی شڕم هەڵیلووشیوە هەموو زیپک و بڕم

هێرشی توندی خەیاڵی خاوم گیانی بێشتوومەوە پێ‌ڤەوتاوم

دەمگەزی دەمگرێ دەمگرییێنێ خەم ئەبەخشێت و خەرم ئەشکێنێ

شەو بە ئاونگی تکەی فرمێسکم تەڕ ئەبێ ڕوومەت و پێست و ئێسکم

دوورە دۆستیمە کە خەم گرتوومی هەروەکوو مۆتەکەیی مژتوومی

دڵ دەڵێ: بۆچی لە کێ تۆراوی دەردەباریکەتە، یا دۆڕاوی

دڵ دەڵێ: بۆ لە کەست ئاوارەی وەکوو حاجەت لە دەسی بێکارەی

دڵ دەڵێ: چیبوو لە خۆدەرچوونت بە تەنێ بۆچتە مان و بوونت

پێم‌دەڵێ: گێژ و خولاوەی نانی یا نە مورووی ملی بیگانانی

ئەو خەیاڵی کڵی دڵ بژوێنم دەمگەڕێنێتەوە بۆ دوا شوێنم

دەبێ بیخاتەوە بیر و مێشکم راوەکێوی ڕەوەك و کەروێشکم

سوێند بە تۆ کاکە بە پیر چۆپانت[2] بە وتوویژی بە بێ ورچانت

بیری ئەو کاتە لەگەڵتا بووری سەری کێشاوەتە شێت‌وشووری

یادی ئەو نێوە کە تێیا ژیاوم هێز و سۆمایە لەبڕ دوو چاوم

راوی داوێنی چڕی پڕ دیمەن بیری ئاونگی گوڵووك و چیمەن

بیری سەرلووتەك و سەرتەرت و سوێ هەژدیهاییێکە ڕەگی ژین ئەجوێ

کاری گەردوونە، قوماری وەختە کاتی ژیان شیرینە دوادەم سەختە

١٣٥٩، گوندی گوێزی سەقز

---

[1] – پیاوە یەکەیەکەکانی گوندی گوێزێ

[2] – لەمابەینی گوندەکانی گوێزێ و شێخ چۆپاندایە. چیایەکی لەمێژینە و بەئەزموونە.

## خوداحافیزی لە هاوڕێیان[١]

کەچ و لۆچ و لەسەر کۆچ و کزۆڵەم ... وڕ و هێرم، لەسەر لێر و گوڵوڵەم
هەلووکێکی لە هەڵکەوتووی چەماوەم ... نەخۆش و تاڵی نۆشی تووشی تۆڵەم
نزیکی تۆم گەرەك بوو بۆ گوڕ و گاڵ ... بەڵام ماوەی نەدا بەختی شڕۆڵەم
خواحافیز و مالاوایی لێتان ... کز و سیسی دەمی پیس و چەمۆڵەم
هومێدم بەرنەداوە ماوە ماوە ... هەچەن پیر و زویر و دوورە ڕۆڵەم

١٣٦٣/٥/٢٠

## شەوارە

دەبێ ئەمجارە پێنووسم بە نەی بێ ... وەڕێ خەم ناڵەناڵێ، نەی کە نەی بێ
بنووسم شەرح و حاڵی ژینی تاڵم ... هەتاکەی پڕ لە داخ و ئۆف و وەی بێ
بوێژم هەڵبڕاوی بسکی خاوم ... دەبێ ئەو هەڵبڕانەم تا بە کەی بێ
دڵی لەتلەتکراوی بێبڕژیوم ... خواکەی چارەنووسی خۆی لەشەی بێ
بە دەسنوێژی دەس و بازن بە پیری ... وەها پسکاوە دڵ تا بێ کزەی بێ
شەوەی چاوی دڵی گرتم لە خەودا ... لە خەو دەبڕێ کەسێکی ئەو شەوەی بێ
شەوارەم لێکرا ئەوشۆکە تا هەم ... دەبێ دڵ مل بە داوی ئەو شەوەی بێ
شل و شۆڕی بە مەی بەخشی لەشی شل ... خودا شلتر دەبێ چیتر لەوەی بێ
دەمێ چێژتی دەمم کەوسەر لە لێوی ... دەمی واخۆش مەحاڵە دینەوەی بێ
بە شاباشی دەمی واخۆش لە ژینا ... بە لاشە تاج و تەخت و موڵکی ڕەی بێ
کوژاوی ئەو دەم و لێوەم هومێدی ... نییە ئیتر جەنازەم ژینەوەی بێ
گوتی پێم دوکتورم: دەردت گرانە ... مەگەر جێگەت لە باخی سێو و بەی بێ
وەیا دایم بە لێوی مەی بە لێوی ... دەم و کێوی بەیارت تەڕ بە مەی بێ
وەیا ڕوحی کەژی پۆڕ و پەری بێ ... پەریزادێ بە ناڵینت بەزەی بێ

کاتی هاتنەوەی بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات، لە چیای بەردەهەڵۆ نووسراوەتەوە

---

[١] – ساڵی ١٣٦٣ بۆخوداحافیزی لە هاوڕێیان وتراوە. راوچی بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجەی سیپەلك دوکتورەکانی بەغدا و سولەیمانیە دەنگی دەدەن بەرەو کوردستانی رۆژهەڵات دەگەڕێتەوە. دوکتور دەڵێ: «مامۆستا ئەوەی راستییە کە بە قەدرایی قولاچی لای خووا شەفات نەماوە بەڵام هەر ئەو دوکتورە ساڵەکانی ١٣٧٠ی هەتاوی کۆچی دوایی دەکا و مامۆستا ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی کۆچ دەکات.

### بۆ دەعوت لە کوڕەشێخ و خواردنی نەهار

بە عیشقی پاك و سۆزی بێگوڕووتان / بە فرمێسکی زوڵاڵی هاوو هووتان
وەدەر خەن سەر لە بن هەوری هەناسەم / کەرەم کەن خۆرەتاوی ڕەنگ و ڕووتان
بەرەو شوێنی بەڵێنی ودا بەڕێ بن / دڵم بێحاڵ و عەودالە لە دووتان
لە ڕێدا پووز و پێ زۆرن عەزیزم / لەسەر خۆ بە نەما نووری پشووتان
تماشای پرچ و پێکەو، پێ بە پێ بێ / کە پرچ و پێیە دەشکێنێ تەزووتان
ئەوەی ڕێگا بە تۆ نەگرێ ئەزانم / دەچێژێ نووکی زەرکی چل جزووتان
لەسەر پردێ دەبینێ چاو و ڕوویان / دەسا خۆت و زرینگی چاو ڕووتان
وەکوو «ڕاوچی»، نەکەی ڕۆچێ لە چاوت / مژۆڵی مەستە چاوی ڕاوی ڕووتان!

٦٥/٨/١٨

### هەڵکەوت

شەوی ڕەش ڕووڕەشی لەرز و تەزوو بوو / کەڕ و کاسی کرێوە و با پزوو بوو
لە بن سیلە و پەسیوێ دیم چەتیوێ / کە نەرمۆڵە و بەبێ فێڵ و گوڕوو بوو
لەسەر سینەی ئەوەی ژینی بە من دا / بە پیری گرتم و مژتم هوڵوو بوو
سەرم سوورما لە هەڵکەوتی شەوی ڕەش / مەبەستی دامە دەستی «ڕاوچی» زوو بوو

٦٥/٥/٢

### وەڵامی نووسراوەی نووسەرێ

کاکە زووتر کە کوڕی بەندەن و بەرخی نێر بووم
ڕاوکەر و دەس‌بەچەك سێرەگر و نەبوێر بووم
کەچی ئەمڕۆکە قەڵەم سوار و سڕە و زەینە نەزۆك
دوور لە تۆ خاڵە کەمێ زلکوێر بووم
ئێستە بمبینە کەوا پیرم و کەوتوو ڕەوتووم
نزگەرەی مەرگە لە سەر لێوەکەم و بێخێر بووم
هەمبوو هیوایە بە ساڵی نەو و کاتێکی کە هات
سەد هەزار خۆزگەی ئەم دڵمە بە پار و پێر بووم

هێنــــدە ئـــاڵۆزە خــەیاڵ و بـــە ژیـــان ئاڵــــە ددان
مـن کـە شـاگردە لـەڕەی مەکتـەبی تـۆم، ڕوو لـە تـەڕیم
کۆنـــە ڕاوچـــیم و بـــەرەو شـــاخییە چـــاوی هیـــوام
چـونکە هـەر شـەو بـە زنـەی چاوی تـەڕم شـەودێر بـووم
هـەم لـە سابڵاخی گـەش و هـەم لـە قـەڵای هـەولێر بـووم
گەرچـی بـێ شـوان و مـەڕ و شەنگەکچی بـەربێـر بـووم[1]
گوندی سەدراباد . ١٣٦٨/١١/١٧

## چوارینە

قـــەراری دا گـــوڵم بیـــت و، درۆی کـــرد — سـەری کوشـتەی بـەقوربانی بـرۆی کـرد
لەپەروانـــەی نەپرســـی دڵڕەقـــی شـــەم — لەسـەر ماچێکی لێوی، چـی لـەخۆی کـرد

***

گەیـــشتوومە ترۆپکـــی شـــێتوشـــووری — شـکاندوومە گـوڵم شووشـەی سـەبووری
وەکـــوو ئاگرپەرســـــتێ، ئەیپەرســـــتم — ئەترسـم خـۆ بسووتێنم بـە نـووری

***

چ شـــیرینە بــــەیادی تــــۆ پیاســــەم — دڵـی شـەو پـڕ لـە گریانـە بـە تاسـەم
دڵـــت پۆڵایـــە، یـــا بـــێدڵ دەژی تـــۆ — ئەسـەر ناکـا لەسـەر گیانـت هەناسـەم

***

ئـەوەی تووشـی تەڵـەوداوی ئـەوین بـوو — وەکـوو مـەم بـۆ مـەمێکی دەم لـە ژیـن بـوو

---

[1] – ئەم نووسراوەیە دەبێ وەڵامی نامەی کاک «سەید قادر سیادەت» بێ.

لــە تەکیــەی چــاوەڕوانی چــاوی تــۆدا ئەوەی بەرچاوە هــەر چــاوی بەشین بــوو

***

لەسەر سینەی سپی تۆ جووتە سێون ئــەوەن قــۆز و بــزۆز و دڵ بزێــون

بڵێم وەك چی دەچن، سێوی بەهەشتی لەسۆنگەی جووتە سێوی تۆ دزێون

***

دڵـم لــەرزیوی نــارەی جووتــە لیمــۆن لــەژێر پــەردەی کراســ سـرك و نـامۆن

بەدەســتی کــەس کــەوی نــابن ئــەزانم ئۆبــاڵی ژیــنی تــاڵی مــن لــە ئەستۆن

***

لەسـیلەی چاوەچـاوی مەسـتی تـۆوەن بــەڕەوتی تــیری نــەمرووری بــەڕێوەن

وەرە ســەر لاشــەم و گیــانم وەبــەر نــێ دەزانم زامــی کــۆنی مــن لــە کێــوەن

***

ئــەوەن دەشــکێنی بــۆ ماچــێ دڵــی مــن هەناســـەم دەتگـری جـارێ گـوڵی مـن

کــەرەم کــە بێتــە سەر کـوڵمی گەشـی تـۆ سمێڵـی نیـوە بـۆزی، هەژگــەڵی مــن

***

خواحــافیز ئــەوا ڕۆیــیم لــەلاتان لەبەختی ڕەش نــەبوو بـۆ مـن وەفاتــان

کــە مــن مـردم لەســەر گــۆڕم بــەمن چــی گــوڵی فرمێــسکی ئــاڵی پڕبــەهاتان

***

سـەر و ئەسـتۆ لەبـەر پێتـا نـەوی بـوون دوو چاوم تووشی تانەی بێخەوی بوون

بــە خــوێنی دڵ لــە نافــەی باخــەڵی تــۆ هــەتا جــووتێ هــەوێردەم بۆ کــەوی بــوون

## (ڕاوچی و یادیّ لە شێعری کۆن بە یادی «هێمن و هێدی»)

«بەژنەکەت سێدارەیە کەزیەت تەنافە زوو کە دەی
بیخە ئەستۆی من کە کوردم، کورد بەشی خنکاندنە»

«هێمن»

*پێمخۆشە بەیادی مام هێمنی ئەمر لەمەڕ شێعری کۆن بدوێم و...*

شێعری کۆنم، لەمێژینەم — خاوەن بەڵگەم، بە پێشینەم
بادراوی داوی تاسەم — بنج و بەرهەمی هەناسەم
نە نەناس و نە غەراوەم — ئاوەنگی پەلکی زاراوەم
نەبادینی و نەسۆرانم — گیانی گەرووی بالۆرانم
تام و مەزەی بزەی لێوم — گورچوو بڕ و دەسبزێوم
بێباڵ و پەڕ هەڵفڕیوم — بەئەزموون و دونیا دیوم
میوانی هەستێکی، سوارم — خورپەی دڵی ئەویندارم
وێرویرۆکەی بێشکەی خەوم — تیشکی ڕۆژ و سۆزەی شەوم
شنەی بەربەیانی حەزم — پاشای وڵاتی حەز، ئەزم
جوانی کورتەك و کڵێتەم — مەیلی لەیلی کابرا شێتەم
شەمی گریاوی بێمەمم — ناڵەی زیندانی بێشەمم
ڕەنگی ئاڵی هێشووی ترێم — برکەی شیر و خرمەی زرێم
بزەی سەرلێوی گۆشتنم — نیگای بەتینی گوڵچنم
نازی ڕەوتی کۆتری ماڵیم — بزەی سەرلێوی خەیاڵیم
گوڕووی لێو و دەمی هیوام — باشتر بێژم، وێژەی هیوام
شنەی مەڵحەمی هەتوانم — تەزووی گەرمی جێگا ژوانم
ئیلهامێکی سەمای بەرزم — غونچەی سەری بەرزی تەرزم
خرمەی بەرمووری گەردنم — دەوای دەردی نەمردنم
غەوارە نیم، خۆییم خۆییم — کەلەپووری خانی و کۆییم
شێعرم، چەشنی جیهان کۆنم — تاکوو کۆن دەبم، بەبۆنم

**بۆ باوەشی گەرمی «هێدی»:**

گـــوێ بگـــــرە بـــۆم بـــرای هێـــدی
بڕوانـــــە شـــــاعیر چـــــی دەڵـــــێ:
«تا گـوارە لـەگوێت دێتـە لـەرین دێتـەوە بیرم
تـــا چـــاو چـــاوە، تـــا گـــوێ گوێیـــە

لـــە شـــێعری کـــۆنی مـــام «هێـــدی»
لـــەو بەســـــتەدا کـــــەوا دەڵـــــێ
هـەر لاوێ کـە لـەو خاکـە لـە سـێدارە دراوە»
ئـــەو کۆنـــە شـــێعرە هـــەر نوێیـــە

راوچی ٦٨/١١/٢٥ . گوندی سەدراباد

**بێبەختی**

به بۆنەی کۆچی لەناکاوی هاوڕێیانی گۆڤاری سروە مامۆستایان (مارف ئاغایی، جەعفەر قازی و سەرتیپ مەنسووری)

لـــە ئاســـۆگەی هومێـــدی مـــەش ســـتێرە
چـــها دایـــك نیـــشانی دا کـــوڕی وا
وەکـــوو ســـەرتیپ و مـــارف کاکـــە جەعفـــەر
بـەهاری شێعرو پەخشانیان بـە گـوڵ بـوون
لـــە پێدەشـــتی نیـــازی کۆمـــەڵ و گـــەل
لـە جوانیـدا سـوهەیل و موشـتەری بـوون
لـــە پێتـــەختی خـــەتی زەیـــن و هونـــەردا
لـــە بـــێبـــەختی و کوڵـــۆڵی کـــوردەواری
بـــەداخـــم ئێـــستە کـــەم شـــۆقە هونـــەرمان
بـــەهارێکی نـــەدیوە، کـــوردی بـــێبـــەش
هـــەلێکی بـــۆ نەرەخـــساوە سەراســـەر
دەمێکـــی بـــۆ نەســـازاوە وە کـــۆ بـــن
کلێتـــە و پەســـتەکی کـــوردی لەبـــەر کـــەن
بـــە هیـــوام مـــن لەمـــەولاوە خولایـــان
نەلـــەرزێنێ دڵـــی «ڕاوچـــی» لـــە ناکـــاو

گـــەلێ هـــاتوون و ڕۆیـــین بـــێ ژومێـــرە
کـــە نەیـــدیوە ســـەدەف، هێـــشتا دوڕی وا
ئـــەدیب و نـــوێبوێـــژ و وێنەپـــەروەر
کڵـی قـازانی هەڵبەسـتیان بـە کـوڵ بـوون
دەڕۆیـــشتن، بـــەرەو ئاســـۆ بـــەرەو کـــەل
دەس و مـستی بـەهێزی نووسـەری بـوون
یەکـــەی تـــاجێکی وەســـتایی لـــە ســـەردا
کـــە هـــەر ســـێ بوونـــە قوربـــانی بـــەهاری
نـــە ســـەر تـــاجی لـــە ســـەردایە نـــە ســـەرمان
لـــە خـــۆی بـــدڕێ، جـڵوبـــەرگی شـڕ و ڕەش
کـە سـەر تـاجی لـە سـەردا بـێ هـەتا سـەر
هـــەموو شـــایی بـــە خـــۆ بـــن بـــێ دڵـــۆ بـــن
خـــەم و خـــەمهێن و خـــوێڕی شـارەدەر کـــەن
وەبـــەر بـــێنێ گـــوڵ و بـــەرگ و گـــەلایان
هـــەواڵی مـــەرگی لاوانـــی بـــەرەو چـــاو[1]

---

[1] – ئەم شێعرە لە لایەن هاوڕێم مامۆستا کەریمی حیکمەتی‌وە بە دەستم گەیشتووە. ڕەشەمەی ١٣٧٩، سروەی ١٧٦

**انا لله و انا الیه راجعون**

## بنەماڵەی بەڕێزی مامۆستا مەلاکەریمی راوچی

زۆر بەداخین بۆ کۆچی دوایی زانای هێژا، شاعیر و نووسەر و عارفی خامەرەنگین، خوالێخۆشبوو مامۆستاکەریمی عەزیز نیژاد ناسراو بە «راوچی» و هەر بەم بۆنە وە لە لایەن هاوکارانی ناوەندی بلاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و گۆڤاری سروە وە لە ئێوە وە هەموو شاعیران، نووسەران و رۆشنبیرانی کورد و شاری بۆکان سەرە خۆشی دەکەین و لە خەمتان دا خۆبەشەریک و بەشدار دەزانین.

بێ شک قەڵەمی پاراو و مایەگرتوو لەگیانی پاکی خوالێخۆشبوو مامۆستا راوچی بۆ هەمیشە لە نێو لاپەڕەکانی دەفتەری زانست و ئەدەبی کوردیدا رووناک و پرشنگدار دەمێنیتەوە.

بەردەوام رووپەڕەکانی سروە بۆ بلاوکردنەوەی ئاسەوارە بەنرخەکانی ئەو زاتە هەڵکەوتەیە ئاواڵە بووە و پێوەندییەکی گەرم و پتەو لە نێوان گۆڤاری سروە و مامۆستادا لە ئارادا بووە.

دوایین دەستنووسی رەوانەکراوی خوالێخۆشبوو مەلاکەریم کە بۆ سروەی مانگی پووشپەڕ ئامادە کراوە پێشان دەدا کە دەستانی زەحمەتکێشی لە دوا رۆژەکانی تەمەنی دا بەباشی یارمەتی ناکەن تاکوو هەست و بیری لەسەر کاغەز تۆمار کا. سەرەڕای ئەوەش تێمان دەگەیەنێ کە مامۆستا تا ئەوکاتەی کە گیانی تەژی لە ئیمان و سەفای عارفانە و شاعیرانەی خۆی بە خوای مەزن بەخشی لە چالاکی و تیکۆشانی لەپێناو خزمەت بە زمان و فەرهەنگی گەلەکەی دەریخی نەکرد. ئێمەش لە خوا دەپارێینەوە وەبەر رەحمەت و بەزەیی خۆی خا وگیانی بە بەهەشتی بەرین شاد بکا.

انشاءا...

بەرپرسایەتی و کارگێرانی ناوەندی بلاوکردنەوەی
فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
١٣٨٠/٣/٣١ی هەتاوی

* سروە ١٨٠ — لاپەڕەی ٣١

دایـم لـە دڵـم جێژنـە بـە ئومیـدی ویـساڵی ‌‌ خۆشنوود و سەرەفرازە لەبەر فیکر و خەیاڵی

ماڵێکـە هـەموو دەیکەمـە قوربـانی بـە جـارێ ‌‌ بـا بێتـە بـەلاگێری دوو چـاوی دە غـەزالی

دەیسا تو خوا مەرحەمەتێ مەقسەدێ حاسڵ ‌‌ خـەرمانی غـەمم مەحتەلـە بـێ بـای شـەماڵی

بینێـرە هـەتا کـاکۆڵی مـشکین ببزێـوێ ‌‌ زاهیر بێ لـە ژێـر زولفی سیاهی خـەت و خاڵی

سەد ناوی خودا ئەوڕۆ لـەنێو پۆلی قەشـەنگان ‌‌ تەکمیلـە قـەد و سـووڕەت و مـەعنای کـەماڵی

سـەییادی مەگـەر دەفتـەری عیشقی وی دەخوێنێ ‌‌ وا زیکـری زەبـانی بۆتـە تەسـریفی جـەماڵی

تمە شد از ید فقیر: حەسەن سەییادی

غەزەلێکی مامۆستا مەلا حەسەنی عەزیزییە (خەلیفە مەلا حەسەنی ساردەکۆسان) ناسراو بە مامۆستا سەییادی. ناوبراو لە ساڵەکانی (۱۳۳۳-۱۲۵۵)ی هەتاویدا ژیاوە و لـە گۆڕسـتانی سێ چاکانی ساردەکۆساندا نێژراوە. ناوبراو باوکی مامۆستا ڕاوچییە. مامۆستا و شاعیر و خۆشنووس و تـەخمیس‌بێژ و نیشتمانی بووە. هـاوڕێی گیـانی بەگیانی مامۆستا ئـاوات (سەید کامیلی ئیمامی) بووە. لە مەهابادی ژمارە ۸۸دا باسیان کراوە.

سەلاح، مامۆستا ڕاوچی، مەحموود، کاوە

### * سپاس و پێزانین بۆ:

١. هەموو خەڵکی نیشتمانپەروەری کوردستان

٢ـ مامۆستایان (ئەحمەدی قازی، ئەمین گەردیگلانی ، فەتاحی ئەمیری ، محەمەدئەمین شاسەنەم و ...)

٣. ئەنجومەنی ئەدەبی بۆکان

٤. گۆڤارەکانی سروە، مەهاباد، داهاتوو، سیروان، موکریان و..

٥ـ ماڵ و منداڵم وا بە گشتی گیان و ماڵ و وەختیان بۆ ئاسەواری مامۆستا ڕاوچی بابم بەخت کرد و بەردەوام یاریدەم دەدەن.

٦ـ دایک و خوشک و براکانم بەتایبەت برای گەورەم کاک مەحموودی خۆشەویستم، و کاک سەلیمی پوورم.

تێبینی:

هیوادارم بەو ئیمەیلەی خوارەوە هەڵە و خواریم بۆ ڕاست کەنەوە و دیارییەکانی مامۆستا ڕاوچی (بابم) بۆ بنێرنەوە، چ قسەی خۆش یان شیعر و چیرۆک یان وێنە و...

Kava_rawchi@yahoo.com

### * ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:

١. خەرمانی گوڵان (باسی ٤٤٥ گوڵ و گیای کوردستانە کە بە زاراوەی موکریانی لە سێ بەشدا بە شێوەی پەخشان نووسراوە: بەشی دەرمان، بەشی خواردەمەنی، بەشی بۆندار)

٢. دێوجامە (ئەلف: وەڵامی نامەی نووسەران، ب: ڕاوچی لە ئاوێنەی گۆڤارەکاندا، ج: ڕێوڕەسمی ئەنجومەنەکان بۆ ڕاوچی، د: ڕاوچی و بەرنامەی ڕامان، و: چەن قسەی خۆشی ڕاوچی، هـ: بەڵگەنامەکان)

٣. شۆڕەبی، وتار و وەرگێڕان و لێکۆڵینەوە (کاری تایبەت بۆ منداڵان)، نووسەر: کاوەی ڕاوچی

٤. ئیعتیاد، هۆکاری ئیعتیاد و مادە سڕکەرەکان لەسەر چینی لاو و مێرمنداڵ، نووسەر: کاوەی ڕاوچی

زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەرە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦٦٩ | گەنج گۆمی سیاسەت دەشڵەقێنێ | ئومێد خۆشناو | گشتی | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٧٠ | دوران هـای زبـان كـردی و مجموعـه زبان های ایرانی | و. مستەفا ئێلخانی زادە | زمان | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٧١ | خلاصه تاریخ كردستان | احمد قاضي | مێژوو | ٥٠٠٠ | ٤٤٨ |
| ٦٧٢ | بزەی شۆڕش (دیوانی شیعری مامۆستا ڕلوچی) | کۆکردنەوەی کاوەی کوڕی مامۆستا ڕلوچی | شیعر | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |